# سنووره قەدەغەكان مەشكێنن!

دەقی چاوپێكەوتن و دەمەتەقێیەك، لەگەڵ میری
(كۆمەڵی ئیسلامیی لە كوردستان / عێراق - عەلی باپیر)

حوسێن محەمەد عەزیز

2704ك / 2004ز

بۆ هەموو ئەوانـەی، باوەڕیـان بەتـەبایی و برایـەتیی
نەتەوەیي هەیە، ئاشتیی و هێمنیی گشتیی دەپـارێزن،
ڕێز لە دیمۆکراسیی و کۆمەڵگەی سیڤیل دەگـــرن.

لەهەموو بەشەکانی کوردستاندا، سەروەت‌و سامانێکی زۆرمان هەیە
کەچیی، کورد سواڵی پێ دەشێ! گەر بەپێی ((شەریعەت))ی ئیسلامیی
بێ، درووست نییە، ((زەکات))ی ناوچەیەك بۆ ناوچەیەکی دیکە بچێ، تا
هەژاری ئەو ناوچەیە، پێویستیان پێی بێ. گەر، یەك دەوڵەتی ئیسلامیی
یەکگرتووش هەبێ، دەبێ، ئەو گەلە کوردەی، لەو نیشتمانەدا دەژی، تاخۆی
پێویستی بەو سەروەت‌و سامانە بێ، بۆ شوێنێکی دیکە نەچێ! گەر لەخۆی
زیادبوو، ئینجا بۆ هەژارانی شوێنەکانی دیکەی جیهان بچێ!

# پێشەکیی چاپی دووەم

دوای ئەوەی، چاوپێکەوتنەکەم ئامادەکرد و لە کۆمپیوتەر دەرمهێنا، ڕۆژی « 2003.05.27 »، ناوی خوام لێ هێنا، خۆم کۆکردەوە و بۆ جاری هەشتەم، بەرەو « کوردستان »ە ئازیزەکەی خۆم بەڕێکەوتم. ئەم جارەیان، ماوەی دوو مانگ مامەوە، جگە لە چاپی یەکەمی ئەم چاوپێکەوتنە، سێ بەرهەمی نوێی دیکەم بەچاپگەیاند و گەلێ کاری گرنگی دیکەشم کرد.

گومانی تێدا نییە، سەردانی ئەم جارەم، لەگەڵ سەردانی جارەکانی پێشوودا، لە هەموو ڕوویەکەوە، گەلێ جیاوازیی هەبوو. چونکە، هەموو بارە « نەتەوەیی، ڕامیاریی، ئابووریی و کەلتووریی »یەکەی « عێراق »یە گشتیی و « کوردستان » بە تایبەتیی گۆڕابوو. لە لایەکەوە، جەنگی نێوان هێزەکانی هاوپەیمان بە سەرۆکایەتی « ئەمێریکا » و « عێراق » تەواوبووبوو. لە لایەکی دیکەشەوە، نەک هەر ڕژێمی « بەعس »ی شۆڤێنیی فاشیی ڕوخابوو، بەڵکوو، هەموو دەزگەکانی دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق »یش، لە گرێژنەوە هەڵوەشابۆوە، چ لە نێوەوە و چ لە گۆڕەپانی نێودەوڵەتییشدا. شتێ نەمابوو، ناوی میریی و دەوڵەتی « عێراق » بێ. « کوردستان » بە تەواویی ئازادبووبوو، کۆمەڵانی خەڵکی چەوساوە، لە جێژنی خۆشیی و سەربەستییدا مەستبووبوون، ئەو ترس و دڵەڕاوکەیەی چەندین ساڵ بوو، هەیانبوو، هێزەکانی سوپای داگیرکەری « عێراق » بگەڕێنەوە، جارێکی دیکە لە « کوردستان »دا، کوشتنوبڕین دەسپێبکاتەوە، بە هیچ شێوەیە نەمابوو!

لە « سولەیمانیی »، هەر زۆر زوو، پێوەندییم بە چاپخانەی « سیما »وە کرد، تا، بەرهەمەکە چاپکەن، وەک خۆیان بەڵێنیاندابوو. ئەوەبوو، کاک « کاوە پێنجوێنیی » هات و یەکدیمان بینی. پێی گوتم: مامۆستا « عەلی باپیر » لە « سولەیمانیی »یە و دەیەوێ، چاوی پێت بکەوێ. منیش، بە خۆشییەوە پەسەندمکرد و گوتم: پێویست بەو ئەرکە ناکا، ئەو بیکێشێ، خۆم سەری لێ دەدەم.

ڕۆژی « 2003.06.05 »، لەگەڵ کاک « کاوە »دا، لە « هەوارەبەرزە »، سەردانی بارەگەی سەرکردایەتییم کرد. مامۆستا چاوەڕێیدەکردم. باوەشی دۆستایەتییمان بۆ یەکدی کردەوە و یەکدیمان ماچکرد. پاشان، مامۆستا « موحەممەدی ڕازیی »ی پێ ناساندم. ئیدی، چوار قۆڵیی

دانیشتین. بە دەم میوەخواردن و ساردیی خواردنەوەوە، مامۆستا باسێکی کورتی، باری خۆیانی بۆ کردم و کەمێ دەمەتەقێمان، لە سەر ڕەوشی ڕامیاریی « کوردستان » و « عێراق » کرد. پاشان، چەن وێنەیەکمان بۆ یادگار گرت. دواتر، بەرهەمەکەم پیشانی مامۆستا دا، چەن لاپەڕەیەکی لێ هەڵدایەوە و گەلێکی پێ خۆشبوو.

کاک « کاوە » گوتی: مامۆستا! گەر دەتەوێ، با لات بێ و تەماشایەکی بکە، پاشان دەیبەم بۆ چاپخانە.

منیش گوتم: تا چاپ نەکرێ و بڵاو نەکرێتەوە، نابێ، کەس بیبینێ. چونکە تازە، ئەوەی مامۆستا گوتوویەتی و ئەوەی من نووسیوومە، هەر ئەوەیە و هیچی لێ ناگۆڕرێ. بەڵام، پاشان دەتوانن، پێیدابچنەوە و باری سەرنجی خۆتان دەربڕن، گەر کەم و زیادی هەبوو، هەر هەڵەیەکیشی تێدا بوو، یا، هەر ڕەخنەیەکتان، لە پێشەکییەکەی هەبوو، ڕوونکردنەوەیەک بنووسن!

خوا هەڵ ناگرێ، مامۆستا یەکسەر گوتی: نا، پێویست ناکا، تەماشای ناکەم، بڕۆن، چاپیکەن.

هەستم بەوە کرد، مامۆستا کاتی کەمە و میوانی هەیە. لە ناکاو، یەکێ هات و گوتی: میوانەکان گەیشتن. ئەویش، ڕووی لە من کرد و گوتی: من هیچ لە تۆ ناشارمەوە، گەلێ میوانی عەرەب، لە شارەکانی « عێراق »وە سەردانیانکردووین، هانایان بۆ هێناوین، وەک موسوڵمانی « سوننە »، لە بەرانبەر « شـــیعە »کاندا، پشتیان بگرین، ئەگینا، گەر موسوڵمانی « سوونە »ی کورد و عەرەب یەک نەگرن، « شیعە »کان لە پەراوێزدا دەیانهێڵنەوە! ئەم میوانانەی ئەوڕۆش، لە « بەغدا »وە هاتوون.

ئیدی، منیش تێگەیشتم، کاتی زۆر کەمە، لە بەر منیش ڕووی نەدەهات، داوام لێ بکا و کۆتایی بە دیدارەکە بێنێ، یا بڕوا و پاشان بێتەوە. بۆیە منیش، لە پەرۆشمەوە بۆ دۆستایەتیی مامۆستا، ڕووی دەمم تێکرد و گوتم: کاتمان دەرەنگکرد، تۆش میوانت هەیە. بەڵام، پێش ئەوەی، لە یەکدی جیابینەوە، حەزدەکەم، دوو قۆڵیی، کەمێ پێکەوە دانیشین و دوو خاڵی گرنگ هەیە، باسیکەین.

گوتی: فەرموو.

گوتم: ڕاتان چییە، بەرانبەر ئەو شتانەی، لە ڕۆژنامەی « هەواڵ »دا، لە سەر بەڕێزتان بڵاوکراونەتەوە؟ ئایا ڕاستە، پێوەندییتان لەگەڵ « بەعس » هەبووە؟ چونکە، ئەم هەواڵە، زۆر نیگەرانی کردووم و جگە لە ڕۆژنامەکە، گوتارەکەشیان بۆ هێناوم.

ڕەنگە، مامۆستا چاوەڕێی پرسیارێکی لەو جۆرەی، لە کەسێکی وەک من نەکردبێ، بە تایبەتیی، بەو ڕاشکاویی و زەقییە، بەرەوڕوویبێتەوە. بۆیە، کەمێ ڕەنگی گۆڕا و گوتی: هەرگیز، بەو شێوەیە نەبووە و نییە، کە لە نامەی ئەو برادەرەدا باسکراوە، بەڵکوو، شتەکەی زۆر گەورە کردووە. بەڵام، ئێمەش وەک هەموو پارتێکی دیکەی ڕامیاریی « کوردستان »، مافی ئەوەمان هەبووە و هەیە، پێوەندیی بە هەموو کەسایەتیی و لایەنەکانی نێو « کوردستان، عێراق و جیهان »ەوە بکەین.

لە ڕاستییدا، من هیچم نەگوت. بەڵام، نە ئەو نکوڵیی لەو پێوەندییە کرد و نە منیش، بە تەواویی تێگەیشتم، جۆری ئەو پێوەندییەی نێوانیان چۆن بووە!

پاشان، دەربارەی خاڵی دووەم گوتم: خۆتان باش دەزانن، ئەوڕۆ، ڕژێمی فاشیی « بەعس » ڕوخاوە، کۆمەڵی « ئەنصار ئەلئیسلام »، لە نێوچەکەدا نەماون و هەڵکەندراون، چ بە ڕاکێتی « ئەمێریکا » و چ لە بەرەی جەنگدا بووبێ، لە هەموو لایە، کوردێکی زۆر کوژراوە، نێوچەکەشیان بە ئێوە چۆڵ کردووە، ئایا، چ جۆرە بڕیارێکتانداوە و لە ئاییندەدا نیازی چیتان هەیە؟

گوتی: غەدرێکی زۆریان لە ئێمە کرد، هێندێ لە برایانمان شەهیدبوون، هێندێکی دیکەشمان برینداربوون. بەڵام، ئێمە بە هیچ شێوەیە، وەڵاممان نەدانەوە، دانمان بە خۆماندا گرتووە و داواکارێکانیانمان جێبەجێکردووە. ئەو نێوچانەمان بۆ چۆڵکردوون، هێزە چەکدارەکانمان، بۆ نێوچـــــەی « هێرۆ » گواستۆتەوە، بارەگاکانمان کەمکردۆتەوە. خۆشم، بە ماڵــەوە لە « سولەیمانیی » جێگیربووم. بەڵام، نیازمان نییە، واز لە خەبات بێنین. پێوەندییشمان، لەگەڵ هەموو پارتەکانی « کوردستان »دا باشە، تەنانەت، دوێنێ دوکتۆر « بەرهەم » سەردانیکردم و دە دەفتەر دۆلاری بۆ هێنام.

پاشان گوتی: ئەی تۆ دەڵێی چی؟

گوتم: من وەک برایەکی باش پێت دەڵێم: نەک هەر « کوردستان »، بەڵکوو، هەموو « عێراق » و تا ئەندازەیەکی زۆریش، هەموو نێوچەکەش، لە لایەن زلهێزێکی وەک « ئەمێریکا » و هێزەکانی هاوپەیمانەوە، بە تەواویی کۆنترۆڵکراوە. لەوانەیە، بەو زووانە، جەنگێکی گەورە، لە نێوان ئەو هێزانە و « قاعیدە »دا بەرپابێ. من پێم وایە، لەو جەنگەدا، ئیسلامی ڕامیاریی، سەرکەوتوو نابێ. چونکە، جگە لەوەی، تەرازووی هێزەکان، وەک یەک نین، دەوڵەتەکانی بەرەی خۆراوا، توانایەکی گەورەی مرۆیی، سامانێکی ئابووریی و کەرەسەیەکی جەنگیی یەکجار زۆریان هەیە، چەکێکی زۆری

کۆکوژ و مرۆقرکەری مۆدرێنی جۆراوجۆریشیان هەیە. لەبەرئەوە، هێزە جەنگاوەرەکانی ئیسلامی ڕامیاریی، هیچ پاشەڕۆژێکی ڕوون و گەشیان نییە و ناشیانبێ. چونکە، بەرەی خۆراوا، جەنگی مان و نەمان دەکەن، کارەساتی « 11 سێپتێمبەر »یان بیر نەچۆتەوە، هەموو توانای خۆیان بەگەڕدەخەن، تا لەنێویانبەرن. خۆشتان باش دەزانن، جگە لەوەی، قۆناغی خەباتی چەکداریی لە « کوردستان »دا تەواوبووە، هیچ لایەنێکیش دژی ئەو هێزە گەورەیە، هیچی پێ ناکرێ. لەبەرئەوە، جگە لە « پارتیی و یەکێتیی »، کە دوو هاوپەیمانی « ئەمێریکا و بریتانیا » بوون و بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ، لە جەنگەکەدا بەشدارییانکردووە، نایەڵن، چەکداری دیکە لە نێوچەکەدا بمێنێ، گەر ئەوانیش چەک نەکەن!
جا گەر ئێوە، بە ویست و ئارەزووی خۆتان، چەک دانێن، واز لە خەباتی چەکداریی بێنن، گەلێ باشتر و ئابڕوومەندانەترە، وەک لەوەی، هێزێکی گەورەی وەک « ئەمێریکا »، بە زۆر چەکتان پێ دانێ، کە ئێوە بە گاووریان دادەنێن! جگە لەوەی، نەک هەر ئێوە، بەو هێز و توانا کەمەوە ناتوانن، بەرانبەر « ئەمێریکا » بوەستن و هیچتان پێ ناکرێ، بەڵکوو، گەر هەموو کوردیش کۆکەیتەوە، هیچی پێ ناکرێ! بۆیە، با لەوە پتر، کوڕی کورد بە کوشت نەدرێ و خوێن نەڕێژرێ، تا ڕۆژێ زووتر، چەک دانێن و بە شێوەیەکی فەرمیی ڕایگەیەنن، گەلێ بۆ ئێوە باشترە.
گوتی: زۆر ڕاستە، خۆشمان هەر وامان بڕیارداوە.
پاشان گوتم: وەک ئێوەش تێیگەیشتوون، دێمۆکراسیی، دژی ئایینی ئیسلام نییە. چونکە، گەر سیستێمکی دێمۆکراسیی، چ لە « کوردستان » و چ لە « عێراق »دا پیادەکرێ، ئێوە زیانی لێ نابینن، بەڵکوو، بە پێچەوانەوە دەتوانن، لە سایەی ئەو سیستێمە دێمۆکراسیی و پلورالیزمەدا، پتر بیری خۆتان بڵاوکەنەوە، کاریکەن و بنکەی جەماوەریی ڕێکخراوەکەتان فراوانترکەن. هەروەها شانبەشانی ڕێکخراو و پارتەکانی دیکەی « کوردستان »یش، خەباتی ڕامیاریی بکەن!
جارێکی دیکەش، جەختی لە سەر قسەکەی خۆی کردەوە و گوتی: بە دڵنیاییەوە دەڵێم، هەر وا دەکەین. بەڵام، یەک تکام لە تۆ هەیە.
گوتم: فەرموو، چییە؟ هەر بە من بکرێ، بە چاوان جێبەجێیدەکەم.
گوتی: ئێستە چۆن بێلایەنی، خۆت بە دۆستی هەموو لایە دەزانی، هەر وا بە بێلایەنیی بمێنەرەوە، تێکەڵاوی هیچ پارتێ مەبە. چونکە، ڕێزێکی تایبەتییت هەیە و پتر گوێت لێ دەگیرێ!

گوتم: تا ئێستە، بیرم لەوە نەکردۆتەوە، کار لە هیچ پارتێکی ڕامیاریی « کوردستانیی »دا بکەم. بەڵام نازانم، لە داهاتوودا، کاردەکەم یا نایکەم، لەبەرئەوە، بەڵێنت نادەمێ!

ئیدی، دیاربوو، ئەو زۆری پەلەبوو، منیش، هیچ کارێکم نەمابوو. لەبەرئەوە هەستام و ماڵاواییم لێ کرد. ئەویش، وەک ڕەوشتێکی بەرزی خۆی، بە ڕێزێکی زۆرەوە، تا سەر جادەکە بەرێیکردم، شۆفێرەکەی بانگکرد و گوتی: کاک دوکتۆر، بۆ کوێ دەڵێ، بیگەیەنە. جارێکی دیکەش، باوەشمان بە یەکدیدا کردەوە، یەکدیمان ماچکرد و گوتی: خۆم پێوەندییت پێوە دەکەم.

ئەوەبوو، دوای ماوەیە، چاوپێکەوتنەکە، لە بەرگێکی ڕازاوەی جواندا، لە لایەن چاپخانەی « سیما »وە چاپکرا و بڵاوکرایەوە. لە ماوەیەکی کەمدا، ژمارەیەکی زۆری لێ فرۆشرا، خوێنەر بە پەرۆشەوە دەیانکڕی و دەیانخوێندەوە.

هەر چەندە، گەلێ کەس، دەستخۆشانەیان لێ کردم، بەڵام، هێندێ کەسی دیکەی بێ ویژدان و داخ لە دڵ، زۆر بە ڕاشکاویی، سەرسووڕمانی خۆیان پیشاندا و گوتیان: تۆ چۆن، چاوپێکەوتن لەگەڵ مەلا « عەلی باپیر »دا کردووە؟ تۆ یارمەتییتداوە و کوردیش، زیان لەو جۆرە کارانە دەبینێ!

منیش، سەرەڕای ئەوەی، لە قووڵایی دڵەوە، بەزەییم بەو جۆرە مرۆڤە نەخۆش و داماوانەدا دەهاتەوە، لە وەڵامیشدا، هەر هێندەم پێ گوتن: ئەز، لە مێژە پێشتانکەوتووم و لە پێشەکیی بەرهەمەکەدا، وەڵامی هەموو ئەو جۆرە پرسیارانەم داوەتەوە. فەرموون، بچن، بیخوێننەوە، ئینجا پرسیاری وا بکەن!

هەر چەندە، هەرگیز لەو باوەڕەدا نیم، کورد هیچ جۆرە زیانێ، لە هیچ جۆرە چاوپێکەوتنێ ببینێ. ئێستەش لێرەدا، زۆر بە ڕاشکاویی، دووبارەی دەکەمەوە و دەڵێم: نە لە ناسینی مامۆستا، نە لە چاوپێکەوتنەکە، نە لەو پێشەکییەش پەشیمان نیم. چونکە، ئەز بە دوای ڕاستییدا دەگەڕێم و دەمەوێ، هەموو ڕاستییەکانیش، بۆ ڕۆڵەکانی نەتەوەکەم ڕوونکەمەوە، تا، چی دیکە لەوە پتر، سەرکردەی پارتەکان، بە کوێرەڕێیاندا نەبەن، تووشی نەخۆشی نەزانینیان نەکەن! تا دەشتوانم، هەوڵ بۆ تەبایی و ئاشتیی گشتیی نێوان کورد و کورد دەدەم. جا، با نەیار و دوژمنانی هەر دوولا، چۆنی لێکدەدەنەوە، لێکیبدەنەوە. چونکە، هیچ لە ڕاستیی ناگۆڕێ و هێندەی چڵەپووشێکیش، باوەڕی من لەق ناکا!

لێرەدا، هەر هێندە دەڵێم: ڕۆژێ دەبێ، مێژوو، گەواهیی ئەوە بۆ مامۆستا بدا و بڵێ: گەر ئەو نەبووایە، دوور نەبوو، گەنجێکی زۆری کورد، یا زۆربەی ئەوانەی، لە « کۆمەڵی ئیسلامیی »دا کاردەکەن، دوای کۆمەڵەکەی « ئەنصار ئەلئیسلام » بکەوتنایە. بەو شێوەیەش، کاری تیرۆریستیی، لە « کوردستان »دا پتردەبوو. واتە: مامۆستا توانی، کۆمەڵێ گەنجی موسوڵمانی کورد، لە خوێنڕشتن قوتارکا! ①

ئەز، وەک دۆستێکی مامۆستا، لە کاتی پێویستی خۆیدا، چ بە چاوپێکەوتن لە ڕۆژنامە و تێلێفیزیۆنی « کۆمەڵ »دا بووبێ، چ بە هەواڵپرسین و بەتەنگەهاتنەوە بووبێ، هەڵوێستی خۆم بۆ مێژوو دەربڕیوە، هەرگیز، لێشی پەشیمان نیم، مەگەر لە ئایینەدەدا، بەڵگەیەکی بێ چەن و چوونی ناپاکییم لە کورد دەسکەوێ و پەشیمانبمەوە!

بەڵێ، زۆری نەخایاند، سەرنووسەری ڕۆژنامەی « کۆمەڵ » کاک « تۆفیق کەریم »، تێلێفۆنی بۆ کردم، زۆر بە گەرمیی، بەخێرهاتنەوەی لێ کردم و گوتی: دەمانەوێ، چاوپێکەوتنێکت لەگەڵ بکەین. پاشان، لە سەر کات و شوێن ڕێککەوتین، چاوپێکەوتنەکە، لە لایەن خۆی و بەڕێوەبەری نووسین کاک « هاوژین عومەر »ەوە ئەنجامدرا، بە دوو زنجیرەش، لە ڕۆژنامەی « کۆمەڵ »دا بڵاوکرایەوە.

ئیدی، دوای ئەو چاوپێکەوتنەش، چەن جارێکی دیکە، چەن برایەکی دیکە، لە ڕۆژنامە و تێلێفیزیۆنی خۆیانەوە هاتن و چاوپێکەوتنیان لەگەڵدا ساز کردم. لە لایەکەوە، لە بەر بایەخی چاوپێکەوتنەکان و پێوەندیی بە کارەکەی خۆمەوە، لە لایەکی دیکەشەوە، لەبەرئەوەی، هەموو چاوپێکەوتنەکەیان، لە یەک ژمارەدا بڵاو نەکردبۆوە و پچڕپچڕبوو، بە پێویستی دەزانم، هێندێکیان لە پاشکۆدا بڵاوکەمەوە.

چەن ڕۆژێکی کەم، بە سەر بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکەدا تێپەڕیبوو، کاک « کاوە » تێلێفۆنی بۆ کردم و گوتی: مامۆستا دەیەوێ، سەردانێکتانبکا. مامۆستا باوکمی بە دڵدا چووبوو، حەزی لە قسە خۆشەکانی دەکرد. منیش فەرمووم لێ کردن.

ڕۆژی « 2003. 07. 07 »، دەمەو ئێوارەیەکی زووبوو، لە دەرگەی حەوشە درا. کاتێ کردمەوە، سێ ترومبێل وەستابوو. مامۆستا دابەزی و هاوەڵەکانیشی، هەموو خۆیان کرد بە ژووردا. من و باوکیشم، پێشوازییەکی گەرممان لێ کردن. هێندێ کورسیی و چەن تەپڵەکێکمان هەبوو، لە نێو چیمەنەکەدا ڕیزمکردبوون، تا میوانەکان دانیشن.

بەڵام، بە ڕاستیی، من حسێبی ئەو هەموو خەڵکەم نەکردبوو. باوەڕیش ناکەم، هیچ ماڵێ لە « سولەیمانیی »دا هەبێ، هێندە کورسیی و تەپڵەکی هەبێ، تا بتوانێ، پێشوازیی لەو ژمارە زۆرە بکا و وەک پێویست، ئەرکی میوانداریی خۆی بەجێبێنێ! بۆیە، زۆر بە ڕاشکاویی و بە پێکەنینەوە گوتم: هەر هێندە کورسییمان هەیە، جا، ئەو برایانەی دیکە دەبێ، خۆیان چاری خۆیان بکەن و جێی خۆیان بکەنەوە.
مامۆستاش گوتی: گرنگ نییە، هەر یەکە لە لایەکەوە بۆ خۆتان دانیشن.
ئەو ڕۆژە، جگە لە مامۆستا، حاجی « ئەوڕەحمان » ئەندامی « شورا » و جێگری سەرنووسەری ڕۆژنامەی « کۆمەڵ » کاک « موحەممەد ئەحمەد سەعید »یش هاتبوون. ئیدی، دوای بەخێرهاتن و هەواڵی یەکدی پرسین، هێندێ قسەمان، لە سەر چاوپێکەوتنەکە کرد و مامۆستا گوتی: هەموویم خوێندەوە. هەر چەندە، هێندێ تێبینییم، لە سەر پێشەکییەکەی هەیە و هێندێ زیانی گەیاندووە، بەڵام، بە شێوەیەکی گشتیی، زۆر باشە. خوا هەڵ ناگرێ، زۆر بە دەسپاکییەوە، گفتوگۆکەت گواستۆتەوە و نووسیوتەتەوە. ئیدی، دەسخۆشانەی لێ کردم.
منیش گوتم: من چیم دیوە، ئەوەم نووسیوە، هەمووشیان دید و بۆچوونی تایبەتیی خۆمن. بەڕێزتان، چیتان پێ ڕاست نییە، دەتوانن، وەڵامبدەنەوە.
کاک « موحەممەد » گوتی: خوێندنەوەیەکی بابەتانەمان، لە سەر چاوپێکەوتنەکە نووسیوە، بەو زووانە بڵاویدەکەینەوە.*
بەڵام، لەگەڵ ئەوەشدا، تەنیا ڕەخنەیەکیان هەبووبێ، هەر ئەوەبوو، ووشەی « عەرەبیی »م، لە نووسینەکەدا بەکار نەهێنابوو، بەڵکوو، ئەو ووشانەی لە زمانی « کوردیی »دا نەبوون، بە « لاتینیی » نووسیبوومن. جگە لەوەی، هێندێ ووشەی « ئیسلامیی »یشم، هەر بە « کوردیی » نووسیبوو.
منیش گوتم: ئەوە شێوازی نووسینی تایبەتیی خۆمە و دەمەوێ، هەموو ئەو ووشە « لاتینیی »یانەی هەن، لە زمانەکەماندا بچەسپێ، هەر وەک لە بەرهەمی « سەلیقەی زمانیەوانیی »شدا، بە درێژیی ڕوونمکردۆتەوە.
مامۆستا گوتی: کاک دوکتۆر، ئارەزووی خۆیەتی، چۆن دەنووسێ! پاشان، ڕووی دەمی تێکردم و گوتی: دەمانەوێ، چاوپێکەوتنەکە بۆ سەر زمانی عەرەبیی وەرگێڕین، تۆ دەڵێی چی؟
منیش گوتم: کارێکی زۆر باش دەکەن. بەڵام بە مەرجێ، نووسینەکەی منیشی لەگەڵ بێ. پێش ئەوەی بڵاویشکەنەوە، دەبێ، خۆم بیبینم و پێشەکییەکیشی بە زمانی عەرەبیی بۆ بنووسرێ.

ماوەیەکی باش دانیشتن. مامۆستا، لەگەڵ باوکمدا نێوانیان خۆشبوو، هەر دەیدواند و ئەویش، قسەی خۆشی بۆ دەکرد. نزیکی ڕۆشتن بوویۆوە، گوتی: دەبێ، ڕۆژێ بفەرموون، دایە و بابەش بێن، نانێکی کوردەواریی پێکەوە بخۆین. خۆم تێلیفۆنتان بۆ دەکەم و وەڵامتان لێ دەگێڕمەوە.
ئیدی، ماڵاواییانکرد و ڕۆشتن. ئاخر، کێ دەیزانی، لەو سەردانەمدا، ئەوە دوا جار دەبێ، مامۆستای تێدا ببینم؟!! چونکە، هەر سێ ڕۆژ دوای ئەوە، واتە: ڕۆژی پێنجشەممەی ڕێککەوتی « 2003. 07. 10 »، مامۆستا و چەن هاوەڵێکی دیکەی، لە ڕێی « دوکان »، لە لایەن هێزەکانی « ئەمێریکا »وە گیران، بە چەن فڕۆکەیەکی هێلیکۆپتەر فڕاندیانن و تا ئێستەش، کەس نازنێ، لە سەر چی گیراون؟ لە کوێن؟ کەی بەردەبن؟
بە ڕاستیی، لەو باوەڕەدا بووم، کاتێ ئەم بەرهەمە بڵاودەبێتەوە، هێندێ کەس و لایەنی ڕامیاریی، بەدەنگبێن، باری سەرنجی تایبەتیی خۆیان دەربڕن، ڕەخنە لە دید و بۆچوونەکانی مامۆستا بگرن، یا ڕەتیکەنەوە. چونکە، ناوی گەلێ کەسی هێناوە، باسی هەموو لایەنەکانی کردووە، پەنجەی بۆ زۆر لایەنی « مێژوویی، ڕامیاریی، ئایدۆلۆژیایی، کۆمەڵایەتیی، ئایینیی، ئایینزایی و کەلتووریی » ڕاکێشاوە.
بەڵام، بۆم دەرکەوت، لە لایەکەوە، کۆمەڵگەی کوردەواریی بە گشتیی، خوێندەوار و ڕووناکبیرانی کورد بە تایبەتیی، هێشتا، لەو ئاستە بەرز و پێویستەدا نین، نەهێڵن، هیچ شتێ، بە سەریاندا تێپەڕبێ! خاڵی ڕاستیی، لە سەر هەڵەی پێتەکان دانێن! لە لایەکی دیکەشەوە، بێ دەنگیی لە ئاستی دید و بۆچوونەکانی مامۆستادا، گەواهیی ئەوە دەدا، هەر چی لە دوو توێی ئەو چاوپێکەوتنەدا هاتووە، هەر هەمووی ڕاستبێ.
ڕەنگە، نەیار و دوژمنەکانی مامۆستا نەیانوێرابێ، بە ئاشکرا وەڵامی بدەنەوە، یا نەیانویستبێ، مامۆستا هێندەی دیکە، چیلکە لە دید و بۆچوون، نهێنیی و ڕابردوو، کردار و ڕەفتارەکانیان وەردا. بەڵکوو، بە شێوەیەکی دیکە، ڕەفتاریانکردووە و تۆڵەی خۆیان لێ سەندۆتەوە، وەک خۆی و هاوڕێکانیان، تووشی ئەو چارەنووسە نادیارە کرد!
بەڵام، ئەوەی تا ئێستە، من بیزانم و بە تەواویی ئاگاداربم، تەنیا هەر کاک « ئیسماعیل سەیید ئیبراهیم » ناوێ، گوتارێکی کورتی نووسیوە، بەرهەمەکەی هەڵسەنگاندووە و لە ڕۆژنامەی « کۆمەڵ »دا بڵاویکردۆتەوە. منیش، هێندەی پێوەندیی بە خۆمەوە هەبێ، وەڵامیدەدەمەوە و لە پاشکۆی چاوپێکەوتنەکەدا، هەر دووکیان بڵاودەکەمەوە!

هەڵبەتە، کاتی خۆی و ساڵی « 2003 »، پەلەیەکی زۆرم بوو، سـەردانی « کوردستان » بکەمەوە. ئەو پەلەکردنە، وای لێ کردم، لە کاتی نووسینەوە و پێداچوونەوەی چاوپێکەوتنەکەدا، باز بە سـەر گـەلێ هەڵەدا بدەم و لە ڕووی ڕێنووسەوە، هەڵەیەکی زۆری تێکەوێ. یا بە باشیی، گوێم لە هێندێ ووشە نەبووبێ، بۆیە، هێندێ هەڵەی زەقی تێکەوتبوو، کە خوێنەری وریا، هەر زوو هەستی پێ کردبوو.
بەڵام، لەم چاپە نوێیەدا، جگە لە پێشـەکـیی و چەن پاشکۆیەکی دیکە، هەموو ئەو هەڵە زۆرانەی تێیدا بوو، ڕاستمکردوونەتەوە. هەروەها، هەموو ووشـە و زاراوە « ئیسـلامـیی »یەکـانیش، وەک خـۆیان چۆن بوون، نووسیـومنەتەوە. با، هـەم برایانی « کـۆمـەڵ »، ئەو ڕەخنەیەیان نەمێنێ، هەم جـەماوەری خوێنەریش، باشـتر لێی تێ بگەن! بەڵام، لە پرسیـار و وەڵامـەکاندا، هیچی نوێی تێدا نییە و هەر ئەوانەن، کاتی خۆی، لە چاپی یەکەمدا بڵاوکراونەتەوە، چونکە، هیچمان لێ نەپەڕاندبوو!
لە کـۆتاییـشـدا، هەر ئەوە مـاوە، بڵـێم: هیـوادارم، چاپی دووەمی ئەم چاوپێکەوتنە، بە شـێـوەیەکی باشـتـر، جـێی خـۆی، لە دڵ و دەروونی، جـەمـاوەری خـوێنەری کـورددا بکاتەوە و ڕاژەیەکی زمـانی شـیـرینی کوردییشم کردبێ. هەروەها، مامۆستا و هاوەڵەکانیشی، تا ئەو کاتە، چارەنووسیان دیارییبدا، بە تایبەتیی مامۆسـتا، جارێکی دیکە، چاوی بە چاپی دووەمی چاوپێکەوتنەکەی خۆی ڕۆشنبێتەوە!
پاشـان، لە پاداشـتی ئەو هەمـوو قسـە خـراپانەی کـراون، تەنیـا دەڵێم: سـەرکـەوتن و سـەرفـرازیی ڕاسـتـەقـینە، هەر بۆ مـرۆی ڕاسـتگۆ و مـاندوونەناسـە، خـوای گـەورەش، باڵی سـۆز و بەزەیی، بە سـەر هەمـوو لایەکماندا بکێشێ!

**دوکتۆر حوسێن موحەممەد عەزیز**

**ستۆکهۆڵم**

2004. 04. 04

---

* لە پاشکۆدا، گوتارەکە و وەڵامەکەی خۆم بڵاودەکەمەوە.

# لەبری پێشەکیی، سەرنج و تێبینیی!

هاوینی ڕۆژی « 2002. 08. 24 »، بۆ جاری حەوتەم، سەردانێکی دیکەی کوردستانە شیرینەکەم کردەوە. هەر چەندە، زووزوو، سەر لە خاکی نیشتمان و زێدەکەم دەدەم، بەڵام، ئەم جارەیان، لە هەموو جارەکانی دیکە خۆشتربوو. چونکە، لە لایەکەوە: لە مانگی « فێبروەری2001 »ەوە، وڵاتە ئازیزەکەم بەجێهێشتبوو، پتر لە ساڵێ بوو، لێی دووربووم! لە لایەکی دیکەشەوە: لەو ساڵ و چەن مانگەدا، نۆ بەرهەمی دیکەم، بۆ چاپ ئامادە کردبوو، شەشیان نوێبوون و سیانەکەی دیکەشیان بڵاوکرابوونەوە. لەو بەرهەمانەی چاپکرابوون، هەر دوو چاوپێکەوتنەکەی مامۆستایان « برایم ئەحمەد و جەرجیس فەتحوللا » بوون.

ماوەیەکی زۆربوو، بەڵێنم بە خاوەنی چاپخانەی « سیما »، کاک « کاوە پێنجوێنیی » دابوو، « پێنج کاتژمێر لەگەڵ برایم ئەحمەد دا »ی بدەمێ و لە سەر ئەرکی خۆی، چاپ و بڵاویکاتەوە. هەر چۆنێ بوو، ڕێککەوتین، هەر دوو چاوپێکەوتنەکەم لێ وەرگرێ و لە سەر گیرفانی خۆی، چاپ و بڵاویانکاتەوە، بە مەرجێ، لە « 10٪ » پەرتووکەکانم بداتێ. ماڵی ئاوابێ، بەڵێنەکەی خۆی، بە زیادەوە جێبەجێکرد و هەر دوو بەرهەمەکە، لە بەرگێکی جوان و ڕازاوەدا، چاپکران و بڵاوکرانەوە.

ئیدی، ڕۆژانە، سەرم لە چاپخانەکەی دەدا، تا هەواڵی چاپکردنی بەرهەمەکان بزانم و سەرپەرشتییانبکەم. ڕۆژێ پێی گوتم: ئایا، پەرتووکی « سۆزی نەتەوایەتیی » مامۆستا « عەلی باپیر »ت خوێندۆتەوە؟
گوتم: نەخێر. هەر نەشمبیستووە.
گوتی: من بە مامۆستا دەڵێم، بە دیاریی بۆت بنێرێ. پاشان، داوەتی کۆڕێکی مامۆستای کردم، کە لە سەر « سیکولاریزم » بوو. هەر چەندە، زۆرم پێ خۆشبوو، گوێم لە سەرکردەی پارتێکی ئیسلامیی کوردستانیی بێ، تا بزانم، چۆن باسی ئەو بابەتە دەکا. بەڵام، لەگەڵ ئەوەشدا، بەڵێنم نەدایە، بچم. دواییش، بە داخەوە هەر نەمتوانی، ئامادەبم. پاشان دیمەوە، لێی پرسیم و گوتی: نەهاتی بۆ کۆڕەکە؟
گوتم: کاتم نەبوو.
گوتی: ئێوەی نووسەر و ڕووناکبیری کورد، تەنیا هەر، لەگەڵ ئەو کەسایەتیی و سەرکردە ڕامیارانەدا تێکەڵدەبن و چاوپێکەوتندەکەن. بەڵام، لەگەڵ پارت و سەرکردە ئیسلامییەکاندا، تێکەڵ نابن و لە نزیکەوە، لە دید و بۆچوونەکانیان شارەزا نابن.
منیش گوتم: ئەن، جیاوازیی لە نێوان هیچ لایەن و کەسایەتییەکدا ناکەم. بەڵام، هەر کەس و لایەنێ، بە چاوی ڕێزەوە، لە خۆم و بەرهەمەکانم بڕوانێ، پێی خۆشبێ، لێی نزیککەومەوە و دۆستایەتیی بکەم، ئەوا، زۆر بە خۆشیی و شانازییەوە، پێشوازیی لە بانگهێشتن و دۆستایەتییەکەی دەکەم. بێ هیچ جۆرە مەرج و لەخۆباییبوونێ، بە دەم داواکارییەکەیەوە دەچم و لەگەڵی تێکەڵدەبم.
ڕۆژی دوایی، لە چاپخانەکەی یەکدیمان بینییەوە. گوتی: باسی تۆم بۆ مامۆستا کرد. لە دوورەوە دەتناسێ. چونکە، هێندێ لە بەرهەمەکانتی خوێندۆتەوە. لەبەرئەوە گوتی: حەزدەکەم، چاوم پێی بکەوێ و لە ماڵی خۆمدا، پێشوازیی لێ دەکەم. منیش زۆر سوپاسمکرد، قایلبوون و خۆشیی خۆم پیشاندا.
دوای چەن ڕۆژێکی دیکە، کاک « کاوە » گوتی: بۆچی چاوپێکەوتنێ لەگەڵ مامۆستادا ساز ناکەی، من ئەرکی چاپکردن و بڵاوکردنەوەی، لە ئەستۆی خۆم دەگرم؟
لە ڕاستییدا، ئەم داواکارییە، لای من، شتێکی کتوپڕیی و چاوەڕوان نەکراوبوو. چونکە، بیرم لەوە نەکردبۆوە، ئەو کارە بکەم. بەڵام گوتم: بیری لێ دەکەمەوە و پاشان، وەڵامت لێ دەگێڕمەوە.

دوای ئەوەی، بە تەواویی، بیرم لە هەموو لایەنەکانی ئەو پێشنیازە کردەوە، بڕیارمدا، بانگهێشتن و میوانداریییەکەی مامۆستا پەسەندکەم، چاوپێکەوتنێکی درێژیشی لەگەڵدا سازکەم، تا، لە نزیکەوە، ئاگام لە هێندێ دید و بۆچونی، سەرکردەی یەکێ لە پارتە ئیسلامیییەکانی کوردستان بێ، بە تایبەتیی، لەو بارودۆخەی، « باشووری کوردستان » و بزووتنەوەی کوردایەتیی پێدا تێپەڕدەبێ، گرفتێکی زۆر و گەورە، لە نێوان هێزە کوردستانیی و ئیسلامیییەکاندا هەیە. دەمویست، لە زمانی خۆیانەوە، گرێکوێرەی هێندێ لەو گرفتانە، چ بۆ خۆم و چ بۆ رۆڵەکانی گەلەکەم بکەمەوە و لێیان تێبگەم، بزانم، بۆچی ئەوەتەی، ڕاپەڕین بەرپا بووە، ئەو دەسەڵاتە کوردییە، لەو بەشەی « باشووری کوردستان »دا دامەزراوە، ئەو هێزە کوردستانیی و ئیسلامیییانە ڕێک ناکەون، چەن جارێکیش، دژی یەکدی وەستاونەتەوە، جەنگی خوێناویی و ماڵوێرانکارانە، لە نێوانیاندا ڕوویداوە! لەبەرئەوە، بەو برادەرەم گوت: کارێکی زۆر باشە و من ئامادەم. بەڵام، هێندێ مەرجم هەیە.
گوتی: هەرچی تۆ بڵێی، دەیکەین.
گوتم: تەنیا هێندە هەیە، من بە ئارەزووی خۆم و زۆر بە ئازادیی پرسیاری لێ دەکەم. با ئەویش، لە وەڵامدانەوەدا ئازادبێ. چاوپێکەوتنەکەش، لە سەر کاسێتی ڕیکۆردەر تۆماردەکەین، بەڵام، ئێوە نابێ، بڵاویکەنەوە، تا، خۆم بەرهەمەکە تەواودەکەم و بە نووسین بڵاویدەکەمەوە. لەبەرئەوە دەبێ، خۆتان ڕیکۆردەر و کامێرەی وێنەگرتن ئامادەکەن، چونکە، من لێرە هیچم نییە.
گوتی: نەک هەر ئەو شتانە، بەڵکوو، کامێرەی ڤیدیۆش دابیندەکەین. چاوەڕێبە، تا وەڵامت لێ دەگێڕمەوە.
چەن ڕۆژێ تێپەڕی، پاشان پێی گوتم: بەم زووانە دەڕۆین و ترۆمبێلیش ئامادەکراوە، کێش لەگەڵ خۆت دێنی، با بفەرمووێ.
منیش گوتم: « شێخ عەزیز »ی ئامۆزام بانگدەکەم. چونکە، پێشتر مامۆستای دەناسی. ماوەیەک، لەگەڵ « بزووتنەوەی ئیسلامیی »دا، کاری کردبوو، پاشان دانیشتبوو! باوکیشم، زۆر حەزیدەکرد، ئەو ناوە ببینێ و لە نزیکەوە، مامۆستا بناسێ، لەبەرئەوە، بڕیارمدا، سێ قۆڵیی بچین.
ئەوەبوو، ڕۆژی یەکشەممەی ڕێککەوتی « 06 .10 .2002 »مان دیارییکرد. بەیانیی، لە کاتی دیاریکراوی خۆیدا، کاک « کاوە » و ترۆمبێلەکە، لە بەر دەرگەی ماڵەوە ئامادەبوون. کاژێری نۆ، لە « سولەیمانیی » دەرچووین و

بەرەو « ئەحماوا » بەڕێکەوتین. هێندێ لە بەرهەمەکانی خۆشم، بە دیاریی بۆ مامۆستا بردبوو، خۆشم تا ئەندازەیەک، بۆ دیدارەکە ئامادەکردبوو.
بەڵێ، سواربووین و لە شار دەرچووین. شۆفێرەکەمان ناوی « موسڵیحی هەمزە ئاغا » بوو. کوڕێکی شارەزا و خوێندەواربوو. لە ڕێ، دەربارەی مێژووی کورد و ئیسلام، هێندێ دەمەتەقێمانکرد. بەڵام، هەر زوو بۆم دەرکەوت، بەو ئاسانییە، لە یەکدی ناگەین. چونکە، ئەو لە دیدی ئیسلام و من لە دیدی ناسیۆنالیزمەوە، شەن و کەوی مێژووی کوردمان دەکرد. ئەو دوو دیدەش، زۆر جیاوازییان هەیە. لەبەرئەوە، باسەکەم گۆڕی!
ئەوی ڕاستیبێ، ماوەی « 25 » ساڵ بوو، لە شارۆکەی « سەیید سادق » بەو لاوە، نەمدیبوو! هەر چەندە، کاتێ ساڵی «1991 » و دوای ڕاپەڕین گەڕامەوە، بڕیارمدا، سەردانێکی شارۆچکەی « هەڵەبجە »ی شەهید بکەم، تا، لە نزیکەوە، ئەو وێرانکاریی و ماڵوێرانییەی، « بەعس »ی داگیرکەر ئەنجامیدابوو، بە چاوی خۆم ببینم. بەڵام، بە داخەوە، تا ئەو ساتە، بۆم ڕێک نەکەوت، ئەو هیوایەم بەدیبێنم!
لەبەرئەوە، هەر لە شارۆکەی « سەیید سادق » دەرچووین، زۆر بە وردیی، سەرنجی هەر دوو بەری جادەکەم دەدا، تا چاو بڕیدەکرد، تەماشامدەکرد.
ئەوەی دەمبینی، گوندێکی زۆر ئاوەدانبوویۆوە و خەڵکێکی زۆر، لەو ناوەدا بوون، زۆر دڵی خۆشکردم. بەڵام، ئەوەی زۆرم پێ ناخۆشبوو، ئەو هەموو چەکدار و بازگانە بوو، کە لە سەر جادەکان هەبوون!
دوای ئەوەی، جەنگی چەپەڵی نێوخۆ، لە نێوان « پارتیی و یەکێتیی »دا هەڵگیرسا، « باشووری کوردستان » بە سەر چەن نێوچەیەکدا دابەشکرا. لە هەر نێوچەیەکیش، چەن دەسەڵاتێکی جیاوازی تێدا دامەزرا.
لەبەرئەوە، هەر لە شاری « سولەیمانیی »یەوە، تا شارۆکەی « خورماڵ »، بە دەس هێزەکانی « یەکێتی نیشتمانیی کوردستان »ەوە بوو. بەڵام، هەر لە جادە ڕاستەکە لاماندا، بەرەو شارۆکەی « خورماڵ » پێچمانکردەوە و ڕووەو « ئەحماوا » ڕۆشتین، ئیدی، هەموو ئەو نێوچانە و تا سەر سنووری نێو دەوڵەتیی نێوان « عێراق ـ ئێران »، لە لایەن هێزی پارتە ئیسلامییەکانەوە کۆنترۆڵکرابوو و لە ژێر دەسەڵاتی ئەواندا بوو. بۆیە، یەکەمین بازگە، لە دەروازەی شارۆکەکەدا، هی ئیسلامییەکان بوو. واتە: لەو بستۆکە ڕزگارکراوەدا، دەسەڵاتێکی دیکەی نوێ دەسپێکرد!
ئێمە، لە نێو « خورماڵ » نەوەستاین. بەڵام، هەر لە ترۆمبێلەکەوە دەمڕوانی، هەموو شت بە ئاشکرا دیاربوو، گۆڕابوو. چونکە، « خورماڵ »

ئەوە نەبوو، کە جاران دیبووم، جیاوازییەکی زۆری هەبوو. وامدەزانی، تەماشای تێلیڤیزیۆن دەکەم و یەکێ لە شارۆکەکانی « ئەفگانستان » دەبینم! نێو شارۆکەکە و سەر جادەکان، وەک پورەی هەنگ وابوون، خەڵکێکی زۆریان تێ ڕژابوو، جمەیان دەهات. بەشێکی زۆری خەڵکەکە، چەکداربوون، زۆربەی زۆریشیان، ڕیشێکی پان و درێژیان هێشتبۆوە، بەرگێکی چڵکن و خاکییان لەبەردابوو. شارۆکەکە، بە شێوەیە بوو، زۆر بە ئاشکرا، ڕەنگ و ڕووی هەژاریی و دواکەوتوویی پێوە دیاربوو!
هەر چەندە، ئەم نێوچەیە، لە لایەن « کۆمەڵی ئیسلامیی »یەوە کۆنترۆڵ کرابوو. بەڵام، هێندێ چەکداری « ئەنصار ئەلئیسلام »یشی تێدا بوو. چونکە، کاک « کاوە »، لە پەنجەرەی ترۆمبێلەکەوە، دوو چەکداری ئەوانی پیشاندام و گوتی: ئەو دووانە لە ئەوانن.
گوتم: چۆن دەزانی و بە چیدا لە چەکدارەکانی خۆتانی جیادەکەیتەوە؟
گوتی: ئەوان، پەڕۆیەکی ڕەشی درێژ، بە نێوچەوانیانەوە دەبەستن و کلکەکەشی، لە پشتەوە شۆڕدەکەنەوە.
بەڵام، لای من، هیچ جۆرە جیاوازییەکیان نەبوو. چونکە، هەموویان، هەر یەک جۆرە جلیان لەبەردابوو، هەموویان هەر چەکداربوون، هەموویان هەر چڵکن و ڕیشداربوون. مەگەر، وەک گای قوربانیی، بە پەڕۆکانیاندا بناسرێنەوە، ئەگینا، گەر پەڕۆکانیان فڕێدەن، ئەوا، لە یەکدی دەچن!
لێم پرسی: لێرە چی دەکەن؟
گوتی: خەڵکی ئەم ناوەن و بۆ سەردانی کەسوکاریان هاتوون. هەڵبەتە، دوای ئەو چەن پێکدادانانەی نێوان هێزەکانی « یەکێتیی و جوند ئەلئیسلام »، هێزەکانی « کۆمەڵی ئیسلامیی »، ناوبژیانکردبوون و لە نێوانیاندا مابوونەوە، تا، پەلاماری یەکدی نەدەن!
پاشان، لە « خورماڵ » ڕەتبووین و نزیک بازگەیەکی دیکەی « کۆمەڵ » بووینەوە. هەر لە دوورەوە گوتیان: میوانەکانی مامۆستان! ئیدی، خۆشهاتنیان لێ کردین و هیچ ڕایان نەگرتین.
ماوەی نێوان « خورماڵ و ئەحماوا »، هەمووی چەن خولەکێ بوو. بەڵام، ڕێگەکەی زۆر خراپبوو، هەموو قیرەکەی ڕۆشتبوو، نێو سکی جادەکە بە تەواویی، بەدەرەوەبوو. برادەرانی « کۆمەڵی ئیسلامیی »، ڕەخنەیان گرت و گوتیان: ئەم ڕێیە زۆر خراپە، چەن جارێ، داوامان لە کاربەدەستانی میریی کردووە، چاکیکەن، بەڵام، هەر بەڵێنیانداوە و هیچیشیان نەکردووە!

منیش گوتم: ئەو جۆرە کارانە، پتر پێوەندیی بە باری ڕامیارییی و دەسکەوتی پارتایەتییەوە هەیە. ئێوە دەتانەوێ، « یەکێتیی » جادەکەتان بۆ قیرتاوکا، پاشان، بە دانیشتووانی نێوچەکە بڵێن: ئێمە، ئەوەمان بۆ کردوون! هەر کاتێ، خۆیان لێرە باڵادەسبوون، ئەوا، هەموو شتێکیان بۆ دەکەن، بۆ ئەوەی، بە لای خۆیاندا ڕایانکێشن!

کاژێری « 10.15 »ی سەر لە بەیانیی بوو، لە گوندی « ئەحماوا » و لە بەردەم مەڵبەندی سەرکردایەتی « کۆمەڵ »دا دابەزین. لە دوورەوە، کۆمەڵێ پیاوی چەکدار و بێ چەکم بینی، بە پیرمانەوە دەهاتن. هێشتا، بە تەواویی نزیک نەبووبوونەوە، کاک « کاوە »، مامۆستای پیشاندام. ئەوە، یەکەمین جاربوو، بیبینم، پێشتر، تەنانەت بە وێنەش نەمدیبوو!

هەر نزیکبووینەوە، لە پێش هەموویانەوە، مامۆستا « عەلی باپیر »، بەرەو ڕوومان هات، بە ڕوویەکی خۆش و بە زەردەخەنەیەکی شیرینەوە، زۆر بە گەرمیی، پێشوازیی لێ کردین. ئەوەی، لە یەکەمین دیداردا سەرنجمدا، پیاوێکی تێکسمڕاوی نە کەڵەگەت و نە کوورتەباڵا بوو. دەمووچاوێکی گۆشتنی سپیکەڵەی ڕووە و گەنم ڕەنگی هەبوو، بە ڕیشێکی ڕەشی پڕی درێژی خاوێن داپۆشرابوو. دەسێ جلی کوردیی پێشمەرگانەی لەبەردا بوو، ڕووی زۆر خۆشبوو، هەمیشە، دەم بە پێکەنین بوو. هێندەی لە بریسکەی چاوەکانیدا، پاکیی و ڕاسگۆییم بەدیکرد، هێندە لە چاوی هیچ بەرپرسێکی دیکەی پارتەکانی « کوردستان »دا بەدیم نەکردووە!

پاشان، برایان « تۆفیق کەریم » ئەندامی سەرکردایەتیی و بەرپرسی دەزگەی ڕاگەیاندنی کۆمەڵ، « محەمەد حەکیم جەبار » ئەندامی سەرکردایەتیی و بەرپرسی بیرۆی میر، « بیلال قەڵادزێیی » بەرپرسی ڕاگەیاندن و ئەندامی بیرۆی میر، « نەژاد ئەحمەد » ئەندامی بیرۆی میر، پێشوازییان لێ کردین، بە ڕوویەکی خۆش و ڕێزێکی زۆرەوە، خۆشهاتن و فەرموویان لێ کردین و بەرەو مەڵبەندەکە ڕۆشتین.

هەر چووینە ژوورەوە، خێرا، چاوێکم بە جێوڕێیاندا گێڕا. بەشێکی مەڵبەندەکە، لە حەوشێکی گەورە پێکهاتبوو. نیوەی حەوشەکە باخێ بوو، لە نێوەڕاستدا بە چیمەن و چواردەورەکەشی، بە گوڵ و گوڵزار ڕازابۆوە.

بەشێکی دیکەی حەوشەکە، کۆنکرێت کرابوو، بە دەستووری مزگەوت، حەوز و ئاوێکی خاوێنی لێ دروستکرابوو. هەم لێی دادەنیشتن، هەم نوێژیشیان لێ دەکرد. لەبەرئەوە، هەر کەسێ بهاتایە، هەر لە ڕێوە دەبووایە، پێڵاوەکانی داکەندایە. لە بەشی خوارەوەی حەوشەکەشدا،

کۆمەڵێ ئاودەسی خاوێنی لێ بوو. بەشەکەی دیکەی مەڵبەندەکە، لە چەن ژوورێکی گچکە و گەورە پێکهاتبوو. ژوورێکیان، هی « میری کۆمەڵ » خۆی بوو. ژوورە گەورەکەشیان، پڕ فەرش کرابوو، جێی دانیشتن، کۆبوونەوە و نوێژکردنی زستانیش بوو.
لە سەر داوای من، لە ژوورە گەورەکە دانیشتین و چامان بۆ هات. بە دەم چاخواردنەوەوە، مامۆستا ڕووی تێ کردم و گوتی: هێندێ لە بەرهەمەکانتم خوێندۆتەوە، بە ڕاستیی، زۆر ڕاسکۆیانە نووسیوتن، بێ لایەنییەکی تەواویی پێوە دیارە. چونکە، هەڵەکانی هەر سێ پارتەکەت: « یەکێتیی، پارتیی و P.K.K. »، وەک یەک باسکردووە. بە کوردییەکی زۆر باش نووسیوتن و تەنانەت، نیشانەکانی خاڵبەندییشت، زۆر بە وردیی بەکارهێناوە. بەڵام، حەزدەکەم، لە زمانی خۆتەوە، پتر بتناسم و شتێ دەربارەی خۆت بزانم.
منیش، کورتەیەکی ژیانی خۆم و بنەماڵەکەم بۆ باسکرد. ئیدی، هەر وا بە قسەی ئاسایی، دەنگوباسی « کوردستان »، باسی ئایین، وێژە و جیهانەوە، کاتمان بەسەربرد. دواییش، ئەم بەرهەمانەی خۆم « ڕۆڵی سیستێمی بنەماڵە لە بزاڤی ڕزگاریخوازی نیشتمانیی کوردستاندا، گرفتە سەرەکییەکانی کورد، مەسعوود محەمەد و دوو دیداری دۆستانە، پێنج کاتژمێر لەگەڵ برایم ئەحمەددا و خولانەوە لە بازنەیەکی بۆشدا » پێشکەشکرد.
وردەوردە، لە نوێژی نیوەڕۆ نزیکبووینەوە. مەلا بانگیدا. مامۆستا هەستا، داوای یارمەتیی لە من کرد و ڕۆی. ئیدی، ئەوان هەموویان، بەرەو نوێژ کردن ڕۆشتن و منیش، لەو ژوورە گەورەیەدا، بە تەنیا مامەوە. هەر وا بۆ خۆم، لەو دروشم و ئایەتە قورئانییانە وردەبوومەوە، کە بە دیواری ژوورەکەدا هەڵواسرابوون. ئەوەی لە هەموو شتەکان پتر، سەرنجی ڕاکێشام، سیمبۆلی « کۆمەڵ » بوو، بازنەیەک کێشرابوو، لە نێوەڕاستی بەشی خوارەوەیدا، پەرتووکێک و چەکێکی « کلاشینکۆف »ی تێدابوو. لایەکی پەرتووکەکە، نیشانەی قورئانی پیرۆز و لایەکەی دیکەشی، نیشانەی گوتەکانی پەیامبەر بوو. مەبەست لە چەکەکەش، بۆ پارێزگارییکردنی ئایینی ئیسلام و چەسپاندنی پرینسیپەکانی بوو. واتە: باوەڕیان بە بەکارهێنانی هێز هەیە. چونکە، چەک وەک نیشانەی هێز وایە. لە دڵی خۆمدا گوتم: تۆ بڵێی: ئەو دووانە، شانبەشانی یەکدی بڕۆن؟!! لە نێو بازنەیەکی دیکە و بە چواردەوریدا، هێندێ شت نووسرا

بوو. له لای ســەرەوە، ئایەتی « و جـاهدوا فی الله حق جـهــاده » و له بەشەکانی دیکەی بازنەکەشدا، ناوی « کۆمەڵ » بە زمانەکانی « کوردیی، عەرەبیی و ئینگلیزیی » تۆمارکرابوو.
مامۆستا، بە گوتارەکانیدا دیاربوو، زۆر لەگەڵ « جیهاد » دابێ. مەبەستی لە « جیهاد »یش ئەوەیە، دژی « گاوور » بکرێ، هەر وەک لە گوتارەکــەی « چیچێنستان »دا، بە ئاشکرا، پەنجەی لە سەر داناوە!
کـاتێ، لە نوێژی نیـوەڕۆ بوونەوە، هەمـوویان گـەڕانەوە. کـەمـێکی دیکە دانیـشـتین. ئینجـا، هـەناری « ئەحـمـاوا »یان بۆ هێنایین. بە دەم هـەنار خواردنەوە، مامۆستا لێی پرسیم: لە ڕووی باوەڕی ئایینییەوە چۆنی؟
منیش گوتم: باوەڕێکی تەواوم، بە یەزدانی مەزن هەیە. تەنانەت، لە مانگی « ڕەمەزان »یشدا، بەڕۆژوودەبم، نوێژدەکەم و قورئانیش دەخوێنم.
ئینجا، بە ڕوویەکی خۆشەوە گوتی: « ماشەڵڵا ».
دیاربوو، چاوەڕێی ئەو وەڵامــەی نەدەکرد. بۆیە، هەم لای سەیربوو، هەم زۆریشی پێ خۆشبوو. دیسانەوە، لێی پرسـیمـەوە و گوتی: ئەدی بۆچی، کاتەکانی دیکە بەردەوام نابی؟
گوتم: هەموو شتێ بە دەس خـوایە. هەڵبەتە، هێشـتا خـوا، بە تەواویی، لە پەلم نەنەویوە و لە سەر ئەو ڕێیە دای نەمەزراندووم!
لەو قسانەدا بووین، برایەک هات و گوتی: نانی نیوەڕۆ ئامادەیە.
مامۆسـتـاش گـوتی: ئەمـان مـیـوانی منن و دەچینە مـاڵەوە! ئێـمـەش لەگەڵ چەن دۆستێکی خۆیدا هەستاین و ڕۆشتین.
مـاڵەکـەیان، زۆر نـزیکبـوو، هەر بە تـەنیـشـت مـەڵبـەنـدەکـەوە بوو. وەک لە دواییشدا زانیم، مـامـۆسـتـا خـانووی نەبوو، بەڵکوو، ئەوەش هەر لە سەر مەڵبەندەکە بوو، خۆی و منداڵەکانی تێیدا دەژیان. خـانووەکەیان، لە سێ ژوور و هـەیـوانێ پێکـهـاتبـوو. بە شـێـوەی ڕۆژهـەڵاتیی درووســتکرابوو. حەوشـەیەکی خنجیلانەی هەبوو، هێندێ دار و گـوڵیان تێدا ڕواندبوو. لە دوو لاشەوە، دوو دەرگەی بۆ دەرەوە هەبوو. ژوورەکانیش، زۆر ئاساییبوون و بە فــەرش پڕکـرابوونەوە. لە ژووری گـەورەکـەیاندا دانیـشـتین و خـوان داخرا، خواردنێکی کوردانە و موسوڵمانانەی زۆریان هێنا. مرۆ، هەر بە بۆن و بەرامـەکـەی تێـردەبوو. بە دەم نانخــواردنیـشــەوە، هەر قــســەی خۆشمان دەکرد.
مـامۆسـتـا، هـەر خـەمی میـوانەکانی خـۆی بوو، زووزوو، شلە و گـۆشـتی دەکوێزایەوە، قـاپە چۆڵەکانی پڕدەکردەوە و لە بەردەمی ئێـمـەدا دایدەنا.

باوکمی لە سەروو خۆیەوە دانابوو، زۆر خەمی دەخوارد و پەیتاپەیتا، ڕاژمیدەکرد. پاشان، چامان خواردەوە، کەمێکی دیکە دانیشتین و بە قسەکردنەوە خەریکبووین. پاشتریش، هەستاین و بەرەو مەڵبەند گەڕاینەوە، هەر لە نێو حەوشەکە و لە ژوورەکەی خۆیدا، هەم بۆ یادگار و هەم بۆ کارەکەش، هێندێ وێنەمان گرت. ئیدی، باوکم و « شێخ عەزیز » ڕۆشتن، تا لە مالی « لەیلا »ی ئامۆزام، کەمێ بحەوێنەوە و بنون. من و مامۆستاش، لە ژوورەکەی خۆیدا گیرساینەوە.

ژوورە تایبەتییەکەی مامۆستا، کە ناوی « بیرۆی میر » بوو، ژوورێکی لاکێشی ڕووناکبوو. پڕ فەرشکرابوو. بە درێژایی دیوارەکەی ناوەوە، پەرتووکخانەیەکی گەورە دانرابوو، بە پەرتووکی هەمەجۆرەش، سیخناخ کرابوو. بەڵام، زۆربەی زۆریان، پەرتووکی ئایینیی بوون. لە تەنیشت پەنجەرەکەشەوە، مێزێکی نووسین و کورسییەکی گەورەش دانرابوو. ئەوەش، جێی کارکردنی مامۆستا و پێشوازییکردنی خەڵک بوو. چەن کورسییەکی دیکەش، بۆ میوان ڕیزکرابوون. لە پشت سەریشییەوە، دروشمی « کۆمەڵ » و لە تەنیشتیشییەوە، نەخشەیەکی « باشووری کوردستان » بە دیوارەکەوە هەڵواسرابوون.

ئیدی، کاتی ئەوە هاتبوو، دەس بە کارەکانمان بکەین. هەر چۆنێ بوو، جێی خۆمان و کامێرەی ڤیدیۆکەمان دیارییکرد و دامەزراین. دەوروبەری کاژێری دووی پاش نیوەڕۆ بوو، من و مامۆستا دانیشتین و بە یەکەم پرسیار، سەرەتای چاوپێکەوتنەکەم دەسپێکرد. ئیدی، بەو شێوەیە، ماوەی سێ کاژێر پێکەوە بووین، بە پرسیار و وەلامدانەوەوە خەریکبووین. تەنیا کامێرەمانەکە نەبێ، لەگەڵماندا بوو، کەسی دیکەی لێ نەبوو، مەگەر جار و بار، یەکێ بهاتەیە و کارێکی هەبووایە.

بەلام، لە پەنجەرەکەوە، چاوم لە باوکم بوو، لە سەر سەکۆ چیمەنتۆکەی حەوشە، لە نێو چەکدارەکاندا دانیشتبوو، دیاربوو، قسەی خۆشی بۆ دەکردن. لەوە دەچوو، لەگەڵیان ڕێککەوتبێ و پێکەوە گونجابن. بەلام، دوایی ئارامی لێ هەڵگیرا و هەر خێراخێرا، تەماشایەکی لای ئێمەی دەکرد. یا، هەڵدەسا و پیاسەیەکیدەکرد، خۆی پیشانی ئێمە دەدا، دەستێکی ڕادەوەشان و سەیرێکی منی دەکرد، وەک بلێ: ئەرێ ماڵ بە قووڕ نەگیرێ، ئەوە ئێوە، خەریکی چین؟ باسی چی دەکەن؟ هەر تەواو نەبوون؟ منیش، چاکم دەزانی، باوکم هی ئەوە نییە، بەو تەمەنەوە، هێندە لە شوێنێکدا دانیشێ و ئارامبگرێ، ڕەنگە، برسیشیبووبێ!

بەڵام، چار نەبوو، هەر دەبووایە، ئەو چاوەڕێی بکردایە و ئێمەش، کاتێ کۆتاییمان بەو کاتە بێنایە، کە بۆ خۆمانم دیارییکردبوو! بۆیە، ئێمە لە سەر گفتوگۆی خۆمان بەردەوامبووین و ئەویش، هەر هاتوچۆیدەکرد. تا، خوای باوکم کردی، لە ناکاو، مەلا بانگی ئێوارەی دا، دەستی پێ لە کار هەڵگرتین و باوکیشمی، لەو هاتوچۆیە ڕزگارکرد!

بەڵێ، ئەوان لە سەر سەکۆکە، نوێژی ئێوارەیان دابەست. مامۆستا پێشنوێژیی بۆ کردن. منیش، بە تەماشاکردنی پەرتووکەکانی مامۆستاوە، خۆم خەریککرد. دوای ئەوەی، لە نوێژ بوونەوە، دیسانەوە، مامۆستا بۆ نانخواردنی ئێوارە، پێش خۆی داین و داوەتیکردینەوە.

نانی ئێوارە، جگە لە هێندێ گۆشت و خواردنی نیوەڕۆ گەرمکرابوونەوە، جۆرە خواردنێکی دیکەشیان درووستکردبوو، زۆر بە تامبوو. خواردنەکە، لە نێوان کفتە و کوبەدا بوو، شلەیەکی زەردی زۆر خۆشیشیان بۆ کرد بوو. جگە لە سەوزە و نانی کوردیی، ماستاو و ساردییەکی زۆریشیان دانابوو. ڕۆژ ڕۆژی باوکم بوو! چونکە، زۆر حەزی لە خوانی ڕازاوە هەیە و خواردنێکی باشیش دەخوا! مامۆستاش، هەر خەریکیبوو، لە ڕاژەکردنی کەمتەرخەمیی نەدەکرد.

نانی ئێوارەمان خوارد و تەواوبوو. پاشان، لە ژوورێکی دیکە دانیشتین و چامان بۆ هات. بە دەم چاخواردنەوەوە، گوێمان بۆ دەنگوباسەکانی، کەناڵی عەرەبیی « ئەلجەزیرە » شلکردبوو. ماوەیە ماینەوە و بە قسەکردنەوە خۆمان خەریکردبوو. پاشان، ئێمە هەستاین و ڕۆشتین. ئەو دوو جارە، لە ماڵی مامۆستا بووم، گوێم لە دەنگی ژن بوو، بەڵام، کەسیانم نەدی. تەنیا، دوا جار نەبێ، کاتێ، لە هەیوانەکە دەسم دەشت، مامۆستا گوتی: ئەوە ماڵەوەمانە و دەیەوێ، بەخێرهاتنتانبکا. هاوسەرەکەشی، زۆر بە گەرمییەوە، خۆشهاتنی لێ کردین. بەڵام، بەپێی دابونەریتی خۆیان، لەو دیو پەردەیەکی تەنکی، دەرگەی نێوان هەیوانەکە و چێشتخانەکەدا وەستابوو، تا نەیبینین!

دوایی، ئێمە سەرێکمان لە ماڵی « لەیلا »ی ئامۆزام دا. ماڵەکەیان، هەر بە تەنیشت ماڵی مامۆستاوە بوو. مێردەکەشی، شۆفێری تایبەتیی مامۆستا خۆی بوو. دوو ناوی هەبوو، « سەروەت »، باوک و دایکی بە منداڵیی ناویاننابوو. « زووبێر »یش، پارتەکەی بە گەورەیی بۆیان دانابوو! کوڕێکی قۆزبوو، ڕێشێکی هێشتبۆوە، ماندووبوونێکی زۆر، بە ڕووخسارییەوە دیار بوو، بەهرەی لاوێتیی، بە تەواویی ژاکاندبوو!

لەگەڵیاندا چووم و « لەیلا »ی ئامۆزام بینی. ئەو « لەیلا »یەی، دوای چەن کوڕ، خوا بە دایک و باوکی بەخشی و کاتی خۆشی، مامە « بەکر »م، بە ناوی خوشکە « لەیلا قاسم »وە ناوینابوو! ئەو « لەیلا » ناسک و نازدارەی، سەر و قژی تا سەر سنووری نێوچەوانی، بە لەچک داپۆشرا بوو، هەموو ئەندامەکانی جەستەشی، لە جبەیەکی درێژی ژنانەوە هەڵکێشرابوو! وا دیاربوو لە پێناوی باوەڕە ئایینییەکەی خۆیدا، بە تەواویی، وازی لە هەموو خۆشییەکی ژیان هێنابوو، کوڵی جوانیی و کاڵبیی خۆی بەدەستی خۆی و بۆ خواپەرستیی هەڵوەراندبوو!
کەمێ دانیشتین و پاشان هەستاین. چونکە، مامۆستا ترۆمبێلی بۆ ئامادەکردبووین، بۆ ئەوەی، سەرێکی گوندی « زەڵم » و تاقگەکانی بدەین. لەبەرئەوە، پێش ئەوەی تاریک بکا، هەستاین و بەڕێکەوتین. ئێمە پێنج کەس بووین. « من، باوکم، شێخ عەیز، سەرووەت » و برایەکی دیکەشمان لەگەڵ بوو. بەو ڕێگە بەردەڵانیی و پێچاوپێچانەدا، بە ترومبێل، تا نێو گوندی « زەڵم » چووین. لەو سەری ئاوایی، ترۆمبێلەکەمان ڕاگرت، دەرگە و پەنجەرەکانیمان داخست. ئیدی، بە پێ ڕۆشتین. چونکە، چی دیکە ڕێی ترۆمبێل نەبوو. بەڵکوو، تووڵەڕێیەکی بەردەڵانیی بوو، هێندێ جار، هێندە تەسک دەبۆوە، دەبووایە، بە سەر کۆنکرێتی قەراغی جۆگەلەکەدا بڕۆشتینایە و دەسمان، بە دیواری چیاکەوە بگرتایە. من، هیچ خەمی خۆم نەبوو، چونکە، جگە لەوەی بەکاربووم، کەلێکیشم لەو ڕێ سەختانە دیبوو. بەڵکوو، زۆر خەمی باوکم بوو. ئەویش، هێندە حەزی لە گەڕان بوو، هەر چەندە، ماندووبوونیشی پێوە دیاربوو، چونکە، ڕێگەکەی بۆ ئەو سەخت و ناخۆشبوو، کەچیی، لەگەڵ ئەوەشدا، هەر کۆڵی نەدەدا. ئەوەی باشبوو، « شێخ عەزیز » دەسی گرتبوو، بە موو لێی جیا نەدەبۆوە، کاری ڕاستبێ، ئەو ئەرکەی لە کۆڵ من کردبۆوە، تا بە تەواویی، تەماشای دەوروبەری خۆم بکەم و چێژێکی زۆر، لە دیمەنە دڵفرێنەکانی سروشتی نیشتمانەکەم وەرگرم.
لەو کاتەدا، بەو تووڵەڕێ بەردەڵانیی و تەسک و باریکانەدا دەڕۆشتین، لە خۆشیاندا، هەموو ئەندامەکانی جەستەم، وەک چاویان لێهاتبوو، زۆر بە وردیی و خۆشییەوە، سەرنجی دەوروبەری خۆم دەدا. بە درێژایی ئەو ڕێیە، جۆگەلەیەکی بچکۆلانە و باریک، لە بناری چیاکەوە و تا سەرچاوەکەی، وەک تووڵەمار دەکشا و لێمان جیا نەدەبۆوە. ئاوەکەی هێندە ڕوون و خاوێن بوو، ڕەنگە، گەر بڵێم: لە ئاوی « کەوسەر » دەچوو،

یەزدانی گەورە، بە گوناح لێم نەگرێ! تا چاو بڕکا، هەموو ئەو ناوە، هەموو ئەم بەر و ئەو بەری ڕێگەکە، بە دار و درەختی بەردار و بێ بەر، بە دارستانی چڕ و پڕی سەوز داپۆشرابوو. بە شێوەیەکی زۆر جوان، ئەو ناوەی ڕازاندبۆوە، چاوی مرۆ، لە تەماشاکردنی هەر تێر نەدەبوو. لە هەموو لایەکەوە، دەنگی خوڕەخوڕ و هاژەهاژی ئاو دەهات. هەر هەنگاوێ دەڕۆشتین، کۆمێکی پچووکی مەنگمان دەبینی. دەنگی مەلەکانیش، بە تەواویی کزبووبوون. چونکە، لە هێلانەکانی خۆیاندا، ئارامیانگرتبوو، ماندووبوونی ڕۆژیان، لە جەستەی شەکەتیان دەردەکرد.
هەر ناوبەناوێکیش، لە دوورەوە و بە قەدپاڵی چیاکانەوە، خانوویەک یا دووانمان دەبینی، تیشکی دووری گلۆپەکانی دەبریسکانەوە، لە نێو پەلی درەخت و گەڵاکانەوە، لەگەڵ ئەستێرە بەرزەکانی ئاسماندا سەرەتاتکێیان دەکرد. ئەو ناوە، بە تەواویی، بەو ئاوە ڕوونە خاوێنە، بەو هەوا سازگارە بێ گەردە، بەو گوڵ و گوڵزارە جوان و ناسکانە ڕازابۆوە، بە هەوا فێنک و سووکەکەی، شانەکانی نێو سییەکانی مرۆی پاکدەکردەوە. ئیدی، بەهەشتێ بوو، پەروەردگاری جیهان، لە سەر زەویی، بۆ کوردی درووست کردبوو. سروشتی خواکردی ئەفسووناویی « ئەحماوا »، بە شێوەیە بوو، لە هەرچی دیمەنی دەسکردی ئەم جیهان هەیە، جوانتر و ڕازاوەتربوو.
چونکە، زۆر لە مێژبوو، ئەو ناوەم نەدیبوو، وام دەزانی، یەکەمین جارە و پێشتر نەمدیوە. لە بەر خۆمەوە، بیرم لەوە دەکردەوە و دەمگوت: ئەی خوای گەورە! تۆی میهرەبان، ئەم بەهەشتە جوانەت پێ بەخشیوین، کەچیی، ئازادیی و سەربەخۆییت لێ شاردووینەتەوە! تۆ بڵێی، ڕۆژێ لە ڕۆژان، کوردیش، وەک هەموو نەتەوەکانی دیکەی ئەم جیهانە، لە ماڵە وێرانەکەی خۆیدا، بە ئازادیی و خۆشیی بژی، چی دیکە لەوە پتر، دەسی « چەوساندنەوە، ترساندن، تۆقاندن، گرتن، لێدان، ڕاونان، ئاوارەکردن، کوشتنی بە کۆمەڵ و ئەنفالکردن »ی لێ بە دووربێ و وەک مرۆ بژی؟!!
هەر بە دەم ئەو بیرکردنانەوە دەڕۆشتم، ناوبەناو، مناڵ، ژن و پیاومان تووشدەبوون، لە کارکردن دەگەڕانەوە و بە تەنیشتماندا ڕەتدەبوون، زۆر بە ڕێزەوە، سڵاویان لێ دەکردین. ئیدی، بەو شێوەیە توانیمان، بە پازدە خولەک، ئەو ڕێ پڕ لە هەوراز و بەردەلانییە ببڕین، لە شوێنێکی بەرز و بەرانبەر بە تافگەکان، بە سەرسامیی قووتبینەوە.
بەڵێ، گەیشتینە لای ئەو بەهەشتەی، یەزدانی مەزن، لە سەر بستێکی خاکی « کوردستان »ەکەمان درووستیکردووە. ئینجا، تەماشای چی

بکەم؟ تاڤگەی چی؟ تاڤگە، لە دەمی ئەشکەوتی تاقی ئاسمانەوە، زۆر بە خێرایی هاژەیدەکرد. لە دوورەوە، وەک دوو ڕووباری شیری سپی، لە مەمکی دایکی چیا سەرکەشەکەوە، سەربەرەوخوار دەڕژان. وەک چەن تاڵە کلافەیەکی زیوین، بە قەدپاڵی چیاکەوە شۆڕدەبوونەوە. کاتێکیش، بەردەبوونەوە و بەر تاشەبەردە گەورەکان دەکەوتن، جارێکی دیکە، بەرز دەبوونەوە و وەک چەن دەنکە مرواریییەک، بە چواردەوری ئەو بەهەشتەدا پرشویلاودەبوونەوە. نە چاو، لە جوانیی ئەو دیمەنە شیرینە تێردەبوو، نە دڵ و دەروونیش، لێیان پڕدەبوو. ئاخر، چۆن چاوم، لەو دیمەنە جوانە دڵفڕێنانەی پارچەیە لە نیشتمانەکەم تێر بخوا؟ ئاخر، چۆن دڵ و دەروونم، لێیان تێربێ، گەر، هەموو بیرەوەریی، چەندین سەیرانی منداڵیی، بیستوپێنج ساڵی دووریی، وەک فیلمێکی سینەما، بە بەر چاومدا تێپەڕ بن؟!! ئاخر، چەندین جار، لەگەڵ کەسوکار، هاوڕێ، خوێندکارانی زانکۆی « سولەیمانیی »، سەردانی ئەو نێوچەیەمان کردبوو، زۆر بە خۆشیی و کامەرانیی ڕامانبواردبوو، چەندین یادگاری شیرین و پیرۆز، لە شانەکانی مۆخمدا تۆمارکرابوون. بۆیە، جارێکی دیکەش، چاوم، بە کلی تاڤگە زیوینەکەی « زەڵم » ڕشتەوە. جارێکی دیکەش، دڵم، بە لووتکەی چیا سەرکەشەکانی کرایەوە. جارێکی دیکەش، جەستەی ماندوو و شەکەتم، بە ڕەنگی سەوزی گەڵای درەختی باخەکانی حەوایەوە. جارێکی دیکەش، برینی دەردی دووریبم، بە هاڕەی تاڤگەکەی سارێژبۆوە. تووڵە ڕێی باریک و پێچاوپێچی، نێوان گوندە خنجیلانەکەی « زەڵم » و تاڤگەکانیشی، گەشتە ڕازاوەکەی بەهەشتی « هەورامان »ی « گۆران »ی هۆنەر و بلیمەتی بیردەهێنامەوە!

ئەوەی زۆر دڵخۆشکەریش بوو، ئەوەبوو، ڕێکخراوە بیانیی و خێرخوازەکان، لە دامێنی تاڤگەکەدا، ئێسگەیەکی کارەبایان دامەزراند بوو، ئەو ناوەی، هێندەی دیکە جوان کردبوو، کارەبای بۆ هەر دوو گوندی « زەڵم و ئەحماوا »ش دابینکردبوو. هەر چەندە، هێشتا بە تەواویی، لەو دیمەنە جوانانە، تێر نەبووبووم، سیپەکانم، بە هەوای سازگار و خاوێنی، پاک نەبووبۆوە. بەڵام، چار نەبوو، هەر دەبووایە، بگەڕاینایەتەوە. چونکە، وردەوردە، تاریکی کردبوو.

لە دوورە و بەرانبەر تاڤگەکان وەستابووین، بە هەر چواردەوری خۆماندا دەمانڕوانی و تەماشای جوانیی، ئەو سرووشتە نازدارەمان دەکرد. لە پڕ، چەن مانگایەک لە سەرەوە دەرکەوتن، بەرەو ڕوومان دەهاتن ودەیانویست،

بۆ ئاوایی بگەڕێنەوە. کاتێ، چاویان بە ئێمە کەوت، ڕێمان لێ گرتوون، لە جێی خۆیان چەقین. چونکە، تووڵەڕێگەکە تەسک و بەردەڵانیی بوو. وەک ئەوەی، بیریان لەوە کردبێتەوە و لە دڵی خۆیاندا گوتبێتیان: ئێمە، بۆیە وەستاین، چونکە، جێی هەر دوو لامان نابێتەوە. لەبەرئەوە، یا ئەوەتە بڕۆن، یا ئەوەتە، ڕێگەکەمان بۆ چۆڵکەن، ڕێمانبدەن و بڕۆین! ئیدی، هیچ چار نەبوو، دەبووایە، ڕێمان بۆ چۆڵکردنایە، تا تێپەڕبن. ئەوان، لە چاو ونبوون و ئێمەش وردەوردە، بە هەمان ڕێدا گەڕاینەوە.

لە نزیک گوندی « زەڵم »یشەوە، تووشی کۆمەڵێ ژن و پیاو بووین. بێ ئەوەی بیانناسین، زۆر بە گەرمییەوە، فەرموویان لێ کردین. ئەوە تەنیا هەر، مەگەر خووڕەوشتی جوان و شیرینی کوردەواریی بە گشتیی و نەریتی خەڵکی گوندەکانی « کوردستان » بە تایبەتیی بێ، هێندە بەرز و پیرۆزە، ڕێز لە ڕێبوار و نامۆ دەگرن، ئەگینا، باوەڕ ناکەم، لە نێو هیچ نەتەوەیەکی دیکە و لە نێو شارنشینەکاندا، بەو شێوەیە بێ!

سوپاس بۆ یەزدانی گەورە، ئەو ناوە، بە تەواویی ئاوەدانبۆتەوە، خەڵکی ئەو دوو گوندە، هەر لە کۆنەوە، ژیانیان بەو جۆرە بەسەربردووە، بە میوە و باخـــــداریی بەڕێوەچوون. وەک دواییش بۆیان باسکردم، زۆربەی دانیشتووانی ئەو دوو گوندە، لەگەڵ « کۆمەڵی ئیسلامیی »دا کاردەکەن. پیاوەکانیان، ڕیشیان هێشتبۆوە، ژنەکانیشیان، لەچکیان بەستبوو.

ئەوەی زۆر نیگەرانیشیکردم، ئەوەبوو، ماوەیەک لەوەوبەر، کۆمپانیایەکی بیانیی هاتبوو، ویستبووی، پرۆژەیەکی مەزنی بەستی ئاو، لە نزیک تاڤگەکەوە درووستکا و ئەو ناوە بیبوژێنێتەوە. بۆ ئەو مەبەستە، بەرپرسەکانیان، لەگەڵ خەڵکی ئەو نێوچەیەدا قسەیانکردبوو. کەچیی، خەڵکی ئاوایی دژبوون و نەیانهێشتبوو! وەک مامۆستاش بۆی باسکردم، پارەیەکی یەکجار زۆریان، بۆ ئەو پرۆژەیە تەرخانکردبوو. بەڵام بە داخەوە، سەری نەگرت و دواییش، خەڵکەکە هەر خۆیان پەشیمانبووبوونەوە. گەر ئەو پرۆژەیە سەریبگرتایە، دانیشتوانی هەر دوو شارۆکەی « خورماڵ » و شارۆچکەی « هەڵەبجە »، لە گرفتی بێ ئاویی ڕزگاریاندەبوو!

لەبەرئەوە، هەموو جارێ، لە هەموو کات و شوێنێکیشدا، تەنیا هەر دیمۆکراسیی ڕووت باش نییە. بە تایبەتیی، لە نێو کۆمەڵێ خەڵکی نەزان و دواکەوتوودا، کە بەرژەوەندیی خۆیان نەزانن. چونکە، هەم زیان بە خۆیان و هەم زیان بە خەڵکی دیکەش دەگەیەنن. خۆ گەر بهاتایە، ئەو پرۆژەیان، بە زۆر بەگەڕبخستایە، خەڵکی گوندەکە، بە چاوی خۆیان،

قـازانجـەکـەیان بدیایە، ئەو کـاتە تێـدەگـەیشتن و ئەو پارە زۆرەش، بە خۆڕایـی نەدەڕۆی! بۆیە دەبێ، خەڵکە خـوێندەوار و ڕووناکبیرەکە، چی بە چاک دەزانن، ئەوە بڕیاربدەن و جێبەجێکەن.

بەڵێ، بە ڕووناکیی ڕۆیشتین و بە تاریکیی گەڕاینەوە. باوکم لەگەڵ « شێخ عەزیز »دا، سەردانێکی ماڵی باوکی مامۆستا « مام باپیر »یان کرد. من و مامـۆسـتـاش، لە ژوورەکەی خـۆیدا تێـهـەڵچووینەوە. لە کاژێری حـەوتی ئێـوارەوە دەسـتـمـانپـێـکردەوە، نزیکەی یازدە و چارەکی شـەو بـوو، بە سەرکەوتوویی، لە کارەکەمان بووینەوە. پاشان، مامۆستا شازدە نامیلکە و پەرتووکی خۆی پێشکەشکردم.

دوای ئەوەی، گفتوگۆکە تەواوبوو، شەوباشمـان لە یەکدی کرد و منیش، لەگـەڵ « سـەروەت »دا، بۆ مـاڵـی « لەیلا »ی ئامـۆزام گـەڕامـەوە. بەو درەنگانە، چاوەڕێیدەکردین. هەر زوو خێرا، میوەی بۆ هێناین و کەمێ، لە حەوشەکە دانیشتین. پاشان، کاتی خەوتن هات.

باوکم و « شێخ عەزیز »، لە ژوورەوە نووستبوون. جێی منیشیان، هەر لە ژوورەوە داخـسـتـبـوو. بەڵام، لە بەر باوکم نەمـوێرا، لە ژوورەوە بنووم. چونکە، زۆر مـاندووبـووم، دەمـویست، باش بنووم و کـەمێ بحـەوێـمـەوە. ئەویش، جگە لەوەی، کـەمێ دەپرخـێنێ، لە نیوەشـەویشـدا هـەڵدەستێ و خـەوی لێ ناکـەوێـتـەوە. لەبەرئەوە، من و « سـەروەت »، لە حـەوشـەکـە نووستین.

هەر چەندە، تا بڵێی، شـەوێکی خـۆش و فێنکبوو. بەڵام، حـەوشـەکـەیان دارهەنار و گژوگیایەکی زۆری تێدابوو، لەبەرئەوە، مێشـوولەیەکی زۆریان هەبوو، تا خـەو لە چاوم کـەوت، بە دەورووبـەرمدا هـەر گـیـزەیان دەهات، بۆ پارچـە گـۆشـتـێ دەگـەڕان، چزووی حـەزێکی نارەوای تێ چەقـێنن و بە خورووی بێنن. بۆیە، کارێکیـان پێ کردم، بە هیچ شێوەیە نەمدەوێرا، قاچ و دەسم، لە ژێر لێفەکەوە دەرخەم. تا درەنگانێ، وەک ئێشکچیی، لە سەر گازی پشت پاڵکەتبووم، تەماشای ئەو ئاسمانە ڕوون و بێ گەردەم دەکرد، کـە یـەزدانی مـەزن، بە پرۆژێـکتـەری مـانگی سـروشـتـیی و گـڵـۆپی ئەستێرەکان ڕازاندبوویەوە. بیرم لەوە دەکردەوە و لە دڵی خۆمدا دەمگوت: تۆ بڵێی، جارێکی دیکە، پەڵەهەوری چڵکنی دووکەڵی بۆمبی کیمیاویی و گـازی ژاراویی، بەری ئـاسـمـانە شین و بێ گـەردەکـەمـان، تاریک و ڕەشکەنەوە؟ تۆ بڵێی، ئەم ئازادیی و سەربەخۆییە، تا سەربێ، ئەم خەڵکە هەژارە بێ دەرەتانە، تا سـەر بە خـۆشیی و کامـەرانیی بژین، جـارێکی

دیکە، دەسی « بەعس » نەیانگاتێ، دوو چاری « ڕاکـردن، دەربەدەریی، گرتن، کوشـتنوبڕین، مـاڵوێرانیی و کاولکردن » ببنەوە؟!! تۆ بڵـێی، ئەم هەموو پارت و هێزە چەکدارانەی « کوردستـان »، وەک بـرا پێکەوە بژین، جارێکی دیکە، جەنگی چەپەڵی نێوخۆ، دووبارەبێتەوە؟!! تۆ بڵـێی، ژیان و ئارامیی، لەو خەڵکە ساکار، دڵسۆز و بە ئەمەکە تێکبدەنەوە؟!!

بە دەم ئەم ئەندێشـە و تێڕوانینانەوە بوو، لە نـاکاو خـەوم لێ کـەوت. بەڵام، زۆر کـەم نووستـم و زوو خـەبەرمـبۆوە. چونکە، مـەلا لە مـزگەوت، بـانگی بەیانیی دا، نـانەوخـانەکەی دراوسێیـان، پەرەمێـزەکـەی داگیرسـاند و لە ڕێگەکەی تەنیشـتیشیـانەوە، بەو بەیانییە زووە، دەنگی ترۆمـبێل دەهـات. بەڵێ، دەنگی مەلا، گرمـەی پەرەمێز و وڕەی ترۆمبێل، وەک سیمـفۆنیایەکی ناوخت و ناسـاز، تێکـەڵ بە یەکدی بوون و لە شـیرین خـەودا، خـەبەریان کـردمـەوە. بـاوکم و ئەوانیش، دەسـنوێژیانـگرت و بەرەو مـەڵبـەند ڕۆشتن. چونکە، برایانی « کۆمەڵ »، هەر لەوێ نوێژیاندەکرد!

ئیدی، چارم نەبوو، بەیانیی زوو هەستام. بەرچاییمـان خوارد و خۆمان کۆ کردەوە. ئینجا، هەڵمان قـوازتەوە و پیاسەیەکی باشمان، بە نێـو گوندەکەدا کرد. سـەرێکی مزگـەوتەکەمـان دا، لە سەر شێوەیەکی زۆر جوان و خاوێن دروستکرابۆوە. گوندەکە، خـەستەخـانە و خوێندنگەیەکی سـەرەتایی تێدا کرابۆوە. چەن دووکانێکی بچووک و نانەوخانەیەکیشی تێدا هەبوو.

« ئەحـمـاوا »، گـوندێکی خنجیـلانەیە، لە تەختـاییـدا دروستـکراوە و لە پشتەوە، چیای « گردە »، لەباوەشیگرتووە.

دواتریش، بەرەو هەواری مـامۆسـتـا ڕۆیشـتـین. لە مـیـوانخـانەکە دانیـشت بووین، لە دەوروبەری کـاژێری دەدا بـوو، ئەویش پەیدابوو. ئیـدی، هێندێ قسـەی دیکەمـان کرد. پـاشـان گـوتی: بـەیانیی، لە « سـولەیمانیی » و لە هۆڵی « ڕۆشنبـیریی جـەمـاوەر »، لە سـەر « مـافی مرۆڤ » کۆڕێکم هەیە، گەر کاتت هـەبوو، حەزدەکەم، بەشداربی.

منیش، بەڵێنم دایە، بچم. ئیدی، هـەر زوو، ترۆمبێلی بۆ دابینکردبووین، بە ڕێزێکی زۆرەوە، بە دڵێکی پاکەوە، بە ڕوویەکی خـۆشـەوە، تا بەر دەرگـەی ترۆمێلەکە، خۆی و برادەرەکانی لەگەڵمان هاتن. دەسی یەکدیمان گوشی، باوەشی برایانە و دۆستانەمان، بۆ یەکدی کردەوە و یەکدیمان ماچکرد.

پێش ئەوەی، مـاڵاوایی لێ بکـەم، پێم گـوت: ئـەم « کـوردسـتـان »ە، مـوڵکی هەموومـانە. پاراستنی ئەم ئەزموونە، لە ئەستۆی هـەموو لایەکمـان دایە. تکام وایە، لە چارەسـەرکـردنی گرفـتـەکانی نێوان خـۆتـاندا، پەنا بۆ چەک

مەبەن، هەر بەو شێوەیە، لە سەر ڕێبازی خۆتان بمێننەوە، با چی دیکە، خوێنی کورد بە دەستی کورد نەڕژێ، ئەم ئازادیی و سەربەخۆیییەشمان، لەکیس نەچێ.
بە زەردەخەنەیەکی شیرین و بە دڵێکی خاوێنەوە گوتی: هەر وا دەکەین! ئیدی، بەڕێیانکردین.
کاتێ گەڕاینەوە، زۆرم حەزدەکرد، سەردانێکی مزگەوتەکەی « خورماڵ » بکەم. چونکە، یەکێ لەو مزگەوتە کۆنانەیە، کە لە سەردەمی دەسەلاتی دەوڵەتی ئیسلامییدا دروستکراوە. منارەیەکی زۆر کۆنی هەیە، هەر چەندە، دەستی ڕۆژگار و هۆکارەکانی سروشت، کارێکی زۆریان تێکردووە و ڕووخساریان شێواندووە، پیربووە و لە کەشوفشی جوانیی سەردەمی لاوێتیی کەوتووە، لە هێندێ لاوە، ڕووخاوە و زۆری پێوە نەماوە. بەڵام، هەرچی چۆنێتیبێ، بەو پیریی و کەنەفتەکارییەش، هەر گەواهیی، بۆ سەردەمێکی مێژوویی، دەسەلاتی دەوڵەتی ئیسلام لەو ناوچەیەدا دەدا!
لە گەڕانەوەماندا، سەردانێکی شارۆچکەی « هەڵەبجە »ی شەهیدیشمان کرد. لە دوای ڕاپەڕینەوە، ئەوە یەکەمین جاربوو، بیبینم. زۆر دڵم خۆش بوو، بەو شێوەیە بینیم. چونکە، دیاربوو، لە ئاوەدانبوونەوە و گەشەکردنێکی بەردەوامدا بوو. ئەوەی پتر، دڵیشی خۆشکردم، ئەو پەرتووکخانە گشتییە بوو، کە هەمووی پێش چەن ڕۆژێ تەواوببوو و کرابۆوە. لە تەلارێکی زۆر جوان و نوێی ڕازاوەدا، دەرگەی بۆ خوێندەوارانی شارۆچکەکە ئاواڵەکردبوو. سەردانێکی کورتم کردن و کەمێ بە نێو بەشەکانیدا گەڕام. پاشان، چاوم بە بەڕێوەبەر و کارمەندانی پەرتووکخانەکە کەوت و هێندێ بەرهەمی خۆشم، بە دیاریی بۆ ناردن!
بەو شێوەیە، بە بەردێ چەن چۆلەکەیەکم کوشت. لە لایەکەوە، سەردانی مامۆستام کرد و کارێکی باشمان ئەنجامدا. لە لایەکەی دیکەشەوە، سەردانی گوندەکانی « ئەحماوا و زەڵم »، شارۆکەی « خورماڵ » و شارۆچکەی « هەڵەبجە »شمان کرد. گەر بڵێم، یەکێ لە ڕۆژە خۆشەکانی ژیانی تایبەتیی خۆم بوو، بە هیچ شێوەیە، لە ڕاستیی لام نەداوە!
بەڵام، سەیر ئەوەبوو، هەر لە « هەڵەبجە » دەرچووین، تا گەیشتینەوە شاری « سولەیمانیی »، نزیکەی، شەش بازگەمان تووشبوو. لە هەمووشیان دەبوایە، ڕابوەستاینایە، تەماشایانبکردینایە، لێیان بپرسینایە، بۆ کوێ دەچین؟ ئینجا، داوای ناسنامەمان لێ بکەن. بە گوێرەی ئارەزووی کاکی چەک لە شان، بە گیروگازمان بێنن و بیانوومان

پێ بگرن. له هەموو خاڵەکان، کاتێ، تەماشای نێو ترۆمبێلەکەیان دەکرد، داوای ناسنامەیان، له « شێخ عەزیز » دەکرد. چونکه، ڕیشی هەبوو، به مەرجێ، له هیچیشدا نییە! بۆ نموونە: کاتێ له « سەیید صادق » دەرچووین، له بازگەکه، چەکدارێکی « ئاسایش » هات و یەکسەر « شێخ عەزیز »ی دابەزاند، به بیانووی ئەوەوه، گوایه، ناسنامەکەی کۆپیکراوه و کۆنه. ویستیان، گلیبدەنەوه و ڕەوانەی بەڕێوەبەرێتیی « ئاسایش »ی بکەن. بەڵام، خوا هەڵ ناگرێ، کاتێ، خۆم پێناساندن و کەمێ قسەم لەگەڵ کردن، بەریاندا.
بەو شێوەیه، گەڕاینەوه. گەشتەکەمان بۆ « ئەحماوا »، پتر له بیستوچوار کاژێری خایاند. لەم گەشته کورتەدا، دەربارەی برادەرانی « کۆمەڵ »، ئەوەی پتر، سەرنجی ڕاکێشام، ئەوەبوو:
1. زۆربەی زۆری ئەندامانی « کۆمەڵ »، ناوه کوردییەکانی خۆیان گۆڕیوه، ناوێکی « عەرەبیی یا ئیسلامیی »یان بۆ خۆیان هەڵبژاردووه.
به ڕاستیی، هۆکەی هەر چییەک بێ، کارێکی زۆر خراپه. چونکه، بەرەبەره وای لێدێ، ناوی کوردیی، له نێو ئەو پارته ئیسلامییانەدا نامێنێ. جا، مەبەست لەو ناوگۆڕینه، هەرچییەک بێ، من به جۆرێ له جۆرەکانی « تەعریب »ی دادەنێم!
2. به زمانی کوردیی، « شەوباش و ڕۆژباش » له یەکدی ناکەن. بەڵکوو، هەر به « سەلاموعەلەیک » دەدوێن. تەنانەت، جارێ شەوباشم، له برایەکی پاسەوانی بەر دەرگەکەیان کرد، به « عەلەیکومەسەلام » وەلامیدامەوه!
3. نوێژ له مەڵبەندەکەیان دەکەن و هاتوچۆی مزگەوت ناکەن. لەوه دەچێ، باوەڕیان به مەلای مزگەوتەکانی « کوردستان » نەبێ!
4. جگه له ئەندامەکانی سەرکردایەتیی « کۆمەڵ »، هەموو ئەندامەکانی دیکەی خوارەوەیان، هەر وەک ئەندامانی پارته « ئیسلامیی »یەکانی دیکەی « کوردستان » بیردەکەنەوه. واته: ناکۆکیی و دووبەرەکییەکه، پتر له نێوان، ئەندامانی سەرکردایەتیی پارتەکاندا هەستیپێدەکرێ. بۆ نموونه: چەن ئەندامانی « ئەنصار ئەلئیسلام »، بۆ گرتنی « مەلا کرێکار » نیگەرانن، ئەندامانی هەموو لایەنەکانی دیکەش، هەر هێنده نیگەرانن و پێیان ناخۆشه!
5. هەموو ئەندامەکانیان، ڕیشیان هێشتۆتەوه. جا هەیانه، ڕیشێکی کورتی هەیه. هەشیانه، ڕێشێکی پان و درێژی بەرداوەتەوه. به ڕاستیی، من لەوه تێ ناگەم، بۆچی ئیسلامییەکان، بایەخێکی زۆر، به ڕیش

هێشتنەوە دەدەن؟!! تۆ بڵێی، ئایینی ئیسلام، ئەوەی پێویستبێ؟ تۆ بڵێی، ئایینی ئیسلام، وا لە مرۆ بکا؟!! باوەڕ ناکەم، چونکە، ئایینی ئیسلام، ئایینی جوانیی و خاوێنییە! بەڵام، ئەوە پتر، هەر کارتێکردنی ئایدۆلۆژیا و پەروەردەی پارتایەتییە، خەڵکی وا بەو شێوەیە دەگۆڕێ. ئەگینا، ڕیش هێشتنەوە، نیشانەی ئیسلامەتیی نییە. چونکە، وەک کورد لە مێژە گوتوویەتی: « بە ڕیش نییە، بە ئیشە !» جا، گەر کەسێ بیەوێ، کاری خراپە بکا، ئەرکەکانی ئیسلام بەجێ نەهێنێ و بێ گوێیی خوا بکا، ئەوا دەتوانی، لە بەر خەڵک، ڕیشێکی پان و پۆڕیش بهێڵێتەوە، بەڵام، هەرچی کاری خراپەش هەیە، بیکا!

بەڵێ، ئیسلامییەکان دەڵێن: ڕیشهێشتنەوە « سووننەت »ە. باشە، وا زانیمان، پەیامبەر و هاوەڵەکانی، ڕیشیانهێشتۆتەوە. ئەدی نابێ، بزانین، لەو سەردەمەدا، بۆچی ئەو کارەیانکردووە؟ یا، ئایا دوای پتر لە « 1400 » ساڵ، ئەو مۆدێلە، لای مسوڵمانەکان کۆن نەبووە؟ نابێ، شێوازی ژیانی خۆیان بگۆڕن و باری سەردەمەکە ڕەچاوکەن؟ خۆ مرۆ بەرد نییە، بیر نەکاتەوە و تا ماوە، هەر لە شوێنی خۆی نەجوڵێ! چونکە، ژیان بە شێوەیەکی بەردەوام، لە گۆڕان دایە. ژیان و مردن، هەر دووکیان هەر خوا دایناون. خوای پەروەردگاریش، ئەم گەردوونەی بۆیە بۆ ڕازاندووینەتەوە، تا چێژی لێ ببینین، ژیانێکی خۆش بەسەربەرین. وەک پەیامبەری ئیسلامییش فەرموویەتی: « اعمل لدنیاک، کانک تعیش ابدا و اعمل لاخرک کانک تموت غدا. » یا فەرموویەتی: « خیر الامور اوسطها » کوردیش لە مێژە گوتوویەتی: « نە شیش بسووتێ و نە کەباب. »

هەر بە ڕاستیی، کاتێ، بە نێو « خورماڵ »دا تێپەڕیم، کاتێ، تەماشای ئەندامانی پارتە ئیسلامییەکانی « کوردستان »م دەکرد، هەموو ڕیشیان بەردابۆوە، وەک ئەوەی، یەکێ لە مەرجەکانی ئەندامبوون لەو پارتانەدا، ڕیشهێشتنەوە بێ! بیرم لەوە دەکردەوە و لە دڵی خۆمدا دەمگوت: ئەمانە، ئێستە ئەو دەسەڵاتە کەمەیان هەیە، ژمارەیان زۆر نییە، ئەندامەکانی خۆیان، بەو شێوەیە گۆشکردووە، خۆ گەر لە پاشەڕۆژدا، دەسەڵاتێکی تەواو و ڕەهایان هەبێ، ژمارەیان زۆربێ، دەوڵەتێکی ئیسلامیی، لە « کوردستان » دامەزرێنن، ئیدی، زۆربەی زۆری خەڵک، چ بە خواییشتی خۆیان و چ لە ترسان بێ، ڕیش بەردەدەنەوە، وای لێدێ، « کوردستان » بە ڕیش بناسرێ، گوێزانیش لە هیچ دووکانێکی « کوردستان » نەفرۆشرێ و کارگەی دروستکردنەکانیشی لەگەڵ « کوردستان » پێوەندییان نەمێنێ!

6. دەرکەوتەی لەچکیش، هەر بە هەمان شێوە، زۆر بڵاوە و سەرکردەی پارتە ئیسلامییەکان، پتر پێی لە سەر دادەگرن. تەنانەت، مامۆستا لە چاوپێکەوتنەکەدا گوتوویەتی: (ئێمە نایەڵین، شتی بێ بەندوباریی بکرێ. نایەڵین، شتی نا« شەرعیی » بکرێ. ژن بێ بۆ بازاڕ دەبێ، پۆشاکی ئیسلامیی لەبەرکا.)

هەروەها، « مەلا کرێکار »یش، لە گوتارێکی نوێژی ڕۆژی « هەینیی »دا، جەختی لە سەر ئەوە کردووە و گوتوویەتی: ( نابێت، قبووڵبکرێت، ڕێگەی ڕیشهێشتنەوە، ڕێگەی سەرپۆش خستنە سەری ئافرەتان بگیرێت. ئەوە ڕێگەی دینداریی گرتنە.).

هەڵبەتە، ئەو پارتە ئیسلامیی و سەرکردانە، وا دەزانن، ئەوەی لەچکی بە سەرەوە بوو، ئیدی، کاری خراپە ناکا! هەر بۆ نموونە دەڵێم: جگە لە دزییکردن و پیاوکوشتن، ئێستە، لە هەموو کاتێ پتر و خراپتر، تلیاککێشان، خواردنەوە و لەشفرۆشتن زیادیکردووە. با ڕوونتر بڵێیم: لە سەر جادە و شەقامەکانی زۆربەی دەوڵەتە ئیسلامییەکان، لە سەروو هەمووشیانەوە « ئێران » دێ، بە سەدان کچۆڵەی منالی تەمەن پازدە و شازدە ساڵ و ژنی سۆزانیی وەستاون، چاوەڕێی پیاو دەکەن، تا، لەشی خۆیانیان پێ بفرۆشن، کاری خراپەکارییان لەگەڵدا بکەن و چەن هەزار تمەنێ پەیداکەن. ئەوەشی پەیدایدەکەن، بەشی خواردنەوە و تلیاککێشانەکەیان ناکا! بە ڕاستیی، ئەو جۆرە بیرکردنەوە و زۆرلێکردنە، هەرگیز، چارەسەری هیچ جۆرە گرفتێکی کۆمەلایەتیی نەکردووە و ناشیکا! هۆکەشی، بە زۆریی، بۆ نەشارەزایی و نەزانین لە کاری « ڕامیاریی، ئابووریی، کۆمەلایەتیی و بەڕێوەبردنی دەوڵەت »دا دەگەڕێتەوە. بۆیە، بێ کاریی، هەژاریی، دواکەوتوویی و نەخۆشیی سێکس، بە شێوەیەکی زۆر فراوان بڵاوبۆتەوە. دەتوانم، بڵێم: لە « 80 - 85٪ » گەلانی « ئێران » هەژارن و ژیانێکی کولەمەرگیی بەسەردەبەن!

7. ئەندامانی ئەو ڕێکخراوە، ڕێزێکی زۆریان لە یەکدی دەگرت و هەر بە برا یەکدیان بانگدەکرد!

بۆ ڕۆژی دوایی « 10.07 »، کاژێری چواری ئێوارە، ئامادەی کۆڕەکەی مامۆستا بووم. خەڵکێکی زۆر هاتبوون، هۆڵەکە، کەسی دیکەی نەدەگرت. تەنانەت، لەم بەر و ئەو بەر و لە بەردەمی مامۆستاشدا، خەڵک لە سەر زەوی دانیشتبوون. هەر چەندە، دەربارەی دید و بۆچوونەکانی مامۆستا،

هێندێ باری سەرنجی تایبەتیی خۆم هەبوو، بەڵام، بە شێوەیەکی گشتیی، بابەتێکی باشی پێشکەشکرد. پاشان، دەمەتەقێیەکی کەمی لە سەر کرا و کۆڕەکە تەواوبوو.
لەوێش، جارێکی دیکە یەکدیمان بینییەوە و گوتی: کاک « تۆفیق کەریم » دەیەوێ، بتبینێ و چاوپێکەوتنێکت لەگەڵدا سازکا. لەبەرئەوە، با پێکەوە، سەرێ لە مەڵبەندی « پەلیتبیرۆ » بدەین و لەوێ، لەگەڵ ئەو برایانەشدا، یەکدی بناسن. ئیدی، پێکەوە سواربووین و بەرەو « هەوارەبەرزە »، بە ڕێ کەوتین. لە مەڵبەند، چاوم بە ئەندامی دەستەی کارگێری پەلیتبیرۆ ماموستا « ناظم عەبدوڵلا » و کاک « موحەممەد سەنگاویی » کەوت. ماوەیە دانیشتین و هێندێ دەمەتەقێمانکرد. بەڵێنمدانێ، هێندێ لە بەرهەمەکانی خۆمیان بۆ بنێرم. بەڵام، بە داخەوە نەمتوانی، بەڵێنەکەم جێبەجێکەم. چونکە، زۆر سەرم قاڵبوو و ماوەم نەبوو، سەردانیانبکەمەوە و هەر دوو ڕۆژ دوای ئەوەش گەڕامەوە. ئینجا، بانگی ئێوارەی دا، ئەوان چوون بۆ نوێژ و منیش لەگەڵ برادەرێکی دیکەدا مامەوە.
پاشان، ماموستا هاتەوە و گوتی: وا دیارە، کاک « تۆفیق » نەهاتۆتەوە. بەڵام، حەزدەکەم، ئەم ئێوارەیەش هەر پێکەوە بین. ئیدی، هەموو پێکەوە ڕۆشتین و لە ماڵی « حاجی عوسمان » ناوێ دابەزین.
ئەو ئێوارەیە، دەتگوت، ئەو ماڵە « مەولودی پەیامبەر »یان کردووە، بە مەنجەڵی گەورە، برنج و شلە و گۆشتێکی زۆریان لێنابوو. برادەرانیش، هێندە زۆربوون، لە سێ ژوور جێیان بۆوە و نانیانخوارد. دوای نانخواردن، ماموستا، منی پێشکەش بە ئامادەبووانی داوەتەکە کرد، زۆر بە شانوبازوویدا هەڵدام، بە ڕاستیی، شەرم دایگرتم و هیچم بۆ نەگوترا!
ئینجا، دەربارەی ئەم چاوپێکەوتنەش، لێرەدا دەمەوێ، هێندێ شت، بۆ خوێنەوارانی هێژا ڕوونکەمەوە.
1. وەک دابونەریتێکی تایبەتیی خۆم، لە چاوپێکەوتندا پێڕەومکردووە، بڕیارمدا، کۆمێنتار لە سەر دید و بۆچوونەکانی ماموستا نەدەم. بەڵکوو، ئەو کارە بۆ کاتێکی دیکە هەڵگرم، هەر وەک چۆن، لەو دوو چاوپێکەوتنەی ساڵانی « 1995 و 1997 »، لەگەڵ ماموستایان « برایم ئەحمەد و جەرجیس فەتحوڵلا »دا کردم.
2. حەزم نەکرد، هێندێ لە زاراوە ئیسلامییەکان، بۆ کوردیی وەرگێرم. چونکە، لەوانەیە وەرگێرانەکەیان، پڕ بە پێستی خۆیان نەبن و واتای تەواو بە دەسەوە نەدەن. جگە لەوەی، کۆمەڵانی خەڵکیش باشتر لێیان تێدەگەن!

3. هیچ پرسیار و بابەتێ نییە، پێوەندییان بە یەکدییەوە نەبێ. واتە: هیچ پرسیارێ، هەر وا بە خۆڕایی و بە هەڕەمەکیی نەکراوە. بەڵکوو، هێندێ پرسیارمکردووە، لە لایەکەوە، پتر مەبەستم ئەوەبووە، وەک ڕووداوێکی مێژوویی تۆمارکرێ و بیر نەچێتەوە! لە لایەکی دیکەشەوە، وەک دەسپێشخەریی و ڕوونکردنەوەیەک وابووە، تا پرسیاری دیکەی بە دوادا بێ، بابەتەکەش، پتر تام و چێژ وەرگرێ!
4. ویستم، هەموو دەقەکە، بە یەک ڕێنووسی یەکگرتووی کوردیی بنووسمەوە، وەک لە نووسینەکانی پێشوومدا پێڕەومکردووە. بەڵام، لێرەدا نەمتوانی، ئەوە بکەم. چونکە، « ئایەت » و فەرموودەیەکی زۆری پەیامبەر و هاوەڵەکانی تێدابوو، نەدەکرا، هەر هەموویان، بە ڕێنووسی « کوردیی » بنووسمەوە. لەبەرئەوە، ئەوانەم بە ڕێنووسی « عەرەبیی » تۆمارکرد!
5. چاوپێکەوتنەکە، ماوەی« 5. 48 » پێنج کاژێر و چلوهەشت خولەکی خایاندووە. هەم بە کامێرای ڤیدیۆ گیراوە و هەم بە ریکۆردەریش، لە سەر شەش کاسێتی شەست خولەکیی تۆمارکراوە.
6. لە ڕاستییدا، ماوەی چاوپێکەوتنەکە، هێندە درێژبوو، وتووێژەکە هێندە زۆربوو، هێندێ شتم بیرچووبوو، لە کاتی خۆیدا، لە مامۆستای بپرسم. لەبەرئەوە، ناچاربووم، لە « سولەیمانیی» یەوە، نامەی بۆ بنووسم و لێی بپرسم، تا لە هەموو ڕوویەکەوە، وەک کارێکی ژۆرنالیستیی مەزن، چاوپێکەوتنەکە تەواوبێ و کەموکوڕیی تێدا نەبێ. مامۆستاش، زۆر بە دڵێکی فراوانەوە، وەڵامیدامەوە. ئەو پرسیار و وەڵامانەشم، بەپێی زنجیرەی باسەکان، لەگەڵ پرسیار و وەڵامەکانی دیکەدا، تێهەڵکێش کردووە و ئاماژەشم پێ کردوون.
7. هەموو ئەو وەڵامانەی مامۆستا، دید و بۆچوونی تایبەتیی خۆین. مەرج نییە، دید و بۆچوونی منیش، بەرانبەر زۆربەی کێشە و باسەکان، لەگەڵ دید و بۆچوونەکانی ئەودا یەکبگرنەوە. چونکە، هێندەی لە نزیکەوە لێی تێگەیشتم و بۆچوونەکانیم هەڵسەنگاند، بۆم دەرکەوت، لە دوو سەرچاوەی جیاوازەوە، بیروباوەڕی ڕامیاریی خۆمان هەڵدەهێنجین!
8. دەمەتەقێکەی نێوانمان، زۆر بە ڕاشکاویی و ئازادانە بەڕێوەچوو.
9. لە کۆتایی چاوپێکەوتنەکەشدا، لە سەر ئەم خاڵانەی خوارەوە، لەگەڵ مامۆستادا ڕێککەوتین:
ـــ تا من چاوپێکەوتنەکە، پاکنووس نەکەم، بە نووسین بڵاوی نەکەمەوە، ئەوان، بە هیچ شێوەیە، بڵاوی نەکەنەوە.

ــ هەموو ئەو ووشە عەرەبییانەی، من و مامۆستا، لە کاتی پرسیارکردن و وەڵامدانەوەدا بەکارمانهێناون، هەموویان بکەم بە کوردیی.
ـ ئەو ووشە و ڕستانەی دووبارەبوونەتەوە، هەموویان بقرتێنم.
ـ سەرجەمی چاوپێکەوتنەکە، بە کوردییەکی پەتیی و ڕەوان دابڕێژمەوە.
ــ ئەوان هەموو کاسێتەکانم بۆ بنووسنەوە، « ئایەت »ەکانم بۆ دیارییکەن و ژمارەکانیان تۆمارکەن. هەر چەندە، کاک « بیلال قەڵادزێیی »، بەڵێنی دابوو، ئەو کارە لە ئەستۆی خۆی بگرێ. بەڵام، دوای نۆ ڕۆژ، نزیکەی دوو کاسێتی بۆ تەواوکردم، هەمووشی، لە چل لاپەڕەدا، بە شێوەیەکی زۆر جوان و ڕوون نووسیبۆوە. هەرچی چۆنێبێ، زۆر سوپاسی ئەو کارەی دەکەم. لەبەرئەوە، ناچاربووم، خۆم ئەو کارە جێبەجێکەم. بەڵام، بۆم نەکرا، ژمارەی « ئایەت »ەکان تۆمارکەم.
ــ گەر مامۆستا، دوای بڵاوکردنەوەی بابەتەکە، هەر تێبینییەکی، لە سەر ناوەڕۆکی چاوپێکەوتنەکە هەبوو، ئەوا، دەقی چاوپێکەوتنەکەی، هەم بە کاسێتی ڕێکۆردەر و هەم بە ڤیدیۆ لایە، دەتوانێ، نارەزایی خۆی دەبڕێ و لە سەری بە دەنگبێ!
ئەم شتانەشمان، لە کۆتایی کاسێتی شەشەمدا، هەمووی تۆمارکردووە.
تا، هێندێ کەسی بێ ویژدان، دوایی نەڵێن: مامۆستا ئەو قسانەی نەکردووە. یا، ئەو زمانە هی ئەو نییە. وەک دوکتۆر « عیززەدین مستەفا ڕەسووڵ »، بۆ چاوپێکەوتنەکەی مامۆستا « برایم ئەحمەد » گوتبووی!
لێرەدا دەبێ، ئەوەش بڵێم: لەوانەیە، هێندێ کەس ئەو پرسیارەم لێ بکەن و بڵێن: تۆ چۆن، چاوپێکەوتن لەگەڵ کەسێکی وەک مامۆستا « عەلی باپیر »دا دەکەی، وەک برادەرێکی زۆر نزیک و خۆشەویستم، هەمان تێبینیی بە گوێدا دام؟
منیش، لە وەڵامدا گوتم: بۆ؟
گوتی: تۆ نووسەرێکی ناسراو و کادێرێکی ئەکادیمییت، خۆشت بە نەتەوەیی دەزانی، بیر و باوەڕەکەشت، لەگەڵ بیروباوەڕەکەی ئەودا یەک ناگرنەوە. جگە لەوەی، کاتی خۆی، چاوپێکەوتن لەگەڵ یەکێکی وەک مامۆستا « برایم ئەحمەد »دا کردووە، ڕامیارێکی ناسراو و بەناوبانگ بووە. هەروەها، چاوپێکەوتن لەگەڵ « جەرجیس فەتحوڵڵا »دا سازکردووە، ئەویش، هەر وەک نووسەرێکی گەورە ناسراوە. دوای ئەو دوو چاوپێکەوتنە سەرکەوتووە، چۆن دەچی، چاوپێکەوتن لەگەڵ مەلایەکی موسوڵمان و سەرکردەی پارتێکی ئیسلامییدا دەکەی؟!!

گوتم: لای من، ئەو شتانە هیچ گرنگ نین. هێندەی دەمەوێ، ڕاستیی بۆ ڕۆڵەکانی گەلەکەم ڕوونکەمەوە، هێندە، بە تەنگ ئەو جۆرە دید و بۆچوونانەوە نیم.

ڕاستە، خۆم بە کوردێکی ناسیۆنالیستی دیمۆکراسیخواز دەزانم و شانازیشی پێوە دەکەم. باوەڕێکی تەواویشم، بە « سیکولاریزم » هەیە. لە هەمان کاتیشدا، شانازیی بە موسوڵمانێتی خۆمەوە دەکەم. بەڵام، ئەز پێم وایە، لە نێوان خۆم و خوادا، پێویستم بە هیچ کەس و لایەنێکی ڕامیاریی نییە. هەروەها، لە نێوان خۆم و خەڵکیشدا، نە کەس لە خۆم بە گەورەتر دەزانم، نە خۆشم لە کەس بە پچووکتر دادەنێم. چونکە، خەڵک بە « دڵفراوانیی، سەرڕاستیی، پاکیی، ڕەوشتبەرزیی، خەسڵەتی چاک، زیرەکیی، ڕووناکبیریی و هەڵوێست »، لە یەکدی جیادەکرێنەوە و بەو شتانەی دیکە، لە یەکدی جیا ناکرێتەوە!

پێش ئەوەی، چاوپێکەوتنیش لەگەڵ مامۆستادا بکەم، خۆم وەک کوردێکی نیشتمانپەروەر، نووسەرێکی نەترس و ڕاسگۆ هەر هەبووم، بەو چاوپێکەوتنەش، نە بەرزدەبمەوە و نە پلەوپایەی کۆمەڵایەتیی و وێژەییشم، لای ڕۆڵەکانی گەلەکەم نزمدەبێتەوە!

جگە لە ئەمانەش، هەموو دیاردەیەکی سروشتیی، هەموو دەرکەوتەیەکی « مێژوویی، نەتەوەیی، ڕامیاریی، کۆمەڵایەتیی ... » لە کۆمەڵگەی کوردەوارییدا، پێویستیان بەوە هەیە، بایەخی تایبەتییان پێ بدرێ و لێیان بکۆڵرێتەوە. ئەوڕۆش، « ئیسلامیی ڕامیاریی »، لە کۆمەڵی کوردەوارییدا هەیە و بە یەکێ لەو دیاردە گرنگ و هاوچەرخانە دادەنرێ، دەبێ، بایەخێکی تایبەتیی پێ بدرێ و زۆر بە وردیی لێی بکۆڵرێتەوە!

هەروەها، لەوانەیە، ئەم چاوپێکەوتنە، یەکەمین هەوڵدانێکی مەردانە و دڵسۆزانەش بێ، لە لایەکەوە، ئەو دیوارە بەرزە ئەستوورەی، لە نێوان هێزە ئیسلامیی و « سیکولار »ەکاندا هەڵچنراوە، بیڕوخێنێ. لە لایەکی دیکەشەوە، هەم بۆ ئەوەی، لە نزیکەوە، لە هەموو گرفتە سەرەکیی و ڕاستەقینەکانی « ئیسلامی ڕامیاریی » و پێوەندییەکانیان بە لایەنەکانی دیکەی، هێزە « سیکولار »ەکانی « کوردستان »ەوە بگەین. هەم هێندێ سەرەداوی پێوەندیی « نەتەوەیی، ڕامیاریی، کۆمەڵایەتیی، ئابووریی، ئایینیی، کەلتووریی، هونەریی، وێژەیی، ئەکادێمیایی و دیپلۆماسیی » پێکەوە ببەستینەوە، لە ڕوانگەی « ئیسلامی ڕامیاریی » و جوڵانەوەی پارتایەتییەوە، بە کۆمەڵگەی کوردەوارییانەوەی گرێدەین.

ئەز لەو باوەڕەشدام، مامۆستا، وەک مەلایەکی موسوڵمان، وەک ڕێبەری پارتێکی ئیسلامیی « کوردستانیی »، ئاستێکی ڕووناکبیریی باشی هەیە. شارەزاییەکی زۆریشی، لە زۆربەی بابەتەکانی « مێژوو، کۆمەڵایەتیی، ڕامیاریی، فەلسەفە و زانست »دا هەیە و خۆی ماندووکردووە. بەڵام، بیرەوەریی کەمێ لاوازە!

دوور نییە، گەر بمەوێ، مامۆستا، لەگەڵ سەرکردەی پارتە ڕامیارییە ئیسلامییەکانی دیکەی « کوردستان »دا بەراوردیکەم، زۆر بە ڕاشکاویی بڵێم: لە ڕووی « نەتەوەیی »یەوە بەپەرۆشتر، لە ڕووی « ڕامیاریی »یەوە شارەزاتر، لە ڕووی « کەلتووریی »یەوە ڕووناکبیرتر، لە ڕووی « پێوەندیی کۆمەڵایەتیی »یشەوە، کراوەتربێ.

لەبەرئەوە، هیوایەکی زۆر گەورەی لێ دەکرێ، لە نێو گرووپە ئیسلامییەکانی « کوردستان »دا، بە تەواویی، جێ پێی خۆی بکاتەوە. لە نێو ئیسلامییەکانی نێوچەکە و جیهانیشدا، پتر بناسرێ و دەرکەوێ. هەر لەو ڕێیەشەوە بتوانێ، کێشەی کورد، بە موسوڵمانەکانی جیهان بناسێنێ، دۆست و برای پتر، بۆ نەتەوە چەوساوە بندەستەکەی خۆی پەیداکا. وا بزانم، ئەم بۆچوونەشم، لە جێی خۆێ دایە، چونکە:

1. تەمەنی زۆر نییە و بۆ ئەو کارە، هێشتا زۆری بە بەرەوە ماوە.
2. بە شێوەیەکی بەردەوام، خۆی بە خوێندنەوە و نووسینەوە خەریکردووە.
3. پێوەندییەکی باشی، لەگەڵ هەموو لایەنە ڕامیاریی و ئیسلامییەکانی « کوردستان » و « عێراق »دا هەیە.

بۆیە، هیوادارم، لە جێی ئەو هیوا بەرزەدا بێ، لە ڕێی ئایینی پیرۆزی ئیسلامەوە، ڕاژەی نەتەوە هەژارەکەی خۆی بکا، لە ڕێی کوردیشەوە، کەڵک بە ئایینی ئیسلام بگەیەنێ!

پێشم وایە، گەر « کۆمەڵی ئیسلامیی »، ئەم جۆرە تێڕوانینە پێڕەوکا، خۆی بە مافەکانی نەتەوەی کوردەوە ببەستێتەوە و لە سەر ڕێبازی خۆی بەردەوامبێ، خواپەرستیی ڕاستەقینە و کوردایەتیی تێکەڵاوکا، ئومێد دەکرێ، لە لایەکەوە، لەنێو لایەنە ئیسلامییەکانی دیکەی « کوردستان »دا پتر گەشەبکەن. لە لایەکی دیکەشەوە، پێوەندییان لەگەڵ لایەنە نیشتمانپەروەرەکانی « کوردستان »دا باشتربێ.

لە کۆتاییشدا، هەر ئەوە ماوە بڵێم: ئەم پێشەکییەم نەنووسیی، تا بە تەواویی، گوێم لە هەموو کاسێتەکان گرت و شازدە بەرهەمەکەی مامۆستاشم خوێندەوە. بۆ ئەوەی، لە هەموو بۆچوونەکانی شارەزابم.

هیوادارم، بەم چاوپێکەوتنەش توانیبێتم، ئەو دیوارە ئەستوورەی، لە نێوان هێزە ئیسلامیی و « سیکولار »ەکاندا هەیە، گەر بە تەواویی، نەمرووخاندبێ، کەلێنێکم تێ کردبێ! ئەمەش، یەکەمین هەنگاوێ بێ، دەرگەی دەمەتەقێیەکی دیمۆکراسیی و ڕەوابێژانە، لە بەردەم هەموو هێزە « کوردستانیی »یەکاندا بکاتەوە، بۆ ئەوەی، هەموو لایەکمان، هەنگاوێ لە ڕاستیی و ڕیالیزم نزیککەوینەوە و هەرگیز لێی لا نەدین، تەنیا هەر، لە ئاستی ڕاستیی و ڕەواشدا، بەچۆکدابێین!

دوا جاریش دەڵێم: گەر توانیبێتم، ڕاژەیەکی پچکۆلانەی زمانی کوردیی و نەتەوەکەم کردبێ، لە ڕاستە شەقامی ڕاستیی و شارێی ڕەوا لام نەدابێ، خۆم زۆر بە بەختیار دەزانم، لە منیش نووسین و لە ئێوەی هێژاش هەڵسەنگاندن!

دوکتۆر حوسێن محەممەد عەزیز
ستۆکهۆلم
2003. 01. 11

پ1 : پێشەکیی دەمەوێ، بزانم، « عەلی باپیر » کێیە؟
و1 : بسم الله الرحمن الرحیم، الحمد لله و الصلاه و السلام علی رسول الله محمد و اله و صحبه و من اهتدی بهداه.
بەڕێز کاک دوکتۆر « حوسێن محەمەد عەزیز » ! سەرەتا، بەخێرهاتنێکی زۆر گەرمت دەکەم. بە هاتن و دیداریشت خۆشحاڵم. دیارە، من لە نزیکەوە، بە وردیی بەڕێزت ناناسم. بەڵام، چەن پەرتووک و بەرهەمێکی تۆم خوێندۆتەوە، سەرڕاستیی، خاوەنی قسەی خۆبوون و باوەڕم تێدا خوێندوونەتەوە. بۆیە، بە دیداری بەڕێزت خۆشحاڵبووم.
بەندە « عەلی باپیر وەتمان »، ناوی خۆم، باوکم و باپیرمە. لە هاوینی مانگی « یول »ی ساڵی « 1961 ز. »، لە گوندێکی سەر بە شارۆکەی « سەنگەسەر » و شارۆچکەی « قەڵادزێ » لەدایکبووم. لە بنەڕەتدا، خەڵکی نێوچەی « پشدەر »ین. باوکم « میراودەلیی »یە. بەڵام، دایکم « مەنگووڕیی »یە. دیارە، لە رووی هۆزەوە « میراودەلیی »م. ئەم هۆزە، لە نۆ تیرە پێکهاتووە. ئێمە، لە تیرەی « ئەحمەد ئاغا »ین. ئەوە کورتەیەکی ڕەچەڵەکم بوو، گەر وردەکاریی و بە درێژیی، شتی دیکەشت ویست، دەتوانم، بۆت باسکەم.
ــ ئەدی خوێندن، چیتان تەواوکردووە؟
وا پێدەچێ، لە ساڵی « 1966 - 1967 »دا، پۆلی یەکی سەرەتاییم، لە قوتابخانەی « سەنگەسەر » خوێندبێ. پاشان، ماڵمان گواستۆتەوە، لە نێوچەی « بیتوێن » نیشتەجێبووین. ئینجا، لە پۆلی دووەوە، تا شەشی سەرەتاییم، لە « رانیێ » تەواوکردووە. پۆلی یەکی نێوەندییشم، هەر لە شارۆچکەی « رانیێ » تەواوکردووە و لە پەیمانگەی ئیسلامیی بووم.
ــ ئەوە ساڵی چەن بوو؟
ساڵی « 1974 - 1975 » بوو.
دوای ئەوەی، پۆلی یەکم تەواوکرد، لە دووی نێوەندیی بووم، ئەو کاتە، ساڵی « 1975 - 1976 »، شۆڕشی « 11/ سێپتێمبەر/1961 » تێکچوو بوو، ئەو ساڵە، بۆم نەخوێنرا. واتە: دوای ئەوەی، شۆڕش هەرەسیهێنا، خوێندنی پۆلی دووی نێوەندیم، لە شاری « سولەیمانیی » دەسپێکردەوە، تا پۆلی شەشی ئامادەیی، هەر لەوێ و لە پەیمانگەی « ئیسلامیی » بووم. ساڵی « 1979 - 1980 »، لە شاری « نەجەف »، لە کۆلێژی « شەریعە و

زانستە ئیسلامیی »یەکان، یەکەمین ساڵی خوێندنم تەواوکرد. بۆ ساڵی دووەم ویستم، درێژە بە خوێندنەکەم بدەم، بەڵام، لەبەرئەوەی، نەبـــووم بە « بەعسیی » و لە مەشقی « لەشکری میللیی »دا، بەشداریيم نەکرد، نەمتوانی، بەردەوامبم.
هەڵبەتە، یەکەمین ساڵیش، چەن جارێ، هەر ویستیان بمگرن. چونکە، گەلێ نیشانەی پرسیارم، لە سەر پەیدابووبوو. لە چەن ڕێیەکەوە، هەواڵیان پێ گەیاندم، کە دەیانەوێ، بمگرن. ساڵی ئایندە ویستم، بچمەوە، لە قۆناغی دووەمی خوێندنی کۆلێژ بەردەوامبم، پێیان ڕاگەیاندم، گەر بە زووترین کات نەڕۆی، گیراوی. ئەوەبوو، لەو کاتەوە تا ئێستە، لە ڕژێمی « بەعس » قاچاغم!
پاشان، هاتمەوە بۆ « ڕانیێ ». « موختار »ی شارۆچکەی « ڕانیێ »، دۆستمانبوو، پیاوێکی باشبوو. هەر زوو، هەواڵیدامێ و گوتی: فڵان کەس! « بەڕێوەبەرایەتی ئاسایش » ڕایانسپاردووم، ماڵی ئێوەیان پیشاندەم، بۆ ئەوەی بتگرن. هەرچی چۆنێبێ، خۆت دەربازکە. ئیدی، لەو کاتەوە، چووم بۆ « کوردستان »ی ئەو دیو « ڕۆژهەڵاتی کوردستان ــ ح ». واتە: وازم لە خوێندنەکەم هێنا. تەنانەت، پۆلی دووی کۆلێژیشم تەواو نەکرد.
دوایی، ساڵێ لە « ئێران » مامەوە. شەش مانگ لە « کوردستان » و شەش مانگیش لە « تاران » بووم. زمانی « فارسیی » فێربووم و ویستم، لە ئەوێ زانکۆ تەواوکەم. ئەوەبوو، وەر نەگیرام و گەڕامەوە. ئەو کاتە، یاسایەک لە « عێراق » دەرچووبوو، دەیگوت: هەر کەسێ، بە « ئینتیداب » دامەزرێ، بڕوانامە یا مۆڵەتی « زانستی مەلایەتیی » هەبێ، دەتوانێ، لەجیاتی ڕاژەکردنی سەربازیی، بە « مەلا » دامەزرێ. ئەوەبوو، ساڵی « 1983 »، لە « هەولێر »، تاقیکردنەوەیەکی « مەلایەتیی »م دا. ئەوەی لە یادم مابێ، بە یەکەم دەرچووم و مۆڵەتی « مەلایەتیی »یان دامێ، لەبری ڕاژەی سەربازیی، بە « ئینتیداب » دامەزرام. دیارە، من سەربازییم نەکردووە.
ــ بەڵێ. ئەدی دوایی؟
دوایی، لە شارۆچکەی « ڕانیێ » و لە مزگەوتی « نەورەسیی »، یەک دوو ساڵێ مامەوە و بە « مەلا » دامەزرام. پاشان، دووبارە میریی، لێی هەڵپێچامەوە. منیش، ماڵەکەم لە « ڕانیێ »وە بۆ گوندی « سەرسیان » گواستەوە. گوندێکە لە بەری « مەرگە » هەڵکەوتووە.

واتە: خوێندنی فەرمیم، تا ئەو ئەندازەیە خوێندووە، کە باسمکرد. بەڵام، کاتێ لە کوردستانی « ئێران » بووم، لە ئەوێش، هەر درێژەم بە خوێندن داوە. خوێندنی « شەرعیی، زانستە شەرعیی »یەکان و زمانی « فارسیی » فێربووم. ئەمەش، هەر خۆم هەوڵمداوە و خۆم فێرکردووە، ئەگینا، تەنیا هەر هێندەم خوێندووە.

پ2 : لە کەیەوە، دەست بە خوێندنەوە کردووە؟
و2 : دەتوانم، بڵێم: لە پۆلی یەکی سەرەتاییەوە دەسمپێکردووە. لە یادمە، مامۆستایەکمان هەبوو، لام وابێ، ناوی « جەمال » بوو، گەر ناوەکەیم لە بیر نەکردبێ! لە قوتابخانەی « سەنگەسەر »ی سەرەتایی بووم، نامیلکەیەکی بۆ هێناین، تازە دەرچووبوو، ناوی « شێری ساختە » بوو. ئێستەش، چەن دێڕە هۆنراوەیەکیم هەر لە بیرماوە:
منداڵینە! وەرن ڕاکەن ئەم دیمەنە، تەماشاکەن
گوێدرێژێکی ڕقهەڵساوە لە تاو ئازار ورووژاوە
باسی بەسەرهاتی ئەوەی دەکرد، پێم وایە، پلارهاویشتن بوو، لە سەر کێشەی ئەو کاتەی، کە پێیان دەگوت « جەلالیی و مەلایی ». چونکە، ساڵی « 1966 - 1967 » و ئەو دەورووبەرەبوو. توانجی لە « مام جەلال » و ئەوان دەگرت. گوایە: ڕۆژێ، گوێدرێژێ، کەوڵەشێرێ دەدۆزێتەوە. کەوڵەکە، بە خۆیدا دەدا و خۆی لێ دەبێ بە شێر. پاشان دەڵێ: بۆ نەچمە نێو شار و خەڵک بترسێنم! چەن جار، ئەوان منیان ئازارداوە و منداڵان شوێنم کەوتوون؟!! دەچێتە نێو شار و دوایی دەڵێ: بۆ تۆزێکیش نەنەڕێنم، تا پتر بیانتۆقێنم؟ هەڵبەتە، کاتێ دەیەوێ، بنەڕێنێ، دەنگەکەی، دەنگی گوێدرێژ دەبێ، فێڵەکەی ئاشکرادەبێ، منداڵەوردکە دوای دەکەون و کەوڵەکەشی لێ دەکەنەوە. ئەوە کورتەی ئەو نامیلکەیە بوو. واتە: لەو نامیلکەیەوە، دەسم بە خوێندنەوە کردووە و ئێستەش، ئەو چەن دێڕە هۆنراوەیە و پوختەی بەسەرهاتەکەشیم هەر لە بیرماوە.
من پێش خوێندنیش، وەک دایکی خوالێخۆشبووم، هەموو جارێ دەیگێڕایەوە، باوکیشم " ئێستەش هەر لە ژیان دایە " دەیگوت: کە دەچوومە بازاڕ، دەمگوت: چیت بۆ بێنم؟
دەتگوت: پێنووسێک و پەڕاوێک.

دیارە، ئەو کاتە پچووکبووم، ماڵیشمان لە لادێ بوو. وەک بڵێی، بەر لەوەی بشـخوێنم، هەر وا، خولیـایەکی تایبـەتیـیم، لەگـەڵ « پێنووس، پەڕاو، نووسین، خوێندنەوە » و ئەو شتانە هەبوو.
لە بیـرمـە، پچـووکـبـووم، باوکم پێنووس و پەڕاوێکی بۆ هێنابووم، شـتم دەنووسی. دیارە، دایکم لای « فـەقـێ »کان، ئەلف و بێ و شـتی بینیـبوو، دەیگوت: ئەوەیان لە « ئەلف » دەچێ، ئەوەشیـان وەک پیتـی « بێ » وایە. هەڵبـەتە، ئەو کاتەش، ئەوەی ئەوان بینیـبوویان، لە یادیان مـابوو. واتە: خوێندنەوەم، لەو کاتەوە و لە قۆناغی سەرەتاییەوە دەسپێکردووە.
ــ لە یەکی سەرەتاییەوە؟!!
بەڵێ. لە خوێندنی قوتابخانەشدا، هەموو ساڵێ بە یەکەم دەردەچووم.

پ3 : گەر بۆ دواوە و بۆ تەمەنی پێش قوتابخـانە بگەڕێینەوە، واتـە: گەر بڵێم: « عەلی » پچکۆلانە، « عەلی » منداڵ، لە گوندە خنجیلانەکەی خۆیدا، حەزی لە چی کردووە، تۆ چیم بۆ باسدەکەی؟
و3 : بەڵێ. بە ڕاسـتیی، شـتێکی تایبـەتییم لە بیـر نەماوە. شـتێکی وا تایبـەتبێ، شـایانی باسکردنبێ. بەڵام، ئەوەی لە یادمـبێ، لەگـەڵ منداڵانی گوندەکـەمدا، یاریمدەکرد. واتە: گیـانێکی کۆمـەڵایەتییم هەبوو، گیـانی تێکەڵبـوون لەگـەڵ خـەڵک و ئەوانـەم هەبوو. بەڵام، ئەوەی زۆر لە یادمـبێ، دایکیـشم، خوالێی خۆشبێ، چونکە، دایک پتر چاودێریی منداڵ دەکا، تا بزانێ، خــووی چۆنە، دەیگوت: ڕۆڵە! هـەمــوو جــارێ، لە لادێ، گــەر بتویستـایە، بڵێین، ئاوا ئیشی سـەرئاو و ئاودەسـخانە جێبەجێکەی، زۆر دووردەکەوتیتـەوە، تا لە چاو دیار نـەدەمـای. ئاخر، لە لادێ، ئاودەسـخانە نەبووە. واتە: لایەنی شـەرمم بە سـەردا زاڵبـووە. لەو لایەنانەوە، هێندێ شتی منداڵانەی سووکەڵە و ئەوانە هەبووە، دێتەوە یادم.
لە بیـرمـدێ، لە گەڕەکی « قوولە » لە « ڕانیێ »، لە تەمـەنی منداڵیـدا بووم. منداڵ شتی سـووکەڵەیان دەکرد، لە درەخت و باخی خەڵک، شتیان دەدزی. یا، هـێندێ یاریی وایان دەکـرد، خــەڵکیـان ئازاردەدا. یا، شـوێن ئـاژەڵی بەرەڵڵا دەکەوتن. من، ئەو شـتانەم نەدەکرد. دێتەوەبیـرم، کاتێ گەورەبووم، هەموو جارێ، ئامۆژگاریی براکانی خۆم دەکرد. دایکم خوا لێی خۆشبێ، هەموو جارێ دەیگوت: ڕۆڵە! پێویست ناکا، خۆتیان پێوە ماندووکەی!

دەمگوت: بۆچی؟
دەیگوت: وەڵڵایی، تۆ بە منالیی، لە پۆلی سێ و چواری سەرەتایی بووی، ڕۆژێ هاتیتەوە، گوتت: دایە! بڕیارمداوە، لە مەودوا، « کەلاێن، بندەستە، لگاو » و ئەوانە ناکەم.
گوتم: بۆ ڕۆڵە؟
گوتت: بۆیە. بڕیارمداوە، ئەو شتانە ناکەم.
دەیگوت: بێ ئەوەی، خۆمان ئامۆژگارییتبکەین.
واتە: بە ڕاستیی، کاک دوکتۆر « حوسێن » ! ئێستە کە من، کلافەی تەمەنی خۆم هەڵدەکەمەوە و بە چاوی ئەندێشە، تەماشایدەکەم، دەسی میهرەبانیی و چاودێریی خوای پەروەردگار، زۆر بە سەر خۆمەوە دەبینم. چونکە وەنەبێ، بڵێی، من ئەو کاتە، بە هــــۆی ئەوەوە شارەزابوویم. یا، « قورئان »م زانیبێ. یا، فرمایشتەکانی پەیامبەرم « د.خ.» بیستبێ. یا، کەسێ ئاراستەیکردبم. بەڵکوو، هەر وەک چۆن، خوای پەروەردگار، وەک هەستێکی خۆڕسک، بە مرۆڤی دەبەخشێ، خۆم لە هێندێ شتی سووک و خراپ و ئەوانە بە دووردەگرت. وەکوو دیکەش، لەگەڵ منالاندا یاریمدەکرد. ئەوەی پتریش دێتەوەبیرم، لە هەر شوێنێ دەبووم، منال لەگەڵ من دەبوون، نەک من لەگەڵ ئەوان بوویم! بۆ نموونە: گەر تیپێکی تۆپی پێ و ئەمانەمان هەبوویێ، زیاتر، منیان بە براگەورە داناوە و پتر من سەرپەرشتیم کردوون. لاشەڕیش بووم. مرۆڤێکی ئاوا دێتەوە یادم، کە خۆشیم بە هەرا، گێچەڵ، شەڕ و شت نەهاتووە. ئەوە چەن بیرەوەرییەکی ئەو کاتانەیە، کە بەڕێزت فەرمووت.

پ4 : دوای ئەوەی، لە قوتابخانە وەرگیرای، پێوەندیی کۆمەڵایەتیی، لەگەڵ هاوڕێ قوتابییەکانتدا چۆن بوو؟
و4 : بەپێی ئەوەی، لە وانەکانمدا زیرەکبووم، هەموو ساڵێ، بە یەکەم دەردەچووم. هەمیشە، قوتابییەکان لێم نزیکدەبوونەوە، تا، وانەیان بۆ لێکدەمەوە، فێریانکەم و پرسیارەکانیان بۆ باسکەم. مامۆستاکانیش، ئەوەی لە یادمبێ، زۆر جار، دیاریی و بەخشیشیان دەدامێ، خەلاتیان دەکردم، لەبەرئەوەی، یەکەم دەبووم و وانەکانم باش لەبەردەکرد. واتە: هەستدەکەم، هەم لەگەڵ مامۆستاکان و هەم لەگەڵ هاوڕێ قوتابییەکانم،

پێوەندییەکی زۆر باشم هەبووبێ. کاتی خۆی، هێندێ لە مامۆستاکانم، لە شارۆچکەی « ڕانیێ »، یا لە « سولەیمانیی »، لە قۆناغی نێوەندیی و دوانێوەندیی، وانەیان پێ گوتووم، ئێستەش، کاتێ تووشیاندەبم، دەسیان ماچدەکەم. زۆر جار، دەڵێم: ئێوە مامۆستای من بوون، وەک « عەرەب » گوتوویەتی: « الحر من راعى وداده لحظه، و لم ينسى من تعلمه منه لفظه »

ئەو مامۆستایانەی وانەیان پێ گوتووم، زۆر لەو قوتابییانەی پێکەوە دەمانخوێند، ئێستەش وەک بڵێی، ئەو « دۆستایەتیی، هۆگریی و هاوەڵایەتیی »یەی ئەو کاتەی پێکەوە بوومانە، هەر ماومانە. هێندێکیان، هەر لەگەڵ خۆمانن، لەگەڵ ئەم ڕەوت و کاری ئیسلامییە، ئیشمان لەگەڵ دەکەن. هێندێکی دیکەیان، خەریکی کەسابەتی خۆیانن، بەڵام، ئەو یاد و بیرەوەرییانەی، ئەو کاتانەی پێکەوە بوومانە، هەر ماومانە. واتە: وەک بڵێی، بناغەیەکی برایەتیی و دۆستایەتیی، بۆ درووستکردووین و فەرامۆشمان نەکردووە.

دەربارەی هەستی « دینداریی و ئیسلامگەرایی »شم، ئەوەی شایانی باس بێ، دیارە، مەبەستم لە « نوێژکردن و خواپەرستیی »یە، هەر لە پۆلی چوار و پێنجی سەرەتاییەوە دەسمپێکردووە. بەڵام، هەستی « کاری ئیسلامیی »، لە قۆناغی یەکی نێوەندیی و دووی نێوەندییدا پەیدابوو. بە تایبەتیی، کاتێ لە « سولەیمانیی » دەمخوێند. چونکە، « سولەیمانیی » کەشێکی ئاشووبی هەبوو، تازە شۆڕش هەرەسیهێنابوو، شۆڕشی نوێ و کوردایەتیی خەریکبوو، تازە دەسیپێدەکردەوە. هەم هەستی ئیسلامەتیی و هەم هەستی نەتەوایەتییش، وەک بڵێی، خەمخواردن لە گەل و لە خاک ...

– حەزدەکەم، ئەوە بۆ پرسیارێکی دیکە بەجێبێڵین.

بەڵێ.

پ5 : ئینجا، با بڵێین: لەو قۆناغەی قوتابیبووی، ئایا، حەزتدەکرد، تەنیا هەر هاوڕێی قوتابییەکان بی، یا هاوڕێی کەسانێ بی، لە تەمەنی خۆت گەورەترین؟

و5 : ڕاستییەکەی، من پتر ئەوانە برادەرم بوون، کە لە خۆم بە تەمەنتر بوون. ئێستەش، زۆر باش لە یادمە، لە پۆلی دووی نێوەندیی بووم، هێندێ

لەو هاوەڵانەی لەگەڵمان دەیانخوێند، بیری « مارکسیی »یان هەبوو. یەکێ لەوانە، کاک « ناصیح کەریم » بوو. ئێستە، لەگەڵ مامۆستا « بەهادین نووریی » و ئەوان ئیشدەکا.
— بەڵێ. دەیناسم.
کوڕێکی دیکەش هەبوو، ناوی « موحەممەد رەنجاو » بوو، خەڵکی شارۆچکەی « قەڵادزێ » بوو. لام وابێ، ئێستە، لەگەڵ برادەرانی « یەکێتیی » کاردەکا.
— بەڵێ.
لەوانە هەبوون، ئەو کاتە، بیری « مارکسیی، چەپ، کۆمۆنیستیی » و شتیان هەبوو. لەگەڵ من و لەگەڵ هێندێ برادەری دیکەشدا، کە لەگەڵ ئێمەدا هاوبیربوون، دژایەتیی، ناکۆکیی، شەڕەقسە و شەڕەدەندووکمان دەبوو. لە بیرم دێ، هێندێ برادەرم هەبوو، لە پۆلی شەشی دوانێوەندیی بوون. منیش، لە پۆلی دوو و سێی نێوەندیی بووم، زۆر جار، من ئەوانم هاندەدا، بخوێننەوە، تا لەگەڵ ئەواندا بتوانین، وتووێژ و قسەبکەین. جا، هەڵبەتە، ئەوە بەگوێرەی ئەوەبوو، ئەو کاتەی ماڵمان لە « سەنگسەر »ەوە بەرەو « بیتوێن » هات، من ساڵێ لە خوێندن دواکەوتم.
— بەڵێ.
پاشانیش، لە کاتی هەرەسی شۆڕشی « 11/سێپتێمبەر »دا، ساڵێکی دیکەش دواکەوتم. ئاوابوو، ڕەنگە، بەپێی ئەو پۆلەی تێیدا بووم، لە قوتابییەکانی دیکە هەراشتربووبیم. یا، لە ڕووی بیرەوە، یا، لە ڕووی خوێندنەوەوە، یا، لە ڕووی بایەخدانی زانستیی و ئەوانەوە، لە پێشتر بووبیم.
دیارە، هاوپۆلەکانی خۆم دۆستمبوون، بەڵام، زیاتر ئەوانەی لە پێش ئێمەوە بوون، بە دوو ساڵ، بە سێ ساڵ و بگرە بە چوار ساڵیش، لەگەڵ ئەوانیشدا، هەر دۆستایەتیی و ئاڵوگۆڕی بیر و گفتوگۆمان هەبوو، چ بە باری باشە، گەر لەگەڵماندا هاوبیر بوونایە، چ بە باری خراپە، وەک ئەو کاک « ناصیح کەریم و محەمەد رەنجاو » و ئەوانە، کە ئاماژەم بۆ کردن.

پ6 : حەزدەکەم، بزانم، کەی ژنت هێناوە؟
و6 : من لە مانگی یەکی ساڵی « 1984 »دا، یەکەمین هاوسەرم هێنا.

ـــ چەن ژنت هێناوە؟
لە ساڵی « 1993 »شدا، دووەمین هاوسەرم هێناوە.
ـــ هەر دووکیان لە ژیان دان؟
نەخێر. یەکەمین هاوسەرم، کە ناوی « رووخسار » خان بوو، خوا لێی خۆشبێ و پلەی بەرزکاتەوە، لە ساڵی « 1996 »دا مرد. شەش مناڵ « سێ کوڕ و سێ کچ »ی لە پاش بەجێما. خێزانی ئێستەشم، ئەوە دیارە، لە ژیان دایە، لە ئەویش سێ کوڕ و کچێکم هەیە.
ـــ خوا تەمانیان درێژکا.
سوپاستدەکەم.

پ7 : ئەدی، چەن برا و خوشکت هەیە؟
و7 : ئەوانەی ئێستە لە ژیاندا مابن، سێ برام هەن: « عەبدولواحید، ئەبو بەکر و برایم ». دیارە، برای دیکەشم هەبوون، بەڵام مردوون. یەکێ لەوانە، ناوی « عومەر » بوو. ساڵی « 1989 - 1990 »، برایەکی رێکخستنی خۆمان، نارد بۆ نێو شــــــار، تا کارێکی تایبەتییمان بۆ ئەنجامدا. بەڵام، « عومەر » بە گرتیدا. دوایی، ئێمە ناچاربووین، پۆلێ چەکداری بۆ بنێرین و بیگرین. ئەو برایەمیان کوشت. *
ـــ بەڵێ.
خوشکیش، ئێستە سێ خوشکم هەیە. هەرسێکیان شوویانکردووە.
ـــ براکانت، چەن لە کاری ڕامیاریی و لە ئێوەوە نزیکن؟
وەڵڵا، براکانم هەر لەگەڵ خۆمانن. کاک « عەبدولواحید » کە لە ئەوانی دیکە گەورەترە، لەگەڵ « ئەبو بەکر »دا هەر لێرەن. بەڵام، « برایم »یان، چوار ساڵ لە « ئەڵمانیا » بوو، هەر لە ئەوێش ژنیهێناوە، ئێستە لە شارۆچکەی « ڕانیێ »یە و هەر لەگەڵ خۆمانە.

---

* دواتر، مامۆستام بینییەوە. لەو بارەیەوە، پرسیارم لێ کرد. گوتی: ئەو برایە، نـــاوی « عەلی رەسووڵ » بوو. بە کاری پێشمەرگایەتیی چوو بۆ نێو شار. لەوێ « عومەر »ی برام تووشیکرد. منیش ناردم، هێنایان. پاشان، باوک و دایکم هاتن، ویستیان، لێی خۆشبێن. پێم گوتن: قسەی ئێوە لە سەر سەرم، ئێوەم زۆر خۆشدەوێ و براکەشم هەر خۆشدەوێ. بەڵام، ئیسلامم لە هەمووتان خۆشتردەوێ. لەبەرئەوە، تۆڵەمان لێ کردووە و کوشتمان!

پ8 : دەربارەی بەرهەم و نووسینەکانت، چیم بۆ باسدەکەی و چیت هەیە؟ گەر هەر تەنیا، بە شێوەیەکی گشتیی بڵێی، ئەوندە گوتار، ئەوندە نامیلکە و پەرتووکم نووسیوە، باشترە.

و8 : نزیکەی، پتر لە چل نامیلکە و پەرتووکی چاپکراوم هەیە.

ـــ هەمووی بە ناوی خۆتەوەن؟

بەڵێ.

ـــ بە ناوی خواستراو و نهێنیی، هیچت نەنووسیوە؟

نەخێر. من هەر بە ناوی خۆمەوە، شتم نووسیوە. لە ژیانمدا، بە ناوی خوستراوەوە نەمنووسیوە. دەتوانم، ئاماژە بەو پەرتووکانەشم بکەم. یەکەمین بەرهەمم « پوختەیەک دەربارەی ئیسلام » بوو. ساڵی « 1984 » چاپکراوە. « دەبەرێک ڕاچوونی ئیسلام و ڕێچکان » لە ساڵی « 1985 »دا چاپکراوە، کاتی خۆی، برادەرانی « یەکێتیی »، زۆر پێی تێکچوون! ئینجا « گرنگیی یادی خوا لە ژیانی ئینساندا ». ساڵی « 1987 » چاپ کراوە. ئەو سێ پەرتووکە، بەر لەوەی دەس بە خەباتی شاخ بکەین و بچمە دەرەوە چاپکراون. ئەوانی دیکە « پێشمەرگەی ئیسلام، کۆمەڵی خوا، سۆزی نەتەوایەتی، کوردستان بۆ وێران بوو و چۆن ئاوەداندەکرێتەوە، حوکمی گەڕانەوە ژێر نیری تاغووت لە ڕوانگەی ئیسلامەوە ـ ئەو کاتە خەڵک دەگەڕایەوە، وەک بڵێی، خەڵکی بەرەو هەرەس چووبوون ـ ڕێگای ساڵحبوون و بەرەو خوا چوون، ڕێبازی پێغەمبەر « د. خ.»، مەسەلەی کورد و پێناسەی حیزبی بەعس، چارەسەری کێشەی کورد لە نێوان ئیمان و پەرلەماندا، پرۆژەی بەرنامەی فیکریی کاری ئیسلامیی، موسوڵمانی کامڵ، ئیسلام و کێشە هەنووکەییەکان ... » واتە: تا ئێستە، پتر لە چل بەرهەمی چاپکراو دەبن. ژمارەیەکی دیکەش، چاوەڕێی چاپ دەکەن. بە کاسێت و کۆڕیش، ژمارەیەکی زۆر بەرهەمم هەیە.

ـــ دەس خۆشبێ.

پ9 : ئێستە، حەزدەکەم، بزانم، لە کەیەوە دەس بە کاری ڕامیاریی کردووە؟ جگە لە ڕێکخراوی ئیسلامیی، ئایا، ڕۆژێ لە ڕۆژان، لە « یەکێتی قوتابیانی کوردستان »، یا لە « پارتی دیمۆکراتی کوردستان »دا، کارت کردووە و ئەندام بووی؟

و9 : دەربارەی کـاری رامـیـاریی ئیـسـلامـیی، هەر لە سـەرەتای هوشیاربوونمەوە، بۆ ئیسلام جووڵاوم. هەڵبەتە، بۆ زاراوەی ڕامیاریی، من پێناسەی خۆم هەیە.
ــ مەبەستم ئەوەیە، پێش ئەوەی، دەس بە کاری ئیسلامیی بکەی، ئایا، لە ڕێکخراوەکانی « قوتابیان و پارتیی »دا کارتکردووە؟
نەخێر. لە هیچ ڕێکخراوێکدا کارم نەکردووە. نە لە « ئیسلامیی » و نە لە « نەتەوەیی »دا نەبووم.
ــ بەڵێ.
بەڵام، هەر لە سـەرەتاوە، ئەوەتەی هـوشـیـاربوومـەتەوە و چاومکردۆتەوە، زانیـومـە، من مـرۆڤـێکم، لە نێـو گـەلێکدا دەژیم، ئەو گـەلە ژێردەسـە، وڵاتەکەشی زەوتکراوە. پاشان، بایی هێندەی، لە ئایینەکەم تێگەیشتووم، هەستمکردووە، ئەو ئایینە قەبووڵ ناکا، تاکەمرۆڤێ کۆیلە و ژێردەسبێ، جـا چ جـای گـەلێ بندەسـبێ! چونکە، تەمـاشـامکردووە، خـوای گـەورە فەرمووپەتی: ( فلا اقتحم العقبه، و ما ادریک ما العقبه، فک رقبه، او اطعام فی یوم ذی مسغبه، یتیما ذا مقربه، او مسکینا ذا متربه.) واتـە: ئەو مرۆڤە، دەرووی سەختی نەبڕیوە. دەرووی سەخت چییە؟ بریتییە لە ڕزگارکردنی کۆیلەیەک، یا تێرکردنی برسییەک ...
تەماشامدەکرد، گەر خوای پەروەردگار، ڕزگارکردنی مرۆڤێک و تێرکردنی برسییەک، بە هۆی ڕزگاریی و سەرفرازیی مرۆ دانێ، ئەدی ڕزگارکردنی گەلێ، چارەسەرکردنی کێشەی ئابووریی و ڕامیاریی گەلێ، ڕزگارکردنی نیـشـتـمـانێ دەبێ، چ خـێـر و پاداشـتـێکی هـەبێ؟ بە پێـچـەوانەشـەوە، تێـوەڕامـانی گـەلێکی زۆرلێکراو، بە ژێردەسـیی بمێنێـتـەوە، دەبێ، چ تاوانێکی گەورەبێ؟
ئیدی، من هەر لەو کاتەوە، ئەوەی خـەڵک پێی دەڵێن، کـاری ئیـسـلامـیی و کاری نەتەوەیی و لە یەکدیان جیادەکەنەوە، هیچ لە مێشک و بەرنامەمدا نەبووە، ئەو دوو خـەباتە لە یەکدی بترازێنم. واتە: خـەباتی ئیـسـلامـیی و خـەباتی نەتەوایەتیی، خـەمـخـواردنم لە گـەلەکـەم و خـەمـخـواردنم لە ئایینەکـەم، هەر بە دوو ڕووی یەک ڕاسـتـییم زانیوە. واتە: پێم وا نەبووە، کـاتێ مـرۆ، خـەم لە گـەلی خـۆی دەخـوا، دەبێ، ئایـین لە لاوە دابنێ. کاتێکیش، خەم لە ئایینەکەی خۆی دەخوا، دەبێ، ئاگای لە گەل، خاک و

نیشتمانەکەی خۆی نەمێنێ. بە پێچەوانەوە، مرۆ دەبێ، لە نێو گەلەکەی خۆیدا، خەم لە ئایینی خوا بخوا، بۆ ئەوەی، گەلەکەی پێ بەختەوەرکا، گەر خاکەکە ئازاد نەبێ، گەر گەلەکە سەربەست نەبێ، کاری ئایینیی و ڕاژەکردنی ئایینیشی بۆ ناکرێ. چونکە، گەلێکی ژێردەس و خاکێکی زەوتکراو، هیچی تێدا ناکرێ. ئایا، گەر گەلەکە، خاوەنی خۆی نەبێ، ویستی خۆی، بە دەس خۆی نەبێ، چی لە دەسدێ؟

جا، بۆ زانیاریی بەڕێزت، من هەر لە سەرەتاوە، دەسم بە کار کردووە، خەباتی نەتەوەیی و خەباتی ئیسلامیی، خەمخواردن لە خەڵک، لە گەل و نیشتمان، خەمخواردن لە ئایینی خوای پەروەردگار، هەموویانم، هەر بە یەک شت زانیوە. بە چەن ڕوویەکی یەک ڕاستییم زانیون. ئەوەش، هەر لە سەرەتای هوشیاربوونمەوە وابووە.

لە بیرمە، ئەو کاتانەی لە « سولەیمانیی » دەمخوێند، سەردانی « ڕانیێ »م دەکرد، لە گوندەکانی دەوروبەری « ڕانیێ »، خەڵکی دۆست و ئاشنامان هەبوون. لە بەری « مەرگە » و لە دۆڵی « ئاکۆیەتیی، خۆشناوەتیی، جافایەتیی » و ئەو نێوچانە، هەر لەو کاتانەوە و لە سەرەتای هەشتاکانەوە، دژی ڕژێمی « بەعس » و دژی هەر بیرێکی دیکەی پێم وابوو، بە گەلەکەم نامۆیە، وتارمدەدا. بەڵام، ئەو کاتە، پتر دژی ڕژێمی « بەعس » قسەمدەکرد.

لە بیرمە، ئەو کاتە، برادەرانی « یەکێتیی »، گومانیان لێ دەکردم، گوایە: پێوەندییەکم بە « بەعس »ەوە هەیە. چونکە، بە ڕاشکاویی و بێ سڵەمینەوە، قسەم بە میریی دەگوت، گوتارمدەدا و خەڵکم هوشیار دەکردەوە. تا دوایی، ئەوەبوو، کاتێ بە یەکجاریی، لە میریی و ڕژێم قاچاغ بووم، ئەیان دەزانی.

لە ڕاستییدا، هێندێ برادەر هەبوون، سەر بە ڕێکخستنەکانی « یەکێتیی، پارتیی » و لایەنەکانی دیکەش بوون، لە « زانکۆ » لەگەڵم بوون، ئەوان، بە ڕاستیی ئامادەبوون، بەرگی « لەشکری میللیی » لەبەرکەن، مەشقبکەن، لە نێو ڕیزەکانی « یەکێتی قوتابیان »ی ئەو کاتەدا کاربکەن. بەڵام، ڕاستییەکەی، من ئامادە نەبووم، ئەو کارە بکەم. جا، زۆر جار پێم دەگوتن: کاکە! من خوێندنم لە دەسداوە، لە سەر ئەوەی ئامادە نەبووم، لەگەڵ ڕژێمێکی داگیرکەری گەلەکەمدا بم، لە بەر هۆی ئایینیی و

نیشتمانپەروەریش، دژایەتیکراوم، ئێستە، بۆچی دەبێ، ئێوە نیشتمانپەروەربن، بەڵام، ئێمە هەو نەبین؟!! هەر لەبەرئەوەی دەڵێم: دەبێ، لە ڕێی ئیسلامەوە، لە سەر بنامەی ئیسلام، داکۆکیی لە گەلەکەی خۆمان بکەین، هەوڵبدەین، مافە ڕەواکانی بۆ دابینکەین؟!! هەر لەبەرئەوەی، کار و خەباتەکەی من، بۆنی ئیسلام و موسوڵمانێتیی لێدێ، لە کوردایەتیی دەشۆرێینەوە؟!!

بەڵام، وەک کاری ڕێکخراوەیی، گەر مەبەست ئەوەبێ، دیارە، ئەوە دوای ئەوەی، « بزووتنەوەی پەیوەندیی ئیسلامیی » دروستبوو، لە سەرەتای هەشتاکان،

ـــ دوایی، باسی ئەوەش دەکەین. بەڵام، ئێستە حەزدەکەم، بزانم، بەڕێزت چۆن توانیوتە، لە نێوان هەستی کوردانەی خۆت وەک کوردێک و ئەرکەکانی سەرشانت وەک موسوڵمانێ، ئەو هاوسەنگییە دروستکەی؟!! چۆن لە تای تەرازوویەکدا، ئەو دوو شتەت ڕاگرتووە؟ چۆن ڕاژەکردنی گەلەکەت، لەگەڵ ئەرکە ئایینییەکانی سەرشانتدا بەرانبەر کردووە؟ چۆن ڕەواییت بەو دوو تێکۆشانە داوە، پێکەوە برۆن؟

بەڵێ. کاک دوکتۆر « حوسێن » ! من کارکردن بۆ گەلەکەم، لەگەڵ ئایینداریکردنەکەی خۆم، بە شتێکی تێکهەڵکێش دەبینم. واتە: بە شتێکی لە یەکدی جیایان نابینم. بە دوو تای تەرازوویەکیان نابینم. بەڵکوو، بە دوو ڕووی ڕاستییەکیان دەبینم. چۆن؟ من، پێنج فەرزە، بەو خوایە دەڵێم: (اياك نعبد و اياك نستعين، اهدنا الصراط المستقيم) واتە: هەر تۆ دەپەرستین و هەر پشت بە تۆ دەبەستین، ڕێی ڕاستمان پیشاندە. خوای پەروەردگار، ئەو خوایەی من پێنج فەرزە، پەیمانی لەگەڵ نوێ دەکەمەوە، کە هەر بەندەی ئەو بم و هەر پشت بەو ببەستم، هەر ڕێی ڕاستیی ئەو بگرم، ئەو خوا پەروەردگارە، پێی ڕاگەیاندووم و فەرموویەتی: (يا ايها الناس انا خلقناكم من ذكر و انثى و جعلناكم شعوبا و قبائل لتعارفوا ان اكرمكم عند الله اتقاكم انه عليم خبير.)

ئەو خوایەی، من ڕۆژانە، پەیمانی لەگەڵ نوێدەکەمەوە و دەڵێم: ڕێی ڕاستم پیشاندە، ڕێ ڕاستەکەم پیشاندەدا. لە کێشەی نەتەوایەتیی و مرۆڤایەتیی، لە هەڵوێستم سەبارەت بە گەلەکەم، لە هەڵوێستم سەبارەت بە مرۆڤایەتیی، فەرموویەتی: « ئەی خەڵکینە، ئێوەمان لە نێر و مێیەک

دروستکردووه، پاشان، کردوومانن به چەن گەل و تیرەیەک، تا یەکدی بناسن، بەڕێزەکەتان لای خوا، پارێزکارترتانە. بێ گومان، خوا زانا و شارەزایە.
کەواتە: ئەمە ئەوە دەگەیەنێ: چ لە سەر ئاستی تاک، چ لە سەر ئاستی گەل، کێ پتر، بە بەرنامەی خواوە پابەندبێ، ئەوە لە لای خوا بەڕێزترە. چونکە، خوا نەیفەرمووە: « اعربکم » کێ عەرەبترە. یا نەیفەرمووە: « اغناکم » کێ دەوڵەمەندترە. یا نەیفەرمووە: « ابیضکم » کێ سپیترە. یا نەیفەرمووە: « اعلمکم » کێ زاناترە. یا نەیفەرمووە: « اشجعکم »، کێ ئازاترە. بەڵکوو فەرموویەتی: « اتقاکم » واتە: کێ پارێزکارترە.
جا، هەموو کەس دەتوانێ، پتر بە بەرنامەی خواوە پابەندبێ. لە سەر ئاستی گەل، هەم کورد دەتوانێ، هەم عەرەب دەتوانێ. لە سەر ئاستی تیرە و هۆز، هەموو تیرە و هۆزێ دەتوانێ. لە سەر ئاستی تاکیش، هەم هەژار و هەم دەوڵەمەند، هەم سپی پێست و هەم ڕەش پێست، هەم خوێندەوار و هەم نەخوێندەوار، هەموویان دەتوانن، پێشبڕکێبکەن، بۆ ئەوەی پارێزکارترین، بە بەرنامەی خواوە پابەندترین.
لەبەرئەوە، لە نێوان کوردایەتیی و موسوڵمانێتیمدا، هیچ دژایەتیی و ناکۆکییەکم نەبینیوە و ناشیبینم. من لە پەرتووکی « سۆزی نەتەوایەتی و بیری ناسیۆنالیزم لە تەرازووی ئیسلامدا »، ئەو ڕاستییەم، جوان ڕوونکردۆتەوە. لە چاپی سێیەمیشیدا، بە ناوی « کوردایەتی و موسوڵمانەتی لە نێوان ئیسلامیی و عەلمانییەکاندا »، بەشێکم بۆ زیاد کردووە و ڕوونیشمکردۆتەوە، کە کوردایەتییەکەم، بە بەشێ لە موسوڵمانێتییەکەم دەزانم. واتە: کاتێ خۆم بە موسوڵمانێکی باش دەزانم، بەرانبەر بە گەلەکەم بە ئەمەکبم. بەرانبەر بە نیشتمانەکەم بە ئەمەکبم. لە سەر مافە ڕەواکانی، پشتی بگرم، داکۆکیی لێ بکەم. گەل و نیشتمانەکەم بپارێزم، هەوڵبدەم، ئاوەدانیکەمەوە. چونکە، موسوڵمانێتیەکەم پێم دەڵێ: دەبێ، لەگەڵ گەلەکەم باشبم.
لە ڕاستییدا، گەر پرینسییەکانی ئیسلام جێبەجێبکرێ، چ لە سەر ئاستی تاک، چ لە سەر ئاستی کۆمەڵ، بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکیی، بەڵگەی ئەوە بە دەستەوە دەدەن، کە مرۆڤی موسوڵمان بتوانێ، ڕاژەی گەلەکەی خۆی بکا. چونکە خوا فەرموویەتی: دەبێ، دادگەریی هەبێ. نابێ، زۆرداریی و

ستەم هەبێ. نابێ، جینایەتیی هەبێ. نابێ، قڕیی و پڕیی هەبێ. نابێ، داوێنپیسیی و خراپە هەبێ. دەبێ، خەڵک پێکەوە تەبابن، برابن، ڕێکبن. کاتێ، ئەو بەرنامەیە پیادەکرێ، گەل قازانجدەکا، نیشتمان ئاوەداندەبێتەوە، خێر و فەڕ بە سەر خەڵکدا دەڕژێ. کەواتە: ئاییندارییکردن لەگەڵ جیهاندارییکردن، بەرنامەی خوا بەڕێوەبردن لەگەڵ ڕاژەکردنی گەل، دوو شتی تێکهەڵکێشن، ناکرێ، لە یەکدی جیاکرێنەوە. من دەڵێم: « تەحە »دا دەکەم، یەکێ بتوانێ، ئاییندارییبکا، بۆ ئەوەی، گەل و نیشتمانی هەبێ. ئاخر چۆن دەیکا؟ خۆ لە ئاسمان نایکا؟ ئێمە، خوا لە سەر زەویی دایناوین، گەر ئەو زەوییە ئازاد نەبێ، گەر ئەو گەلە سەربەست نەبێ، چۆن ئایینی لە نێودا پیادەدەکرێ؟ گەلێکی ژێردەس و کۆیلە ناتوانێ، ئایینێ کە سەرچاوەی سەرفرازیی بێ، ئایینێ بۆیە هاتبێ، سەرفرازیی و سەربەرزیی پێ ببەخشێ، گەلێکی ژێردەس و کۆیلە، کە وولاتەکەی زەوتکرابێ، ناتوانێ، ئەو ئایینە پڕ شکۆمەندە، ئەو ئایینە سەربەرزە، لە نێو خۆیدا پیادەبکا.

بۆیە، هاوسەنگیی ڕاگرتنەکە، هەر لە خودی « شەریعەت » خۆیدا هەیە. بەڵام، زۆر جار، هێندێ لە ڕۆشنبیرانی کورد، ڕەنگە، لەوەوە بە هەڵەدا بچن، هەڵبەتە، مەبەستم لە بەڕێزت نییە، ڕەنگە، لەوەوە تووشی هەڵەبن، ئایا دەبێ، موسوڵمانێتیی ڕێیدا، مرۆڤ کوردایەتیی بکا و خەم لە گەلی خۆی بخوا، چونکە، موسوڵمانێتیی، بۆ هەموو مرۆڤایەتیی هاتووە؟!!

ئەمەش، پتر لەوەوە هاتووە، کاتێ، ئەو جۆرە کەسانە دێن، هەر دوو ئایینی « فەلە و ئیسلام » بەراوردەکەن، دەبینن: ئایینی « فەلە »، لە بنەڕەتدا، نەک تەنیا هەر، لە ڕووی « نەتەوایەتیی »یەوە، بەڵکو، لە ڕووی « ڕامیاریی، کۆمەڵایەتیی و ئابووریی »یشەوە، لە ناوەڕۆکەکەی خۆی پووچ کراوەتەوە. چونکە، ئایینی « فەلە »، بە دەس « قەشە و پاپا »کانەوە، وەک بازیچەیەک وابووە، بەرژەوەندیی تایبەتیی خۆیان، بەرژەوەندیی « تسار و ئیمپراتۆر »ەکانیان، پێ دابینکردووە.

ـ مامۆستا! لە دواییدا، دێینە سەر ئەو باسانە و زۆر بە درێژیی لێیان دەدوێین. لێرەدا، بەشی یەکەممان تەواوکرد، دەربارەی کورتەیەکی مێژووی ژیانی خۆت بوو. حەزدەکەی، ماوەیە پشوودەدەین، پاشان، بەشی دووەم دەسپێدەکەین؟

پ10: ئێستە، دێینە سەر پرسیارێکی دیکە. حەزدەکەم، بەگوێرەی ئەو زانیارییانەی بەڕێزت هەتە، دەربارەی سەرهەڵدانی ئیسلامی ڕامیاریی لە«کوردستان»دا، کورتەیەکی مێژوویم بۆ باسکەی. لە سەرەتاوە چۆن، یەکەمین گەرای ڕێکخستن درووستبووە؟ فەرموو.

و10: باشە. پێشەکیی، بە دڵنیاییەوە دەڵێم: پێش ئەوەی، کاری ڕامیاریی ئیسلامیی ڕێکوپێک و بە بەرنامە، لە «کوردستان»دا لەدایکبێ، هێندێ کەسایەتیی ئیسلامیی کوردیی هەبوون، کارێکی گەلێ مەزنیان ئەنجام داوە. بۆ نموونە: پیاوێکی وەک «مەلای گەورەی کۆیە» هەبووە، لەو سەردەمانەدا، هەم یەکەمەلا و زانایەکی ئایینیی زۆر گەورەبووە، هەم بە ڕاستیی، لە ڕۆشنبیریی، لە بیرکراوەیی، لە هەرسکردنی کەلتووری سەردەمەکەی خۆی، لەو ڕەوتە بیریی، ڕامیاریی و تەوژمانەی، لە سەردەمی خۆیدا هەبوون، زۆر پێش ڕۆژگاری خۆی کەوتبوو.

هەروەها، لە شاری «هەولێر»، لە نێوچەکانی «شارەزوور، پشدەر، بیتوێن» و لە نێو «سولەیمانیی»ش، گەلێ زانای ئایینیی پایەبەرز و مەزن هەبوون.

بەڵام، وەک کاری ڕێکخراوەیی، چالاکیی ڕامیاریی ئیسلامیی، بۆ سەرەتای پەنجاکان دەگەڕێتەوە. یەکەمین کارێ، لە نێو «کوردستان» و ڕەنگە، لە «عێراق»یشدا کرابێ، تەنیا هەر ئەوەبووە، «برایانی موسوڵمان» کردوویانە. دیارە، من باسی تەمەنی خۆم ناکەم، چونکە، پێش تەمەنی ئێمە بووە.

ئەوەی بیستوومە و دەیزانم، ئەوەیە: دوای ئەوەی، قوتابخانەی «برایانی موسوڵمان»، لە «میسر» سەریهەڵداوە، هێندێکی بۆ «شام» پەڕیوەتەوە. لە سەرەتاوە، «شێخ مستەفا ئەلسیباعیی» و ئەوان هێنایان. پاشان، لە ڕێی «شێخ مەحموود ئەلصەواف»ەوە، بۆ «عێراق و بەغدا» هاتووە. هەر لە ڕێی ئەویشەوە، لە «مووسڵ، هەولێر و سولەیمانیی» بڵاوبۆتەوە. کاتی خۆشی، لە سەرەتای شەستەکاندا، «صەواف» سەردانی «هەڵەبجە»شی کردووە. واتە: کاری ڕێکخراوەیی ئیسلامیی، کاری ڕامیاریی ئیسلامیی، لەو کاتانەدا، تەنیا هەر، لەو جموجۆڵ و چالاکییانە پێکهاتبوو، کە «برایانی موسوڵمان» ئەنجامیانداوە. ئەوان لەو کاتەوە، کاریانکردووە، تا پارتی «بەعس» هاتووە.

سەرەتای ... برایانی موسوڵمانان

دیاره، دوای ئەوەی، پارتی « بەعس »یش هاتووە، ماوەیەک فەر وەک بلێی، کەمێ بەرهەڵستییانکردووە، بەڵام، لە ساڵی « 1970 »دا، وەک خۆیان باسیدەکەن، بە شێوەیەکی فەرمیی، کاری ڕێکخراوەیی و کاری ڕامیارییان ڕاگرتووە. ئیدی، لەو کاتەوە وەستاندوویانە.
من، پێم وا نییە، هیچ جۆرە کارێکی دیکەی ڕێکخراوەیی هەبووبێ. تا لە نێوان ساڵانی « 1978 - 1979 »دا، جموجۆڵێ هەبوو، وەک کاکڵەیەک « بزووتنەوەی پەیوەندیی ئیسلامیی » پەیدابوو. ئەو کاتە، من لە پۆلی شەشی ئامادەیی بووم، لە شاری « سولەیمانیی » دەمخوێند. کادیرەکانی ئەو سەردەمە، پتر لە نێو شاردا، لە هێندێ مامۆستا پێکهاتبوون. ئەوانەی من بیانناسم، مامۆستا « عەبدولڕەحمانی نەورەسیی » بوو، ئێستە ماوە. کاک « حەسەنی حەمە خالید » بوو، ئێستە ڕۆڵێکی ئەوتۆی نەماوە. بەڵام، لە ڕاستییدا، ئەویش پیاوێکی چالاکبوو. مامۆستا « مەلا محەمەدی مەلا بەهاء »، باوکی مامۆستا « سەلاحەدین » بوو، ئەو کاتە، لە شارۆچکەی « هەڵەبجە » بوو. هەروەها، چەن کەسێکی دیکەش بوون، جارجار یەکدییان دەبینی.
لە قۆناغی دواتردا، مامۆستا « شێخ محەمەدی بەرزنجیی » بوو. هەروەها، مامۆستا « شێخ عەبدول لەتیفی واژەیی » بوو، کە لە سەردەمی « بەعس »دا، ماوەیە گیرا. ماوەیەکیش، لە زانکۆی « هەولێر »، وانەی دەگوتەوە. دوایی، لە مزگەوتی « عەلی کەمال » لە « سولەیمانیی »، گوتاربێژبوو. بەو شێوەیە، ئەوانە، کاکڵەی « بزووتنەوەی پەیوەندیی ئیسلامیی »یان دامەزراند. هەڵبەتە، منیش لەگەڵیان بووم. هێندێ کەسی دیکەش هەبوون، ئێستە، ناوەکانیانم لە یاد نییە. لە وێوە، کاری ئیسلامیی چەکداریی دەسپێکرد.
لە سەرەتادا، کاتێ ئەو کاکڵە ڕێکخراوەییە درووستبوو، پاشان، ناوی « بزووتنەوەی پەیوەندیی ئیسلامیی » لێ نرا، باوەڕمان بە چەک هەبوو. پێمان وابوو، هەموو کار و چالاکییەکی ئیسلامیی، پێویستی بە چەک هەیە. پێویستی بە هێز هەیە. بۆ؟ چونکە، ئەو کاتە، ڕژێمی « بەعس »، هیچی بۆ خەڵکی ئێمە نەهێشتبۆوە.
ڕاستییەک هەیە، لێرەدا پێویستە، بیڵێم: بە ڕاستیی، جموجۆڵی ئیسلامیی چەکدار، واتە: ڕەوتی « جیهادیی »، کە لە « کوردستان »دا

درووستبوو، ئەنجامێکی سروشتیی، کاردانەوەی ستەم و زۆرداریی ڕژێمی « بەعس » بوو، بۆ داکۆکییکردن لە زۆرلێکراویی و ستەمدیدەیی گەلی کورد درووستبوو، کە دوایی، هێندێ شتی لابەلا، هێندێ کێشەی لابەلا درووستبوو. ئایا، چەن خەتای « بزووتنەوەی ئیسلامیی » تێدا بوو؟ چەن خەتای لایەنی بەرانبەر بوو؟ بە ڕاستیی، ئەوە ئامانجێ نەبوو، کە « بزووتنەوە » لە پێناویدا دامەزرابوو. ئامانجێ نەبوو، کە ئیسلامییەکان، دەسیان بۆ چەک بردبوو. بەڵکوو، ئەو ئامانجەی چەکی بۆ هەڵگیرا، لە ڕاستییدا، ڕامالینی ڕژێمی « بەعس » بوو، لێدانی دەزگەکانی ڕژێم بوو، بەشدارییکردنی خەباتی ڕزگاریخوازانەی گەلی کورد بوو.
واتە: ئێمە وەک خەڵکێکی ئیسلامیی، بە ڕاستیی، زۆر هەستمان بە کەموکووڕیی دەکرد، لێکماندەدایەوە و دەمان گوت: بۆ دەبێ، لە ژێر سایە و درووشمی « مارکسییەت، لیبراڵییەت، دیمۆکراسیی، کۆمۆنیستیی » و چی و چی دیکەدا، داکۆکیی لە زۆرلێکراویی کورد و مافە ڕەواکانی بکرێ، کەچیی، گەلەکە خۆی لە خۆیدا موسوڵمان بێ، بۆچی دەبێ، لە ژێر ئاڵای ئیسلام و لە ژێر سایەی کاروانێکی ئیسلامییدا، ئەو کارە نەکرێ؟!!
واتە: هاندەری بنەڕەتیی ئەوەبوو. لە ڕاستییدا، پتر ئەوەبوو، یەکەم: گەلەکەمان گەلێکی موسوڵمانە. پاشان، زۆرداریشی بەرانبەر دەکرێ، لابردنی زۆرداریی و ستەمیش، لە ئیسلامدا فەرزە. گەلێکی موسوڵمانیش پێویستە، بەپێی بیروباوەڕەکەی خۆی، لە ژێر ئاڵای ئایینەکەی خۆیدا، داکۆکیی لە زۆرلێکراویی خۆی بکا.
لێرەدا پێویستە، ئاماژەش بەوە بکەم، ئەو جموجۆڵە ئیسلامییە ڕامیارییەی، بە ناوی « بزووتنەوەی پەیوەندی ئیسلامیی »یەوە درووست بوو، وەک گوتم: پێشتر، بە شێوەیەکی زۆر سەرەتایی بوو. بە ڕاستیی، وا نەبوو، وەک ئەوەی، یەک ڕێکخستنی نێوەندیی هەبووبێ. واتە: کەسێ هەبووبێ، هەموو خەڵکەکەی، لە سەر یەک شێوە، یەک کاری ڕێکخراوەیی ڕێکخستبێ و کۆکردبێتەوە. من لە نێوچەی خۆمان بووم، مامۆستایەکی دیکە، لە « سولەیمانیی »، یەکێکی دیکە لە « شارەزوور » و یەکێکی دیکەش لە « هەڵەبجە » بوون. بەڵام، هەمووومان یەک هاندەر کۆی کردبوووینەوە، ئەویش ئەوەبوو، ئەو گەلەی ئێمە موسوڵمانە، لەو لاوە شۆڕشێ هەرەسیهێناوە، ڕژێمی « بەعس »، زۆرداریی خۆی، لە ئەندازە

تێپەڕاندووە. گەلەکەمان زۆرلێکراو، کەساس و بێ کەسە. ئێمەش، خۆمان بە موسوڵمان دەزانی، ئیسلامیش دژی سەرکوتانەوە و چەوساندنەوەیە. شتێکیش لە ئاینێ تێگەیشتبووین. بۆیە، پێویستبوو، ئەو گەلەی خۆشمان تێگەیەنین و هوشیاریکەینەوە. پاشان، خۆمان بەهێزکەین، ئەو زۆرداریی، ستەم و چەوساندنەوەیە، لە سەر گەلی خۆمان لابەرین.

ئا لەو بارە نالەبارەدا، بەو هاندان و پاڵنەرانە، بزووتنەوەکە درووستبوو، پاشخانێکی بیرییشی هەبوو. بێ گومان، وەک گوتم: چەن مامۆستایەکی هوشیار و بێ دار هەبوون و پێش ئێمە کەتبوون، وەک مامۆستای گەورەی « کۆیە ». هەروەها، مامۆستا هۆنەر و نووسەرەکانی دیکەی کورد، کاتێ بەرهەماکانیانمان دەخوێندەوە، پاشخانی ئیسلامیی و ئایینییان پێوە دیاربوو. جگە لەوەش، هێندێ کەسی دیکە درووستبوون، بە ڕاستیی، بێ ویژدانیی و بێ ئەمەکیی دەکەم، گەر ئامـاژەیان بۆ نەکەم، یەکێ لەوانە، مامۆستا مەلا « عەبدولعەزیز پارەزانیی » بوو.

ـــ بەڵێ. ناویم بیستووە.

ئەم مامۆستایە، ژیانی پەیامبەری « د.خ.» مەزنی نووسی. بە ڕاستیی، دەتوانم، بڵێم: ئەوە لە کاتی خۆیدا، ڕێشکێنێ بوو. هەروەها، مامۆستای نووسەر « شێخ موحەممەدی خاڵ »، لێکدانەوەی « قورئان »ی بە کوردیی نووسی، بەشی « عەما » و بەشی « تەبارەک »، لە لای « ئەلبەقەرە »شەوە، لام وابێ، نووسیبووی.

هەروەها، مامۆستا « مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس »، لە ڕاستییدا، ئەو بە گشتیی، پتر بۆ خەڵکی ڕەشەخوێندەوار بوو، بەلام، ئەوەی مامۆستا مەلا « عەبدولعەزیز پارەزانیی » و مامۆستا « شێخ محەمەدی خاڵ » خوا پاداشـتی هەمـوویان بداتەوە، خـوا پلەیان بەرزکـاتەوە، ئاسـتی نوسینەکانیان بەرزتربوو.

هەروەها، مامۆستا مەلا « موحەممەدی مەلا ساڵحی شارەزووریی » خوا لێی خۆشبێ، خوا پلەی بەرزکاتەوە، کە بە ڕاستیی هی ئەو

ـــ شەهیدبوو؟

لە ڕووداوێکدا، لە نێوچەی « بێتواتە »، لە تراکتۆر بەربۆوە، دوای ئەوەی، لە ڕژێمی « بەعس » قاچاغبوو، لە ئەوێ، خۆی ماندابوو و حەوابۆوە، کۆچیدواییکرد. خوای گەورە بە شەهیدی وەرگرتبێ.

بە تایبەتیی، مامۆستا مەلا « موحەممەدی شارەزووریی »، ڕەوتێکی نوێی، لە نێو پەرتووکخانەی کوردییدا داهێنا. بە زمانی ڕۆژ، بە زمانێکی هاوچەرخ، بە شێوازێکی مۆدرێن، داکۆکیی لە ئیسلام دەکرد. ئەوەبوو، چەن پەرتووکێکی وەک « گەشتەکەم لە گومانەوە بۆ باوەڕ، ڕێککەوت لە تەرازووی ژیرییدا، سرووشت لە تەرازووی ژیرییدا، داروین لە تەرازووی ژیرییدا، فرۆید لە تەرازووی ژیرییدا »، هەروەها، « مارکس لە تەرازووی ژیرییدا » بەڵام، چاپ نەکرا، ئەوانەی هەموو نووسی.

لێرەدا، گەر بیرەوەرییەکی مامۆستا مەلا « موحەممەدی شارەزووریی » بگێڕمەوە، خراپ نییە. لە « سولەیمانیی »، لە پۆلی سێ و چواری نێوەندیی و دوانێوەندیی بووم. زۆر هاتووچۆی پەرتووکخانەکانم دەکرد و پەرتووکم دەکڕی. ڕۆژێ، چوومە پەرتووکخانەیەک، مەلایەکم بینی، تەڕبووشی لە سەردا بوو. مەلا « موحەممەد » تەڕبووشی لە سەر دەنا. مامۆستایەکی زیت و وریابوو. نەمزانی، ئەوە کێیە؟ زۆرم پێ خۆشبوو، مامۆستای زیرەک و لەو جۆرانە ببینم. هەر چەندە، من تازە پێدەگەیشتم، بەڵام، دڵم پێیان خۆشدەبوو، کاتێ، مەلایەک، بە شێوەیەکی هاوچەرخ و لە ئاستی خەڵکی ڕۆژدا، باسی ئیسلامی دەکرد. من بە دوای لێکدانەوەیەکی « قورئان »دا دەگەڕام، لام وابێ، لێکدانەوەی « ڕوح ئەلمەعانی » بوو. مامۆستا مەلا « موحەممەد » منی نەدەناسی. دیارە، منیش ئەوم نەدەناسی. یەکەمین جاربوو، بیبینم. گوتی: هیچ پەرتووکی هاوچەرخت بۆ هاتووە؟ بە منیشی گوت: کاکە! پەرتووکی هاوچەرخ بخوێنەرەوە.

منیش قسەیەکم کرد و گوتم: مامۆستا! من بە خزمەت بەڕێزت نەگەیشتووم. بەڵام، مرۆ دەبێ، لە پێشدا، لە ئیسلامی ڕەسەن تێبگا، ئینجا، کەڵک لە ئیسلامی هاوچەرخ وەردەگرێ!

ئەویش، تەماشایەکی کردم و گوتی: ئەم قسەیە، بە قەدەر تۆ نییە! ئەم قسەیە، قسەیەکی گەورەیە، وایە؟ گوتی: تۆ کێی؟

گوتم: وەڵڵا، من قوتابیم، لە پەیمانگەی ئیسلامیی دەخوێنم. ئەدی بەڕێزت کێی؟

گوتی: من مەلا « موحەممەدی مەلا ساڵح »م.

گوتم: تۆ مامۆستای « شارەزووریی »ت؟

گوتی: بەڵێ.

ئیدی، گوتم: کاکە! من زۆر بە ئاواتەوەبووم، بە خزمەت بەڕێزت بگەم. تۆ خاوەنی فلان پەرتووک و فلان پەرتووکەی؟
گوتی: بەڵێ.
ئیدی لەو کاتەوە، یەکدیمان ناسی.
جا، هەر بە ڕاستیی، ئەو مامۆستایانە، ڕۆڵێکی گەورەیان بینیوە. بە بەرهەمەکانیان، کۆمەڵانی خەڵکیان هوشیارکردۆتەوە.
ئا لێرەوە، ڕەوتی ئیسلامی ڕامیاریی و « جیهادیی » درووستبوو. وەک گوتم: یەکەمین ڕیشسپیمان، کە ئێمە لە « هەڵەبجە »، کۆبوونەوەمان دەکرد، مامۆستا مەلا « موحەممەدی مەلا بەهاء »ی باوکی « سەلاحەدین » بوو. دوای ئەوەی مرد، ئەوی پتر ڕۆڵی ڕیشسپێتیی دەبینی، مامۆستا مەلا « موحەممەدی شانەدەریی » بوو، کە بە مامۆستا « شێخ موحەممەدی بەرزنجیی » ناسراوە و ئێستەش، پێشەوای « کۆمەڵی ئیسلامیی »یە. هەر ئەویش، یەکەمین ڕابەری ئاشکرای « بزووتنەوەی یەیوەندی ئیسلامیی » بوو. لە نێوان سالانی « 1984 - 1985 »یشدا، دەستی بە خەباتی چەکداریی کرد. پۆلە پێشمەرگەکانمان، بۆ ناوچەی « قەرەداغ » و شوێنەکانی دیکە دابەزین. پاشان، ئەوەبوو، مامۆستا مەلا « شێخ عەبدول لەتیف وازەیی »، خوا لێی خۆشبێ، چووە دەرێ. مامۆستا « شێخ موحەممەد »، شوێنەکەی خۆی بۆ چۆڵکرد.
هەڵبەتە، ئێمە ئەو تێبینییەشمان هەیە: تا ئێستە ڕەوتی ئیسلامیی، چەن جارێ، ڕابەر و کەسی یەکەمی خۆی گۆڕیوە. بە پێچەوانەی بـــرادەرانی « سیکولار »ەوە، هەر کەسێ، لە شوێنی خۆی دایکوتا، تا نەمرێ، واز ناهێنێ! دوای خۆشی، نۆرەی کوڕەکانی دێ! بەڵام، ئێمە وا نین. مامۆستا مەلا « موحەممەدی مەلا بەهاء »، دوای ئەوەی مرد، ئەوە بڵێین: منەتی تێدا نەبوو، مامۆستا « شێخ موحەممەدی بەرزنجیی » هات، ئێستەش لە ژیاندا ماوە. ئەویش، دوای ئەوەی، مامۆستا « شێخ عەبدول لەتیف » چووە دەرێ، یەکسەر، شوێنەکەی خۆی بۆ چۆڵکرد. گوتی: وەرە، خەڵک پێیان خۆشە، تۆ ڕابەریان بی. مامۆستا « شێخ لەتیف »یش، هێشتا، هەر لە ژیاندا بوو، کاتێ، مامۆستا مەلا « عوسمان »، لە « هەڵەبجە »وە چوو، برایان گوتیان: مامۆستا تۆ ڕیشسپیتری، مەلاکان و خەڵکەکەش، پتر دوای تۆ دەکەون، تۆ وەرە، شوێنی ئێمە بگرەوە، شوێنی خۆیان بۆ ئەو

چۆلکرد. دیاره، دوای ئەویش، ئەوەبوو، مامۆستا مەلا « عەلی » برای بوو! واتـــــــە: ئەو بزووتنەوە « جیهادیی »یە ڕامیارییە ئیسلامییە، تا ئێستە، چوار پێنج جار، کەسی یەکەمی خۆی گۆڕیوە. لەو سەرەتایەوە دەسپێکردووە. جا، بەڕێزت چی دیکەت دەوێ، پرسیاریکەی؟

ـ بەڵێ. بۆم ڕوونبۆوە، لە کوێوە دەسپێکردووە. بەڵام لە « کوردستان »دا، کەی یەکەمین گەرای ڕێکخستنی ئیسلامیی، وەک ڕێکخستن درووستبوو؟ وەک ڕێکخستن؟ وەک گوتم:

ــ مەبەستم ئەوەیە، کۆنگرەیەکیان گرتبێ، ناوێکیان لە ڕێکخراوەکە نابێ، سەرکردایەتییەکیان هەڵبژاردبێ.

بەڵێ. بێ گومان، هەر لە کۆتایی حەفتاکانەوە « 1978 - 1979 »، ئێمە هەموو جارێ، لە « سولەیمانیی و هەڵەبجە » کۆبوونەوەماندەکرد. واتە: کاکڵەیەک درووستبووبوو. بیرمان لەوە دەکردەوە، شتێ درووسکەین. ئەو کاتە، من ماڵم لە گوندی « سەرسیان » بوو، پێوەندییم هەر لەگەڵیاندا هەبوو. دوایی کاتێ لە ڕژێمی « بەعس »یش قاچاغبووم، ماڵم لە « گەڵووی ماخۆیزنان » بوو. برایان هەر دەهاتن و سەردانیاندمکردم. ئەو کاتەی، لە شـاریش بـووم، ئەوان هێندێکیـان چووبوونە دەرەوە. دەتوانم، بڵـێم: لە سـاڵی « 1984 - 1985 »دا، دوای ئەوەی، مامۆستا « شێخ موحەممەدی بەرزنجـیی » چووە دەرەوە، « لەشکری قـورئان »یان پێکهـێنا. واتە: ئەو لەشکرە، باڵی سەربازیی « بزووتنەوەی پەیوەندی ئیسلامیی » بوو.

هەڵبەتە، هێندێ کەس، لەگەڵ « لەشکری ئیسلامیی »دا، لێیان تێکەڵدەبێ. بەڵام، « لەشکری ئیسلامیی » ئەوەبوو، کە « عەبباس شەبەک » درووستی کرد و ساڵی «1981–1982 »، « یەکێتیی » چەکیکردن، ئەوە جیایە.

ــ بەڵێ، بەڵێ.

ئەوەبوو، دوایی، مامۆستا مەلا « عوسمان » خوا لێی خۆشبێ، لە نێوچەی « شارەزوور »، ئێمە لە نێوچەی « پشدەر و بیتوێن »، خەڵکی دیکەش، لە شـاری « سـولەیمانیی »یەوە، هەمـوو کـۆچمـانکرد. ناوی « بزووتنەوەی پەیوەندی ئیسلامیی »مان گۆڕی و بوو بە « بزووتنەوەی ئیسلامیی ».

دیارە، تا ئەو کـاتە، یەک دوو کـۆنگرەش بەسـرابوو. مـامـۆسـتـا « شێخ عەبدول لەتیف »یش ڕابەربوو. دوایی، کە مـامـۆستا مـەلا « عوسـمـان » چوو، ئەو کرا بە ڕابەر. دواتریش، هەڵبەتە کۆنگرە و شت دەبەسرا.

بەڵام، بە ڕاستیی، ڕێکخستنەکان، ڕێکخستنێکی زۆر پۆلایین و توندوتۆڵ نەبوون. واتە: وەک بڵێین: پتر پۆلە پێشمەرگەی چەکداربوون و هێندێ شانەی ڕێکخستنیشمان هەبوو. بەڵام، ئەو ڕێکخستنە توندوتۆڵ و پۆلایینە نەبوو. چونکە، وەک گوتم: بنچینەی دروستبوونی، ئەو ڕەوتە ئیسلامییە ڕامیارییە « جیهادیی »یە، بە شێوەی ڕێکخستنێکی پۆلایینی نێوەندیی، لە یەک قاڵبدا دەر نەهاتبوو. کۆمەڵێ خەڵک، هەست و نەستی ئیسلامیی، دژایەتییکردنی ڕژێمی « بەعس »، داکۆکییکردن لە گەلی زۆرلێکراو، پاڵپێوەنابوون و یەکیانگرتبوو. دەتوانم، بڵێم: ڕێکخستنی « بزووتنەوی ئیسلامیی »، پتر لەو کاتەوە دەسپێکرد، کاتێ بەندە، ساڵی « 1992 »، بەرپرسی « بیرۆی ڕێکخستن »م لە ئەستۆی خۆم گرت. لەو کاتەوە، بە شێوەیەکی وا ڕێکخرا، کە پتر لە سەر بنچینەی دروستکردنی شانە، پۆل، ڕێکخراو و نێوچە دامەزرا. ئەو کاتە، لەبری مەڵبەند، « هەرێم »مان بەکاردەهێنا. دیارە، وەک گوتم: پێشتر خەڵکێ هەبوو، بەڵام، لە بەر ڕۆشنایی بیر، بە یەکدییەوە بەند نەکرابوون. لەو کاتەوە، پتر ڕێکخستنەکانمان دروستبوون و دەستیانپێکرد.

ـ کەواتە دەتوانین، بڵێین: سەرەتای ساڵی « 1992 » بە سەرەتای دەسپێکردنی ڕێکخستنی چالاک و پتەو دادەنرێ!

وەک ڕێکخستنێکی بەهێز، لە سەر بناغەی بیر دامەزرابێ، یەک پرۆگرام و بەرنامەیەکی پەروەردەکراوی هەبێ. ئینجا، بە سەر « شانە، پۆل، ڕێکخراو، نێوچە و هەرێم »دا دابەشکرابێ، بەڵێ، لەو کاتەوە، دەسپێکردووە. چونکە، پێش ئەوە، هەر دەمان گوت: لە « سولەیمانیی »، ڕێکخستنمان هەیە. بەڵام، کێ و کێ بوون؟ ئینجا، یەکەی ڕێکخستنەکان چی و چی بوون؟ نەماندەزانی. چونکە، بەو شێوەیە ڕێک نەخرابوو، ڕێکوپێک نەکرابوو، تا بزانین.

پ11 : ئایا دەتوانی، لە دامەزراندن و گەشەکردنی « بزووتنەوەی ئیسلامیی لە کوردستان/عێراق »دا، ڕۆڵی خۆت، بە کورتیی باسکەی؟

و11: بەندە، لە کۆتایی حەفتاکاندا، لە تەمەنی « 18 - 19 » ساڵیدا بووم. هەر لەو کاتەوە، لەگەڵ ئەو مامۆستا و برایانەی، لە « سولەیمانیی و هەڵەبجە »، ڕۆڵی کاریگەریان هەبوو، پێوەندییمان بە یەکدییەوە هەبوو.

هەڵبەتە، لە ئێمەش بە تەمەنتربوون. وا ڕێکدەکەوت، من لە هەر شوێنێ بوومایە، گەنج و جۆرە خەڵکانێکم، لە خۆمان دەنالاند و کارم تێ دەکردن. وتارمدەدا، وانەم پێ دەگوتن. ئیدی، ئەوەش کارتێکردنی خۆی هەبوو. دەتوانم، بڵێم: هەر لەو کاتەشەوە، وردەوردە، تەوژم و ڕەوتێ، کە پتر بە کارتێکردنی نووسراو، بەرهەم، وتار و شتی بەندەدا بوون، پەیدابوون.
— بەڵێ.
مامۆستایانی دیکەی بەڕێزمان، خوا پلەی ئەوانەیان بەرزکاتەوە، کە کۆچیدواییانکردووە، ئەوانەشی ماون، خوا پاداشتیانبداتەوە، پتر باوەڕیان وابوو، تەنیا چەکمان کەمە. واتە: جیاوازیی بیرکردنەوەی من لەگەڵ ئەواندا، لێرەدا بوو! چونکە، ئەوان دەیانگوت: ئەو خەڵکە موسوڵمانە، تەنیا چەکی پێ بێ، هیچی دیکەی ناوێ.
منیش دەمگوت: نەخێر دەبێ، ئەو خەڵکە پەروەردەکرێن، تێبگەیەنرێن، سەرلەنوێ کەسایەتییان داڕێژرێتەوە. دەمگوت: گەر خەڵک، باوەڕی بە چەک هەڵگرتن نەبوو، دەبێ، دەسکاریی دەروونیان بکرێ، دەسکاریی چەمکەکانیان بکرێ، دەسکاریی ژیریی و تێگەیشتنیان بکرێ، نەک هەر هاتنەدەر، چەکێکیان بدرێتێ. یا، گرفت هەر ئەوە نییە، چەکیان پێ نییە، بەڵکوو، گرفتەکە لە شتی دیکەدا خۆی دەبینێتەوە. چونکە دەبێ، هاندەرێ هەبێ، وا لە مرۆ بکا، چەک هەڵگرێ، بە مەرجێ بزانێ، ئەو چەکە بۆ هەڵدەگرێ؟ لە کەیدا هەڵیدەگرێ؟ بۆ هێنانەدی چ ئامانجێ بەکاریدێنێ؟
جا، هەر لە سەرەتاوە، کەم و زۆر، بەندە، کارتێکردنی تایبەتیی خۆم، لە سەر ڕەوتی کاری ئیسلامیی هەبووە. ئەو کاتەی، لە شاریش بووم، برایان دەیانویست، بێنەوە بۆ ناوەوە و ڕۆڵی خۆیان ببینن، هەر بە ماڵی ئێمەدا دەهاتن. ئەوانەشی، لە ناوەوە دەیانویست، بۆ دەرەوە بڕۆن، هەر لە ڕێی ئێمەوە دەڕۆشتن. دیارە، ئەو کاتە، من لە گوندێ بووم، لای « گەڵووی ماخۆیزنان » حەوابوومەوە.
دوایی، وردەوردە، ئەو کارتێکردنە زیادیکرد. بە تایبەتیی، ئەو کاتەی چوومە دەرەوە و ساڵی « 1987 »، لە بناری « قەلاتووکان »ی زنجیرە چیای « قەندیل »، فرماندەیی هێزی « هەمزە »م پێ سپێررا.
ئێمە، هەر چەندە وەک بڵێی، تەنیا یەک هێز بووین، بەلام، لە هەمان کاتیشدا، وەک قوتابخانەیەک وابووین، هەر لەو کاتەوە، ئەو نامیلکانەی

ئێستەش چاپدەکرێنەوە، بۆ نموونە: « پێشمەرگەی ئیسلام ـ 1988، کۆمەڵی خوا ـ 1988، سۆزی نەتەوایەتی 1988 و کوردستان بۆ وێرانبوو و چۆن ئاوەداندەبێتەوە؟ ـ 1989 » هەر لە « قەلاتووکان » چاپکراون.
واتە: لەو کاتەوە، من پێم وابووە، دەبێ، کاری بکرێ، کۆمەلانی خەڵک تێگەیەنرێ، بەر چاویان ڕۆشنکرێتەوە، پەروەردەکرێن، بۆ ئەوەی، ئەو خەڵکەی تا ئێستە، ئایین و ژیریی ڕێیداوە، چەک بۆ ڕژێم هەڵگرێ، یا سیخوڕیی بکا، یا بۆ وێنە: ڕوو لە لایەنێکی « سیکولار » بکا، دەمگوت: ئەو خەڵکە دەبێ، ئەو تێگەیشتن و بیروباوەڕەی دەسکارییکرێ، وای لێ بکرێ، بە باوەڕەوە، کار بۆ ئیسلام بکا، نەک، تەنیا هەر، پارچە چەکێ بە شانیدا بکا، چونکە، تەنیا بەوەندە، کێشەکە کۆتایی نایەت!

پ12 : دوای ئەوەی، « بزووتنەوەی ئیسلامیی لە کوردستان » دامەزرا، ساڵی چەن توانی، وەک ڕێکخستنێ، خۆی بە جەماوەر بناسێنێ؟ بە شێوەیەکی ئاشکرا کاربکا و بە فەرمیی دانیپێدابنرێ؟
و12 : دیارە، پێش ڕاپەڕین، واتە: پێش ساڵی « 1991 »، زۆربەی خەڵکی « کوردستان »، ئێمەی ناسیبوو. چونکە، لە چەن نەبەردێکی دژ بە ڕژێمدا، بەشدارییمانکردبوو، هێندێ شەهیدیشمان دابوو. بۆ وێنە: لە نێوچەی « قەلاتووکان » لە سەر گردی « ڕەمکان »، کە ئەو کاتە خۆم، فرماندەی هێزی « هەمزە » بووم. هەروەها، لە نێوچەکانی « مەلەکان، خۆشناوەتیی، بۆسکان، شاربازێڕ، هەڵەبجە و هەورامان »یش، کۆمەڵێ شەهیدمان دابوو. لەبەرئەوە، خەڵک دەیناسین و دەیانزانی « بزووتنەوەی ئیسلامیی » هەیە.
سەرەتا، لەگەڵ برادەرانی « یەکێتیی » دانیشتین. ئەو کاتە، ئەوان، کاک دوکتۆر « فوواد » و کۆمەڵێکی دیکە بوون، ئێمەش، مامۆستا مەلا « عەلی، شێخ موحەممەد و بەندە » بووین. لام وایە، مەلا « شێخ لەتیف »یشمان لەگەڵ بوو. پاشان، لەگەڵ برادەرانی « پارتیی » دانیشتین. ئەوان، کاک « مەسعوود بارزانیی » و کۆمەڵێکی دیکە بوون، ڕێککەوتننامەیەکمان لەگەڵ ئیمزاکردن. هەروەها، لەگەڵ برادەرانی « سۆسیالیست »، لە گوندی « کاولان » دانیشتنمان هەبوو. کاک « ڕەسووڵ مەمەند و سەیید کاکە و ... » بوون. ڕێککەوتننامەیەکمان، لەگەڵ ئەوانیش ئیمزاکرد.

واتە: هەر ئەو کاتە، ئێمە، هەم لە نێو لایەنە ڕامیارییەکان، هەم لە لایەن خەڵک و جەماوەری « کوردستان »وە ناسرابووین.
بەڵام « بزووتنەوەی ئیسلامیی »، پتر لە گەرمەی ڕاپەڕینە جەماوەرییەکدا ناسرا. خۆتان ئاگادارن، ڕاپەڕین لە شارۆچکەی « ڕانیێ »وە دەسپێکرد، بۆیە، بە « دەروازەی ڕاپەڕین » ناودەبرێ. ئەو لیژنەیەی سەرپەرشتیی ڕاپەڕینەکەی دەکرد و خەڵکیان هاندەدا، پێنج کەس بوون. سیانیان، سەر بە ڕێکخستنی « بزووتنەوەی ئیسلامیی » بوون.
ــ دەتوانم، ناوەکانیان بزانم؟
ئێستە، بە تەواویی بیرمکەوتەوە. لە هەموو لایەنە ڕامیارییەکان، لیژنەیەکی « 11 » یازدە کەسی پێکهات. تەنیا « 5 » پێنج کەس لەوانە، سەر بە « بزووتنەوەی ئیسلامیی » بوون. لەو پێنج کەسە، ناوی سیانیانم لە یادماوە. یەکەمیان، کاک مەلا « سەیید حەسەنی گەناویی » بوو. ماوەیە لەمەوبەر، لە سەر لیستی « بزووتنەوە »، بەڕێوەبەری شارەوانیی « ڕانیێ » بوو. دووەمیان، کاک « حوسێن حەمەد گۆران » بوو. سێیەمیان، کاک مەلا « نیعمەتوڵڵا » بوو. دووانی دیکەش بوون، بە داخەوە، ئێستە ناوەکانیانم لە بیر نەماوە! هەرچی چۆنێبێ، ڕەنگە، لە کاتێکی ئاساییدا، بێنەوەیادم.
ئیدی، لە گەرمەی ڕزگارکردنی نێوچەکاندا بووین، کۆمەڵێکی دیکە شەهیدمان دا. دواییش، لە نێوچەی « کەرکووک، پردێ، کۆرێ » و لە چەن شوێنێکی دیکەش، دژی هێرشەکانی ڕژێم، « 15- 20 » شەهیدمان دا، تا ئێستەش، تەرمی هێندێکیانمان هەر نەدۆزیوەتەوە.
واتە: چ لە کاتی ڕزگارکردنی نێوچەکانی ژێردەسی ڕژێم و چ بەرانبەر هێرشەکانی ڕژێم، پێشمەرگەی « بزووتنەوەی ئیسلامیی »، ڕۆڵی چالاکانەیان بینیوە، قوربانیی باشیان داوە و شەهیدی زۆریان هەبووە. ئەو کاتەش، پتر برادەرانی « یەکێتیی » ڕۆڵیاندەبینی. بۆیە، برادەرانی « یەکێتیی »، ئەوانەی ئێمەیان دەناسی و ویژدانیان هەبوو، زۆر جار، گەواهیی ئەو ڕاستییەیان بۆ داوین. جا، هەر بە ڕاستیی، دوای ئەوەی، شۆڕشیش دەسپێکردەوە، هێندەی برادەرانی « یەکێتیی » قوربانییان داوە، هیچ کام لە لایەنە ڕامیارییەکان، هێندە قوربانییان نەداوە!
بە ڕاستیی، لە کاتی ڕاپەڕیندا، ئێمە هەموومان: برادەرانی « یەکێتیی، پارتیی، بزووتنەوە، سۆسیالیست و ... »، قسەی خۆمان بێ،

جیاوازییەکی زۆرمان نەبوو. واتە: لەو کاتەدا، ئێمە هەستماندەکرد، لە ڕووی هێـزی چەکدارەوە، وەک بڵـێی، خـۆمـان زۆر لە ئەوان بە کـەمـتـر نەدەزانی. هەروەها، برادەرانی « سۆسیالیست »، لە برادەرانی « پارتیی و یەکێتیی »، خۆیان لا کەمتر نەبوو. بەڵام دوای ئەوە، وا هاتەپێش، ئەوان زۆرترین. هەرچی چۆنێبێ، ئایا، ئەوان زیرەکتربوون، ڕێکخستنەکانیان بەهێزتربوو، ئەزموونی ڕامیارییان پتربوو. یا، ئەوان وەک سەرکردایەتیی ناسراوتربوون. یا، سەرکردەکانیان لێزانتربوون؟!! ئەوان پتر دەرکەوتن و گەشەیانکرد. ئەگینا، بە ڕاستیی، ئەو جیاوازییەی دوایی بینرا و ئێستە دەبینرێ، پێش ڕاپەڕین، هەسـتی پێ نەدەکرا. ئێـمـە ناڵێین: لە ئاسـتی ئەواندا بووین، بـەڵام، ئەو بەرزیی و نزمـیی، ئەو هەڵداوێـدایەی، دوایی پەیدابوو، بەو شێوەیە هەستی پێ نەدەکرا!

پ13 : زۆر چاکە. ئێستە دەمەوێ، دەربارەی ڕێکخراوە ڕامیارییە جیاوازە ئیسلامییەکانی « کوردستان »، شتێکم بۆ باسکەی. ئایا، چەن ڕێکخراو هەیە؟ بەپێی زانیاریی خۆت و بەگوێرەی مێژووی دامەزراندنیان، کەی درووستبوون؟ بۆ نموونە: « بزووتنەوە، یەکگرتوو، ئەنصار ئەلئیسلام و کۆمەڵی ئیسلامیی » و هەموو ئەو ڕێکخراوانەی دیکەی هەن.

و13 : پێشەکیی، دەربارەی کاری ڕێکخستنی « بزووتنەوەی ئیسلامیی »، شتێکم بۆ باسکردی، کە لە ساڵی « 1992 »ەوە، بە شێوەیەکی توندوتۆڵ و تۆکمە دەسپێکرد. ئیدی، دیارە بەڕێزت، وای لێ تێ نەگەیشتووی، کە مەبەستم لە کاری ڕێکخستنی ئیسلامیی لە هەموو « کوردستان »دا بووە؟
ــ نەخێر. ئەوە دیارە.

چونکە لە سەرەتادا، کاری ڕێکخستنی ئیسلامیی، « برایانی موسوڵمان » دەسیانپێکرد. پێشتر، کاری ڕێکخستنی « بزووتنەوەی ئیسلامیی »، وەک کـاری « بیـرۆی ڕێکخـستن » نەبوو. ئەگـینا، کـاری ڕێکخـستنیش هەر هەبوو. بەڵام، وەک « بیرۆیەکی ڕێکخستن » و بە سـەر چوار « هەرێم »دا دابەشکرێ، هەر هـەرێمێکیش، چەن نێوچە و چەن ڕێکخراوێ بگرێتەوە، ئەوە لەو کاتەوە بووە، کە بەندە « بیرۆی ڕێکخستن »ی لە ئەستۆگرت. لەو کـاتەوە، ئەو کـارانەی ڕێکخـستن کرا. ئەگینا پێشـتـر، ڕێکخـستنێکی پرشوبڵاومان هەبوو. بەڵام، بەو تۆکمەیی و توندوتۆڵییە نەبوو.

سەبارەت بە ڕێکخراوە ئیسلامییەکانی دیکەی درووستبوون، ئەوە، یەکەمیان دیارە، « بزووتنەوەی پەیوەندی ئیسلامیی » بوو، کە دواتر ساڵی « 1987 »، ناوەکەی گۆڕا و ئێستە بە « بزووتنەوەی ئیسلامیی » ناسراوە. پاشان، ئەوەبوو، لە مانگی « 1999/8 »دا، لە نێوان « بزووتنەوەی ئیسلامیی » و « بزووتنەوەی ڕاپەڕینی ئیسلامیی »دا، « یەکبوون »ێک درووستبوو، ناوی « بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامیی » بەسەردابڕا.

بەڕێزت ئاگاداری؟

ــ بەڵێ.

دوای ئەوە، مانگی « 2000/8 »، یەکەمین کۆنگرەی « بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامیی » بەسرا. ئەوەبوو، لە سەر ئەنجامی کۆنگرە، ئێمە لەگەڵ ڕابەری ئەوسای « بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامیی »دا، بە ئەنجام نەگەیشتین. هەر چەندە، هەموومان بەڵێنماندابوو، بە بڕیارەکانی کۆنگرەوە پابەندبین. بەڵام، مامۆستا مەلا « عەلی عەبدولعەزیز »، بە ئەنجامەکانی کۆنگرەوە پابەند نەبوو. بۆ؟ لەبەرئەوەی، جگە لە مامۆستا مەلا « صدیق »ی برای، کاک « ئیکرام »ی زاوای مامۆستا « صدیق »، هیچ کەسێ لەوانەی سەر بە مامۆستا مەلا « عەلی » بوون، لە کۆنگرەدا دەر نەچوون. ئیدی، لەو کاتەوە، ئێمە کێشەمان بۆ درووستبوو.

دوایی، ڕۆژی « 2001. 05. 31 »، ئێمەش « کۆمەڵی ئیسلامیی »مان ڕاگەیاند. ئێمە نالێین: « کۆمەڵەی ئیسلامیی »، چونکە، پێمان وایە، « کۆمەڵە »، لە زمانی عەرەبییدا، « مەجمووعە » دەگەیەنێ. « کۆمەڵ »یش، لە « جەماعە »وە وەرگیراوە. ئەوە ئەو زنجیرەیە بوو.

ــ بەڵێ.

دیارە، کاتێ ئێمە، « کۆمەڵی ئیسلامیی »مان ڕاگەیاند، ئەو خەڵکەی لەگەڵ مامۆستا مەلا « عەلی » مابوونەوە، هەر بە ناوی « بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامیی »یەوە کاریاندەکرد. دوایی، ئەوانیش ناوی خۆیان گۆڕی و کردیان بە « بزووتنەوەی ئیسلامیی ».

ــ بەڵێ.

کۆمەڵێکی دیکەش، بە ناوی « هێزی دووی سۆران » و بە بێلایەنیی مابوونەوە. پاشان ئەوانیش، ناوی « جوند ئەلئیسلام »یان، بۆ خۆیان هەڵبژارد.

ئەوەش پێش ئەوەبوو، لەگەڵ کۆمەڵەکەی مامۆستا « کرێکار »دا یەکبگرن. ئەو کۆمەڵەی لەگەڵ مامۆستا « کرێکار »یشدا بوون، دواتر، لەگەڵ کۆمەڵەکەی « جوند ئەلئیسلام »دا یەکیانگرت و « ئەنصار ئەلئیسلام »یان دروستکرد. ئەوە ئەوان لەوێ.

برایانی « یەکگرتوو »، ساڵی « 1994 » دروستبوون. دیارە، پێشتر وەک « ئیخوان »، لە ساڵی « 1991 »وە و دوای ڕاپەڕینە جەماوەرییەکە، دەسیان بە کار کردبوو. بەلام، بە ناوی « برایانی موسوڵمان » کاریان دەکرد. ئەو کاتەش، دوو هێڵ بوون: هێڵی مامۆستا « سەلاح » بە هێڵی یەک و هێڵی مامۆستا « صدیق » بە هێڵی دوو ناسرابوون. ئەوەبوو، دوایی هێڵی یەک، بە ناوی « یەکگرتوو »وە خۆیان ڕاگەیاند. هێڵی دووش، بە ناوی « بزووتنەوەی ڕاپەڕینی ئیسلامیی »یەوە، بە ڕابەرایەتیی مامۆستا « صدیق »ی برای مامۆستا مەلا « عوسمان » و ئەوان مانەوە. پاشان، لەگەڵ « بزووتنەوەی ئیسلامیی » یەکیانگرت و « بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامیی »یان پێکهێنا. ئێستەش، پاشماوەی زۆربەی ئەو ڕێکخستنە، واتە: زۆربەی هەرە زۆری « بزووتنەوەی ئیسلامیی » پێشووتر و « بزووتنەوەی ڕاپەڕینی ئیسلامیی »، کە دوایی « بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامیی »یان پێکهێنا، هەموویان لای ئێمەن!!!

ــ بەڵێ.

جگە لە مامۆستا مەلا « عەلی »، کوڕەکانی و هێندێ لە دەوروبەرەکەیان، پتر وەک خزمایەتیی و دۆستایەتیی خۆیان، لەگەڵیان ماونەتەوە، ئەگینا کادیرەکانی « بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامیی »، بە هەر دوو باڵەکەی « بزووتنەوە » و « ڕاپەڕین »یشەوە، ئێستە لە « کۆمەڵی ئیسلامیی »دا خۆیان بینیوەتەوە.

پ14: زۆر چاکە. ئایا دەتوانی، جیاوازیی نێوان ئەو لایەنانەی، ئەوڕۆ لە « کوردستان »دا هەن، وەک: « بزووتنەوە، یەکگرتوو، کۆمەڵ و ئەنصار ئەلئیسلام »، بە کورتیی، بۆم باسکەی؟ جیاوازییان چییە؟ بۆچی جیاوازن و لە چیدا جیاوازن؟

و14: بەڵێ. کاک دوکتۆر! دیارە، بە شێوەیەکی گشتیی، لە کاری ئیسلامییدا، سێ جۆر بۆچوون و تێڕوانین هەیە:

یەکەم ـ دەڵێ: ئێمە پێویستمان بە چەک و بەکارهێنانی هێز نییە. بەڵکوو، هەر لە ڕێی « بانگەواز، ڕێکخستن، تێگەیاندن و هوشیارکردنەوە »ی خەڵکەوە، کاری خۆمان دەکەین.
ــ ئەمە لە کام لایەندا خۆی دەنوێنێ؟
ئەوە لە برایانی « یەکگرتوو »دا خۆی دەنوێنێ.
ــ بەڵێ.
دووەم ـ بۆچوونێکی دیکە هەیە، دەڵێ: ئێمە پێویستمان بە « ڕێکخستن، کاری جەماوەریی، ڕاگەیاندن، تێگەیاندن و بەرچاوڕوونکردنەوەی خەڵک » نییە. بەڵکوو، ئەوەی ئێمە، پەکمان لە سەری کەوتووە، هەبوونی هێز و چەکە، دەسەڵاتی پێ بەدەسبێنین و قەوارەیەکی ئیسلامیی دامەزرێنین. ئەوەش بۆچوونی « ئەنصار ئەلئیسلام »ە.
سێیەم ـ بۆچوونێکی دیکەش هەیە، وەک من لە پەرتووکی « چەند ڕێڕوونییەک بۆ ئیسلامییەکانی کوردستان »دا، کۆمەڵێ بنچینەم داناوە، یەکێ لەوانە ئەوەیە، دەڵێ: « کاری ئیسلامیی، پێویستی بە بنکەیەکی جەماوەریی لەباوەشگر و هێزێکی چەکداری پارێزەر هەیە ». ئەوەش بۆچوونی « کۆمەڵی ئیسلامیی »یە.
بۆچوونی ئێمە ئەوەیە: بنچینەی کاری ئیسلامیی، لەگەڵ خەڵکە، بۆ خەڵکە و هەر لە نێو خەڵکیش دایە! بەڵام، لە هەلومەرجی ئێستەی جیهاندا، لە هەلومەرجی ئێستەی « کوردستان »دا، بۆ خۆت دەزانی، ڕەوشەکە چۆنە! کەسێ هێزێکی نەبێ، بە ڕاستیی، دەنگێکی زوڵاڵ، نێرانە و سەربەرزانەی نابێ، تا گوێی لێ ڕاگیرێ! هەلومەرجی ئێستەی « کوردستان، نێوچەکە و جیهان »یش وا دەخوازێ.
ئێستە، ئێمە تەماشادەکەین، « ئەمێریکا » لەبەرئەوە نییە، کوێخایەتیی بە سەر جیهاندا دەکا، چونکە، زۆر دێمۆکراسییە! یا، زۆر بە تەنگ مافی مرۆڤەوەیە! یا، زۆر بەهای بەرزبەرزی پێیە! بەڵکوو، لەبەرئەوەیە، نینۆکی لە نینۆکی، هەموو کەس درێژترە، کەڵبەی لە کەڵبەی، هەموو کەس تیژترە و دەسەڵاتیشی لە دەسەڵاتی هەموو کەس زیاترە. بە ڕاستیی، ئەوەیە وای لێ کردووە، بانگەشەی کوێخایەتیی بکا و وەک کوێخایەک خۆی بنوێنێ! جا، لە کەشوهەوایەکی ئاوای جیهانییدا، تۆ ناچاری، هێزت هەبێ، چەکت بە دەسەوە بێ، زیپکێکت هەبێ و زیرەک بی، تا لێت بسڵەمنەوە!

ئێمە، وەک « کۆمەڵی ئیسلامیی »، مەبەستی سەرەکیی کارەکەمان، خۆی لەوەدا دەبینێ: بنکەیەکی جەماوەریی، لە نێو خەڵکدا دروستکەین، تێیانگەیەنین، پەروەردە و هوشیاریانکەینەوە. بۆ زانیاریی بەڕێزیشت، ئێمە نامانەوێ، هەموو گەل لە پارتەکەی ئێمە کۆبێتەوە. چونکە مەحاڵە، گەل لە پارتدا جێیببێتەوە، گەل لە ئاییندا جێیدەبێتەوە. بەڵام، لە نێو چوارچێوەی بازنەی تەسکی پارتێکدا، چ پارتێکی « سیکولار » بێ، چ پارتێکی « ئیسلامیی » بێ، هیچ گەلێ جێی نابێتەوە. بەڵکوو، پارت دەبێ، هۆیەکبێ، دەبێ، پێشرەوبێ، دەبێ، بۆ کۆمەلانی خەڵک، قەڵغانبێ.
کاکڵی کارەکەی ئێمە ئەوەیە: خەڵکی خۆمان، لە ئایینی ئیسلام تێگەیەنین. ناشڵێین: خەڵکەکەمان موسوڵمان نییە. بەڵکوو دەڵێین: لە ئیسلام دوورکەوتوونەتەوە. بۆیە دەبێ، سەرلەنوێ، لە سەر بەرنامەکانی ئیسلام پەروەردەکرێنەوە، تێگەیەنرێنەوە و بەر چاویان ڕۆشنکرێتەوە.
بەڵام، لە هەمان کاتیشدا، چەکمان پێیە، لەبەرئەوەی ئێستەش، لە لایەکەوە، دوژمنەکانی گەلەکەمان، بۆمان لە بۆسەدان. لە لایەکی دیکەشەوە، بە ڕاستیی، هێندێ جار، برادەرانی « سیکولار »یش، ناتەباییمان لەگەڵ دەکەن، بە ویژدانەوە، لەگەڵمان ڕەفتار ناکەن، مافەکانمان پێشێلدەکەن. دەیانەوێ، لە پەراوێزدابین. هەر دوور نەڕۆین، ئێمە چەن ساڵە، گلەیی لە برادەرانی « پارتیی و یەکێتیی » دەکەین، کە ئەو بەڕێوەبەرایەتییە کوردییەتان بۆ دوولەتکردووە؟ بۆچی واتانکرد؟ ئێمە گلەییمان لە ڕژێمی « بەعس » دەکرد، گلەییمان لە « توورکیا » و کوێ و کوێی دیکە دەکرد، دەڵێین: « کوردستان »ی ئێمەیان، وەک گۆشتی خێر، بە سەر خۆیاندا بەشیوەتەوە. ئەدی باشە، گەر پارچە « کوردستان »ێکی خۆمان، بە دەسی خۆمان لەتکەین، دەبێ، گلەیی لە کێ بکەین؟!! کەچیی، ئەوەبوو، دوای هەشت ساڵ، ڕۆژی هەینی ڕابردوو، ئەندامانی پەرلەمانی « کوردستان » دانیشتنەوە. بە ڕاستیی، ئێمە دەسخۆشانەیان لێ دەکەین و زۆرمان پێ خۆشبوو.
ــ باشە. دوایی دێینە سەر ئەوەش.
دێینە سەری، باشە. بەڵام، مەبەستم ئەوەبوو، تەماشادەکەین، برادەرانی « پارتیی و یەکێتیی » دەیانەوێ، هەموو لایەنەکان بخەنە پەراوێزەوە!
ــ بەڵێ.

مەرج نییە، برادەرانی « پارتیی و یەکێتیی »، لەبەرئەوەی، لە خەڵکی دیکە بیریان باشترە، پتر کەڵکیان بۆ خەڵک هەیە و بەهای باشتریان پێیە، ئەو پایە و دەسەڵاتەیان دەسکەوتبێ. بەڵکوو، کۆمەڵێ هۆکاری دیکە هەن.
کەواتە: هیچ ڕەوا نییە، کاتێ، بەرنامەی هەر دوو پارتەکە، « پارتیی و یەکێتیی »، هەر دووکیان باسی « دیمۆکراسیی و سۆسیال دیمۆکرات » دەکەن، دیمۆکراسییش « فرمانڕەوایی گەل » بێ و بەو شێوەیەش ڕەفتار بکەن! گەل چی دەوێ؟ ئاخر ئێمەش، خۆمان بە نوێنەری توێژێکی زۆر، لەو خەڵکە دەزانین، گەر بێینە سەر باری ڕەواش، خەڵکەکە موسوڵمانە.
کەواتە: دەبێ، حسێبێکی زۆر، بۆ ڕێباز و ڕەوتـــــــی ئیسلامییەکانی « کـوردستـان » بکرێ، پەندیش، لە وڵاتە دەروردراوسێ و لە خـەڵکانی دیکەش وەرگیرێ، هەڵسوکەوتێکی بە ویژدانانە و ڕیاڵبینانە، لەگەڵ ڕەوتی ئیسلامییدا بکرێ. لەبەرئەوە ئێمە، لە ناچارییدا چەکمان پێیە.
بەڵێ، جا ئەو سێ ڕێباز و بۆچوونە، لە کاری ئیسلامیی « کوردستان »دا هەیە. واتە: کاری ئیسلامیی بێ چەک، کاری ئیسلامیی تەنیا بە چەک، کاری ئیسلامیی جەماوەریی و بە چەک.
ـ وا، هەر سێکیانمان زانی، نموونەشمان لە هەر سێ ڕێبازەکە وەرگرت. خۆشیان لە « یەکگرتوو، ئەنصار ئەلئیسلام و کۆمەڵی ئیسلامیی »دا دەبیننەوە. ئەدی، « بزووتنەوە » باوەڕی بە کام ڕێباز هەیە؟
« بزووتنەوە » کاتی خۆی، کە ئێمە هەموو لە « بزووتنەوە »دا بووین.
ـ من ئێستە دەڵێم، ئەورۆ؟
دیارە، ئێستە « بزووتنەوە »ش، بە شێوەی تیۆریی، وەک ئێمە بیر دەکەنەوە. بەڵام، مەرج نییە، بە کردەوە، بەو شێوەیە بن. ئەگینا، ئەوانیش، بە حسێب، هەم بڕوایان بە کاری ڕاگەیاندن، خەباتی نێو خەڵک و جەماوەر هەیە، هەم باوەڕیشیان بەوە هەیە، چەکیان پێبێ و هێزێکیان هەبێ.

پ**15** : کەواتە: دەتوانم، لەوەوە پرسیارێکی دیکە هەڵهێنجم: ئەویش ئەوەیە، پێوەندیی « کۆمەڵی ئیسلامیی » لەگەڵ « بزووتنەوە »دا چۆنە؟ بە تایبەتیی ئەورۆ، پێوەندیی ڕامیاریی، سەربازیی و هەموو جۆرە پێوەندییەکانی دیکەتان، لە چ ئاست و شێوەیەکدا خۆی دەبینێ؟

و15 : ئێمە، هەر کەس و لایەنێ، بۆ ڕازەکردنی ئەم گەلە، لە گۆڕەپانی «کوردستان»دا کاربکا، بە هاوسەنگەری خۆمانی دەزانین. بە مەرجێ بزانین، دڵسۆزە و کارێکی باش دەکا. چاوپۆشیی لە بیروباوەڕ، ئایدۆلۆژیا و ئەو جۆرە شتانەش بکە، بە تایبەتیی، لایەنێکی ئیسلامییش بێ، ئەوە بە دڵنیاییەوە دەڵێم: لە خۆمانیان بە نزیکتر دەزانین.
بڵێین، ئەوە وەک شتێکی تیۆریی وابوو. بەڵام، گەر لە ڕووی هەڵسوکەوتی ڕۆژانەوە تەماشاکەین، هەر چەندە، ئێمە ویستوومانە، هەنگاوی باش بنێین و هەنگاویشمان ناوە. کاتێ «کۆمەڵی ئیسلامیی»شمان ڕاگەیاند، بەڵگەی «شەرعیی، لۆژیکیی، ژیریی و بەرنامەیی» خۆمان هەبوو. بەڵام، وا دیارە، لایەنی بەرانبەر، کە خۆی لە مامۆستا مەلا «عەلی»، کوڕەکانی و دەوروبەرەکەیدا دەنوێنێ، بە ڕاستیی، زۆر نابرایی و ناتەباییان لەگەڵدا کردین. چونکە، تا ئێستە، چەن جارێ، پەلاماریانداوین، بۆسەیان بۆ داناوین، لە ڕێی «پێنجوین» چی و چییان کردووە. بەڵام ئێمە، هەر چاوپۆشیمان لێ کردوون، یەکێکیشیان لێ کوشتین، لەگەڵیان ڕێککەوتین، لەگەڵ ئەوەشدا، ئێمە باڵادەسبووین. چونکە، لە هەموو شوێنەکان، هەر لە «زاخۆ»وە بیگرە تا بە «کفریی» دەگا، هەموو بارەگاکان، بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکیی، لە دەس ئێمەدا بوون. ئەو کاتەش، هێشتا ئێمە، بە پیاوەتی خۆمان، «هەڵەبجە» و نێو «سیروان»مان بۆ بەجێهێشتن. هەڵبەتە، ئێستە ئێمە، لە هەموو ئەو جێیانە هەین. دوایش، ئێمە دەسپێشخەرییمانکرد، سەردانمانکردن، لە ڕاگەیاندنی خۆشماندا، من قەدەغەمکرد و گوتم: نابێ، بە یەک ووشە باسیانکەن، بە خراپە، باسی هیچ مەکەن، بە تایبەتیی، هەر نابێ، باسی مامۆستا مەلا «عەلی» و ئەوان بکەن. هەڵبەتە، ئەوان زۆر جار، بە دەس دەسدرێژیی و بە زمانیش زماندرێژیی زۆریان کردووە، ئێمەش، هەر چاوپۆشیمان لێ کردوون. دوایی، سەردانێشمانکردن، ئەوانیش دەبووایە، وەک دەسپێشخەرییەک، سەردانیانبکردینایەتەوە. ئەوەبوو، ئەوان هەر لە سەر ڕەوشی خۆیان بەردەوامبوون. ئێستەش، جارجار، لە ڕۆژنامە و بڵاوکراوەکانیاندا، شتمان لە سەر دەنووسن و قسەمان پێ دەڵێن. ئێمەش، مەگەر چۆن، لە نێوان دە جاردا، تەنیا یەک جار، گەر شتێکیان وەڵامبدەینەوە. لەبەرئەوە، ئەوان وا هەستدەکەن، ئێمە ناتوانین، وەڵامیانبدەینەوە!

له کاتی خۆیدا، زۆر له مامۆستا مەلا « عەلی » و دەوروبەرەکەی پاڕاینەوە و گوتمان: مامۆستا! ئێمە بە یەکەوە جوانین. ئێمە، هەموو داواکارییەکمان لە تۆ ئەوەیە، بە ڕاوێژکردن کاربکەی. بە بەرنامە و پرۆگرامەوە پابەندبی. ڕێزی خەڵک بگری. « بەیتولمال » هی هەموو لایە بێ. با، بە دادپەروەریی دابەشکرێ و کەڵکی لێ ببینین. ئیدی، ئەو گوێی بۆ نەگرتین.
دەمانگوت: مامۆستا! فلان کوڕت، لە « لەندەن » وا دەکا، ئەوی دیکەیان، لە فلان شوێن وایە و ئەوی دیکەشیان هەر وایە، دەسیانبگرە. بە قسەی نەکردین.
بە ڕاستیی، ئێمە، بۆ ئەوەی، ئابڕوومان نەچێ، بۆ ئەوەی، ئەو بارە ئیسلامییە نەپووکێتەوە و پووچەڵ نەبێ، بۆ ئەوەی، قسەی خەڵک، بە سەرماندا سوار نەبێ، ناچاربووین، « کۆمەڵی ئیسلامیی » ڕاگەیەنین. بۆیە، ماڵاواییمان لە مامۆستا و ئەوان کرد!
کاتێ، ماڵاواییشمان لێ کردن، مامۆستا و ئەوان، کاتی خۆی و پێش « بزووتنەوە »، چۆن بوون، قەبارە ئاساییەکەی خۆیان وەرگرتەوە! چونکە، مامۆستا مەلا « عەلی »، خەڵکی شارێ بوو، بە خوا ڕەنگە، ئێستە، لەوەش کەمتربووبێتەوە. ئێستە ئەوان، زۆر خۆیان پێ مەغدوورە و هۆکەشی بە هی ئێمە دەزانن. بەڵام، لە ڕاستییدا، خەتای خۆیان بوو. ئێمەش، وا دیارە و دەشتوانم، بڵێم: « بزووتنەوە ئیسلامیی »یەکەی کاتی خۆی، هەر لە شوێنی خۆی ماوە، بە ڕاستیی، بە ڕوویەکی گەشتر، بە گەشەکردنێکی زیاتر و بە ناوێکی دیکەشەوە، لە گۆڕەپانەکدا خەباتدەکا.
ــ ئێستە، پێوەندییتان چۆنە؟
ئێستە، هیچ پێوەندییەکمان نییە. بەو شێوەیە، وەک گوتم: ئێمە چەندین جار، دەسپێشخەریمانکردووە، ئەوان وەڵامی باشیان نەبووە. بەڵکوو، لە سەر قسەکردن و شتیش هەر بەردەوامن. ئێمەش، بێ دەنگییمان لێ کردووە. جارجارەش، ناڕاستەوخۆ، بە خەڵکی خێرخوادا، قسەیان بۆ دەنێرین و دەڵێین: با باسمان نەکەن. ئێمە پێمان خۆشە، برایەتییمان هەبێ و هاوکارییبکەین. بە لانی کەمەوە، گەر ئەوەشمان نەبێ، با باسی یەکدی نەکەین.
ــ ئەدی پێوەندییتان لەگەڵ « یەکگرتوو »دا چۆنە؟

لەگەڵ « یەکگرتوو »دا، کۆمیتەیەکی هاوکاریی هاوبەشمان هەیە و پێکەوە ڕێککەوتننامەیەکمان ئیمزاکردووە. ئەویش ئەوەیە: لە ڕووی ڕاگەیاندنەوە، هاوکارییبکەین، لە ڕووی ڕامیارییەوە، هەڵوێستمان یەکخەین. سەبارەت بە کێشە چارەنووسسازەکانیش، پرس بە یەکدی بکەین. هاتوچۆشمان هەیە، سەردانی یەکدی دەکەین، لە سەر ئاستی « پەلیبیرۆ »، لە سەر ئاستی مەڵبەند و ناوچەکان، پێوەندییمان باشە.

— پێوەندییتان لەگەڵ « ئەنصار ئەلئیسلام »دا، هەر لە سەرەتاوە تا ئێستە، چۆن بووە؟

ئێمە، هەر لە سەرەتاوە، تێبینییمان لە سەر « جوند ئەلئیسلام » هەبووە، کە دوایی، ناوی خۆیان بۆ « ئەنصار ئەلئیسلام » گۆڕی. تێبینییمان ئەوە بوو، دەمانگوت: ئێوە، بەڵگەی بوونتان نییە، پێویست ناکا، هەبن. ئەوا ئێمە، لەبەرئەوەی، مامۆستا مەلا « عەلی »، بە پرۆگرام، شوورا، بە ئەنجامی کۆنگرەوە پابەند نەبوو، باری نالەباری « بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامیی »ش، پاڵی پێوەناین و ناچاریکردین، ئەوە بکەین! بەڵام، ئێوە بۆ بە تەنیا کاردەکەن؟ وەرن، لەگەڵ ئێمە دانیشن، تا بزانین، چی چاکتان پێیە؟ فەرموون، بە بەڵگە هەموویمان پێ بسەلمێنن. چونکە، ئێمە هەموومان موسوڵمانین، گەر لەگەڵ ئێمە نابن، فەرموون، ئەوە مامۆستا مەلا « عەلی » و ئەوان هەن، گەر ئەوانتان پێ چاکە، هەر لەگەڵ ئەوان بن، کاتی خۆشی، هەر لەگەڵیان بوون. ئێوە، لەو نێوانەدا، خۆتان قووت مەکەنەوە، پاساوی بوونتان نییە. بەڵام، بە قسەیان نەکردین.

بە ڕاستیی، ئێمە، تێبینییمان لە سەر ئەو برایانە زۆرە. لە ڕووی بیرەوە ئەوەیە، خەڵکێکی ساکارن. واتە: ئێمە، بە نادڵسۆزیان نازانین، بە تایبەتیی، پێشمەرگەکانیان، بە ڕواڵەت خەڵکێکی دڵسۆزن. بەڵام، لە ڕووی تێگەیشتنیان بۆ ئاین، بە ڕاستیی ساکارن. واتە: شارەزاییەکی ئەوتۆیان نییە.

— حەزدەکەم، لێرەدا، باسێکی پێوەندیی خۆتان، لەگەڵ ئەواندا بکەی. چونکە، شتی دیکەمان هەیە، باسیکەین، دوایی دێینە سەری.

بە سەرچاو. ئێمە، ماوەیەک لەمەوپێش، ماوەیەکی زۆر، خەریکبووین، قسەمان لەگەڵ کردن، تا، لە نێو « کۆمەڵی ئیسلامیی »دا کاربکەن. دوای ئەوەی، چەن جارێ هەوڵماندا، هەر نەهاتن. ئیدی، بە فەرمیی

ڕامانگەیاند، کە هیچ وتووێژ و قسەیەکمان، لەگەڵ ئەو برایانەدا نەماوە، تا وەک « ئەنصار ئەلئیسلام »، بێنە نێو « کۆمەڵی ئیسلامیی »یەوە. بەڵام. هەر کەسێکیان بە تاکتاک بێ، وەریاندەگرین. بە شێوەیەکی بەردەوامیش، خەڵکیان لێ هاتووە. تا ئێستە، پتر لە « 110 » سەدودە کەسیان، بۆ لای ئێمە هاتوون. هەر کەسێکیان، واز لە بۆچوونەکانی خۆی بێنێ، کە ئێمە پێمان هەڵەن و دەسبەرداریبێ، ئێمە وەریدەگرین. لەبەرئەوە، پێوەندیی ئێمە لەگەڵ ئەواندا، دیارە، وەک موسوڵمان و برای ئایینیی، ڕێزی یەکدی دەگرین. بەڵام، هیچ پێوەندییەکی ڕامیاریی و سەربازیی، هیچ جۆرە شتێکی دیکەمان لە نێواندا نییە. هەڵبەتە، ئەو نێوچانەش، پتر ئێمە لێیان بەرپرسیارین.

ـــــ چونکە، کاتێ هاتین، هێندێ لە چەکدارەکانیانم بینی. برایان پیشانیاندام و گوتیان: ئەوانە « ئەنصار ئەلئیسلام »ن، کە لە نێوچەی ژێر دەسەڵاتی ئێوە دان!

بەڵێ. ئاساییە. ئەوان هەر کاتی خۆشی، ماڵەکانیان لێرە بوو. ئێستەش، ماڵەکانیان هەر لێرەیە. دیارە ئێمە، لەگەڵ « یەکێتی نیشتمانیی »، ڕێککەتننامەیەکمان لە نێواندا هەیە، کە ئەوان داوایانکرد و گوتیان: دەبێ، « 150 » کەسمان، بۆ « خورماڵ » بگەڕێتەوە.

گوتمان: فەرموون. ئێمە لارییمان نییە، وەرنەوە.

گوتیان: ئاخر، ڕەنگە گرفت درووستبێ!

گوتمان: ئەوە پێوەندیی بە ئێمەوە نییە. دێنەوە، فەرموون. ئێمە لە خزمەت داین. گرفت درووستدەبێ، فەرموون، خۆتان مەهێڵن، بە شێوەیەکی وا بێنەوە، درووست نەبێ. یا گرفت درووست مەکەن.

جا لەبەرئەوە، ئێستە خەڵکی « ئەنصار ئەلئیسلام »یش لە « خورماڵ » هەن. ڕێکخستنی « پارتیی و یەکێتیی » و خەڵکی دیکەش هەر هەن.

ــ بەڵام، پێکدادانیان لە نێواندا نییە؟

نەخێر. ئێمە نایەڵین. ئەو شتانە ببێ.

پ16: پرسیارێ هەیە، لێرەدا دەمەوێ، وەڵامەکەی بزانم. ئێوەی ئیسلامیی، واتە: « بزووتنەوە، یەککرتوو، ئەنصار ئەلئیسلام و کۆمەڵ »، لە ڕووی بیر و فەلسەفەوە، هەمووتان یەک سەرچاوەتان هەیە. ئەویش

چییه؟ قورئانی پیرۆزه، فەرموودەکانی پەیامبەرە، ئەم جۆرە شتانەیە. ئایا، ئەم شتانە، ئەم سەرچاوە گرنگ و پیرۆزانەی ئیسلام، ئێوە هان نادا، لە یەکدی نزیککەونەوە، ناکۆکییەکانی نێوان خۆتان، چارەسەرکەن، دید و بۆچوونەکانتان یەکخەن، ئەو خالانەی لە سەری ناکۆکن، دووری خەنەوە، لە بارییەرن؟!! گەر بە لانی کەمەوە نەشتوانن، یەک ڕێکخراوی یەکگرتووی ئیسلامیی لە « کوردستان »دا دامەزرێنن، بیر لەوە بکەنەوە، بەرەیەکی یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستانیی دامەزرێنن؟
و16 : کاک دوکتۆر! ئێمە، زۆر بیرمان لەوە کردۆتەوە. ساڵی « 1997 »، پەرتووکی « چەند ڕێڕوونییەک بۆ ئیسلامییەکانی کوردستان »م نووسیوە. پێم خۆشە، دوایی بەڕێزت تەماشایکەی. چەن پێشنیازێکم کردووە، بۆ ئەوەی، ئیسلامییەکانی « کوردستان »، لە یەکدی نزیکبنەوە. تا، بە یەکەوە برابن، پێکەوە تەبابن و هاوکارییبکەن، ئێمە، بە ڕاستیی، بۆ ئەوە هەنگاوێکی زۆرمان ناوە. دەسپێشخەرییمانکردووە. بەلام، چەپڵە بە دەسێ لێ نادرێ. کاتی خۆی، ئێمە بە یەکەوە بووین، لەگەڵ مامۆستا مەلا « عەلی » و ئەوان باسمانکردووە. لێرەدا ناتوانم، لە کاژێرێک و دوو کاژێردا، هەموویت بۆ باسکەم. ئەو هۆکارانەی ئێمەیان ناچارکرد، واز لەو ڕەوشەی ئەوێ بێنین و « کۆمەڵی ئیسلامیی » ڕاگەیەنین. ئەوە سەبارەت بە ئەوە.
سەبارەت بە برایانی « ئەنصار ئەلئیسلام »، هێندێ بیر و بۆچوونیان هەیە، ئێمە پێمان وایە، لە ڕووی « شەرعیی »یەوە هەڵەن و لە ڕووی ڕیالبینیشەوە، بە کەڵک نایەن. لە ڕاستییدا، ئێمە لێیان نزیکبووینەوە، بەلام، پێمان گوتن: بەو مەرجەی، واز لەو بیر و بۆچوونانەی خۆتان بێنن و ئەوانەی ئێمە، پەسەندکەن. ئەویش، لە سەر بنچینەی وتووێژ، بەڵگەهێنانەوە و گفتوگۆکردن دەبێ. فەرموون، با پێکەوە دانیشین و قسە بکەین. بۆ نموونە: دەمەتەقێمان لەگەڵیاندا هەبووە. ئەوڕۆ، هێندێ شتمان پێ گوتوون، زۆر لە سەر قسەکانی خۆیان سووربوون. کەچیی، دوای مانگێ، دوای دوو مانگ، باوەڕیان بە قسەکانی ئێمە هێناوە. بۆ وێنە:
دەیانگوت: لەگەڵ « یەکێتیی » درووست نییە، دانیشن و ئاشتیی بکەن. ڕەخنەیان لە ئێمە ئەوەبوو، دەیانگوت: بۆچی لەگەڵ « یەکێتیی » دادەنیشن؟ « یەکێتیی » پارتێکی « سیکولار »ی کۆمەڕای لە ئایین

هەڵگەڕاوەیە، بۆچی پارە لە « یەکێتیی » وەردەگرن و ئەوان دەتاندەنێ؟ چۆن دەبێ، لەگەڵ « یەکێتیی » ڕێککەوتننامەتان هەبێ؟ ئەو سێ ڕەخنەیەیان لە ئێمە هەبوو.

ـــ بەڵێ.

ئێمە هاتین، کۆمیتەیەکی هاوبەشمان پێکهێنا. دەستەی بەڕێوەبەری « شەرعیی » ئەوان و دەستەی « شەرعیی » ئێمە، پێکەوە دانیشتن. هەموو قسەکان تۆمارکراوە. دوو سێ کاژێر، دەمەتەقێ و وتووێژ کرا. برایانی ئێمە، بەڵگەیان بۆ هێنانەوە، تا بڕوانن، پەیامبەر « د.خ. » لەگەڵ هەموو میللەتەکاندا هودنەی کردووە، پەیمانی ئاشتیی ئیمزاکردووە و هەڵسوکەوتی لەگەڵدا کردوون. ئێمە ناڵێین: « یەکێتیی » یا « پارتیی »، یا ئەو پارتانەی دیکە، هەموویان هەڵگەڕاوەن و یەک بڕیاریان لە سەر دەدرێ. بێ گومان، چەندین جۆر خەڵکیان تێدا هەیە. هەڵگەڕاوەشیان تێدا هەیە، گاووری ڕەسەنیشیان تێدا هەیە، دەغەڵیشیان تێدا هەیە، موسوڵمانی هەڵخەڵەتاویشیان تێدا هەیە، هەموو جۆرێکیان تێدا هەیە. گریمان ئەوەی ئێوە ڕاستە، « یەکێتیی » پارتێکە، هیچ بەشێکی بە ئیسلامەوە نەماوە. بەڵام، پەیامبەر « د.خ. » لەگەڵ « جوو، فەلە »دا، لەگەڵ گاوور و هاوبەشپەیداکاراندا، لەگەڵ هەموو کەس و لایەنێکدا دانیشتووە، گفتوگۆیکردووە، ڕێککەوتننامە و پەیمانی مۆرکردووە. ئەوەی ئێوە دەیڵێین، لە کوێتان هێناوە؟!! پاشان، پەیامبەر لەگەڵ « قورەیش » ڕێککەوتووە، لەگەڵ « جوو »، لەگەڵ « ڕۆم » لەگەڵ کێ و کێی دیکەدا ڕێککەوتووە، ئەوە لە ڕووی ڕێککەوتنەوە بوو. لە ڕووی دانیشتنیشەوە، پەیامبەر لەگەڵ خەڵک دانیشتووە. سەبارەت بە پارە و تواناش، ئێمە ئەو پارە و توانایە، بە هی « یەکێتیی و پارتیی » نازانین. بە هی گەلی کوردی دەزانین. ئێمەش، بەشێ لەو گەلە پێکدێنین. چونکە، داهاتی « کوردستان »، خوا بۆ خەڵکی « کوردستان »ی ئەفراندووە، نەک تەنیا هەر، بۆ « پارتیی و یەکێتیی » ناردبێ! ئێمە پێمان وا نییە، « یەکێتیی » خێرمان پێ دەکا. هەر وەک چۆن، پێشمان وا نییە، گەر ئەو پارەیەی لای « پارتیی »یە، ئێستە نامانداتەوە و مافی خۆشمانە، ڕۆژێ لە ڕۆژان بمانداتەوە، خێری پێ کردووین! بەڵکوو، بە مافی خۆمانی دەزانین. پێشمان گوتوون: ئەو تێڕوانینەی ئێوە ڕاست نییە و بەڵگەشمان بە دەسەوە نەهێشتوون.

دوایی، کاتێ لەگەڵ « یەکێتیی »دا نێوانیان تێکچوو، لە سەر چی بوو؟ لە سەر ئەو پارەیە بوو، کە پێشتر بە ئێمەیان دەگوت: حەرامە وەریگرن! لە سەر ئەو ڕێککەوتننامەیە بوو، کە پێشتر بە ئێمەیان دەگوت: حەرامە ئیمزایکەن! چونکە، « یەکێتیی » ئامادە نەبوو، ڕێککەوتننامەیان لەگەڵدا ئیمزابکا. « ئەنصار » مانگانە، داوای « 800.000 » هەشتسەد هەزار دیناریان دەکرد، « یەکێتیی » ئامادە نەبوو، بیانداتێ. بەڵکوو دەیانگوت: کەمترتان دەدەینێ. ئەوانیش دەیانگوت: با ڕێککەوتننامەکە ڕاگەیەنین، بەڵام، « یەکێتیی » ئامادە نەبوو، ڕایگەیەنێ. واتە: ئەو ڕەخنانەی لە ئێمەیان دەگرت و دەیانگوت: نا« شەرعیی »یە، دوایی هەر خۆیان، لە سەر ئەو شتانە، لەگەڵ « یەکێتیی » بە ئەنجام نەگەیشتن و تێکچوون. لەبەرئەوە، لەگەڵ کۆمەڵێکی وادا، بەرەی چی درووستکەین؟!!

ـ من مەبەستم، تەنیا هەر لە « ئەنصار ئەلئیسلام » نییە. بەڵکوو، لەگەڵ ڕێکخراوەکانی دیکەی وەک: « یەکگرتوو، بزووتنەوە » و هەموو ئەو کۆمەڵ و گرووپە ئیسلامییانەی دیکەی، لە « کوردستان »ی خۆماندا هەن؟

وەڵڵایی، کاک دوکتۆر! هەڵبەتە، هەر شتە، شتی خۆی هەیە. ئێمە، لەگەڵ برایانی « یەکگرتوو »، گرفتێکی وامان نییە. ئەو برایانە، وەک بڵێی، هێندێ شتیان لە ئێمە جیایە. لەبەرئەوە ناتوانن، لەگەڵ ئێمە یەکگرن. بۆ نموونە: ئێستە ئەوان، بڕوایان بە چەکهەڵگرتن نییە. ئێمە، چەکمان پێیە. سبەینێ، گەر ئێمە شەڕێکمانکرد، ئەوان چەکیان پێ نییە، پێیان خۆشە، بەشدار نەبن. جا، لێکدانەوەکانمان، کەمێ لەیەکدی جیایە. بەڵام، ئێمە خاڵی هاوبەشی زۆرمان، لە نێواندا هەیە. من باوەڕم وا نییە، خەڵک هەمووی، لە یەک پارتدا کۆبێتەوە. جا، ئەو کاتە پێکەوە برابن. ئەو کاتە پێکەوە تەبابن و پێکەوە هاوکارییبکەن.

ـ کەواتە: گەر ناتوانن، لە یەک پارتـــدا کۆبنەوە، خۆ دەتوانن، بەرەیەکی ئیسلامیی کوردستانیی دامەزرێنن!

بەڵێ. ئێمە داواشمانکردووە. هەڵبەتە، نەک ئێستە، بەڵکوو، پێشتر داوامانکردووە و گوتوومانە: با ئێمە هەمووماندا، بەرەیەکی ئیسلامیی پێکبێنین. بەڵام، برایانی « یەکگرتوو »، ڕەنگە کاتی خۆی، ئامادە نەبووبن. دیارە، ئەو کاتە ڕەوشێکی دیکەیان هەبوو، ئەو ئامادەییەیان نەبوو. ئێستەش، ئیسلامییەکان بە تایبەتیی، ئەو ئیسلامییانەی

چەکیان پێیە، زۆر هەڕەشەیان لێ دەکرێ، بە تایبەتیی، « ئەمێریکا » زۆر هەڕەشەیان لێ دەکا. لەبەرئەوە، خەڵک ناوێرێ، لە ئێمە نزیککەوێتەوە. بە ڕاستیی، ئێمەش پۆزشیان بۆ دێنینەوە. بەڵام، گرنگ ئەوەیە، لە یەکدی تێگەیشتن، برایەتیی و تەبایی، لە نێوانماندا هەیە. ڕەنگە، هەلومەرجێکی دیکە بڕەخسێ، بۆمان بگونجێ، هەموو ئیسلامییەکان، لە بەرەیەکی یەکگرتووی کوردستانییدا کۆبینەوە.

ـ بەڵێ وایە.

بە ڕاستیی، ئێمە لە بەرنامەماناندا هەیە. ئەو شێوە تێگەیشتنەی ئێمەش، بۆ ئیسلام و بۆ کاری ئیسلامیی هەمانە، پێمان وایە، دەکرێ، وەک بناغەیەک، بۆ کۆکردنەوەی ئیسلامییەکان دانرێ. نەک، خەڵک بێتە لای ئێمە. واتە: دەگونجێ، ئیسلامییەکان هەموویان، لە سەر بناغەیەک کۆبنەوە، وەک بەڕێزت فەرمووت. گەر ڕێکخراویش نەبێ، بەرەیەک بێ.

ـ بەرەیەکی ئیسلامیی کوردستانیی.

بەڵێ. ئەو کاتە، بەو شێوەیە، لەگەڵ لایەنە ڕامیارییەکانی دیکە، هەڵسوکەوتدەکەین، بە دڵنیاییشەوە دەڵێم: بۆ ئەوانیش سەر سووکترە.

ـ ئێوەش، سەنگ و کێشێکی دیکەتان دەبێ.

بەڵێ. بۆ ئەوانیش، سەرسووکتردەبێ، گەر لەگەڵ ئیسلامییەکاندا، یەک قسەبکرێ. تازە « کۆمەڵی ئیسلامیی »یان ڕاگەیاندبوو. هەستمدەکرد، برادەرانی « یەکێتیی »، پێیان خۆشبوو، خەڵکی دیکەش خۆیان ڕاگەیەنن. بە « مام جەلال »م گوت: مەرج نییە، بەرژەوەندیی ئێوە لەوە دابێ، لایەنی ئیسلامیی زۆربن.

گوتی: چۆن؟

گوتم: بۆ ئێوە، وا سەرسووکتر و باشترە، یەک لایەنی ئیسلامیی هەبێ و یەک قسەبکا. ئەو کاتە دەزانن، هەڵسوکەوت لەگەڵ کێ دەکەن؟ بەڵام، گەر چەن لایەنێ هەبێ، دوایی، گەر یەکێکیان گورزێکی لێدان و شتێکی کرد، نازانن، کێ بووە؟ ناشتوانن، خەتایان بگرن. بۆ ئێوەش ئاڵۆزیی پەیدا دەکا، بۆ ڕەوشی « کوردستان »یش باش نییە و پشێویی دروستدەبێ. بۆ ئێمەش، هەر شتێکی باش نییە. بە ڕاستیی، ئیسلام یەک ئیسلامە. لەبەرئەوە، چوار پێنج دەنگ، چوار پێنج ڕەنگ و چوار پێنج هەڵوێست، شتێکی خراپە.

ــ هەڵبەتە، ئەوەش لێکدانەوەی تایبەتیی خۆی هـــەیە. دەتوانم، بڵێم: گەر لە ڕووی ڕامیارییـیـەوە، مـەبەسـتـی « پارتیی » یا « یەکـێـتـیـی » ئەوبێ، بیانەوێ، لە لایەکەوە، ڕێباز و تەوژمی ئیسلامیی لەتوپەتکەن، بۆ ئەوەی، بە شێوەیەکی گشتیی، لاوازبن و یەکگرتوو نەبن. لە لایەکی دیکەشەوە، ئەوەیە، وەک بەڕێزت فەرمووت!

پ17 : ئێستە، بەرەو بەشێکی زۆر گرنگ دەڕۆین. ئەویش، پێوەندیی بە فەلسەفەی ئیسلامەوە هەیە. حەزدەکەم، بەڕێزت، وەک « میری کۆمەڵی ئیسلامیی »، لە چەن ڕوویەکەوە، دید و بۆچوونی خۆتم بۆ ڕوونکەیتەوە. دیارە، بەڕێزت ئاگاداری، « موخەیەر و موسەیەر »، بە یەکێ لەو کێشە و باسە گرنگانە دەژمێررێ، کە لە نێو کۆمەڵانی خەڵکدا، زۆر باسدەکرێ. تۆ لە ڕوانگەی ئیسلامەوە، چۆن لەو دوو چەمکە تێگەیشتووی؟
و17 : کاک دوکتۆر! ئەوە چۆن دەتەوێ، لە نێو ئەو زەریا قووڵەی « قەزا و قەدەر »دا مەلەبکەی؟!!
ــ منیش دەزانم، ئەوە باسێکی زۆر قووڵ و دووروودرێژە. بەلام، بەگوێرەی تێگەیشتنی خۆت، بە کورتیی و بەپێی کات، تۆزێکم بۆ باسکە.
بەڵێ. کێشـەی ئەوەی، ئایا مرۆ ئازادە « موخەیەر »، یا خاوەنی ویستێکی ئازاد نییە « موسـەیەر » یا « موختار » یا « موجبر »؟ بە یەکێ لە هەرە کێشە ئاڵۆز و پڕ وردەکارییترین، کێشەکانی نێو بیروباوەڕی ئیسـلامیی دادەنرێ.
بە کورتیی: بۆچوونی بەندە لەو بارەیەوە، بۆچوونی چەن زانایەکـە، کە بە زانایانی « سوونـنە و جەمـاعەت » ناسراون. زۆربەی جەمـاوەری نەتەوەی پەیامبەریش « د.خ.» بە خەڵکی « سوونـنە و جەماعەت » دەژمێررێن. واتە: ئەوانەی، شوێن ڕێبازی پەیامبەر « د. خ. » کەوتوون، لەگەڵ کۆمەڵبوونی نەتەوەی موسوڵماناندا بووبن، نەک لەگەڵ دابڕدابڕبوونی بووبن.
بۆچوونی خەڵکی « سوونـنە و جەماعەت »، بۆ کێشەی « قەزا و قەدەر »، یا کـێـشـەی « جەبر و ئیـخـتـیار »، بە کورتیی ئەوەیە: مرۆ، بایی هێندە ئازادە، لە سەر چاکەکانی پاداشتبکرێ. هەروەها، بایی هێندە ئازادە، لە سەر خراپەکانی سزابدرێ. بەلام، مرۆ ئازادی ڕەها نییە. دیارە، لە ڕووی « شەرع »ەوە، مرۆ بە شێوەیەکی ڕەها ئازادە.

واتە: لە ڕووی « شەرعیی »یەوە، خوای پەروەردگار، ئازادیی بە مرۆ داوە و فەرموویەتی:(و قل الحق من ربکم فمن شاء فالیؤمن و من شاء فالیکفر)
واتە: بڵێ، ڕەوا لە پەروەردگارتانەوەیە، هەر کەسێ حەزدەکا، با باوەڕبێنێ، هەر کەسێکیش حەزدەکا، با گاووربێ.
واتە: هیچ کۆت و پێوەندێ، لە سەر مرۆ نییە. بە هەر لایەکدا بجوڵێ، لە ڕووی « شەرع »ەوە، بەو واتایەی « شەریعەت »ی ئیسلامیی، مافی ئەوەی بە مرۆ داوە، باوەڕبێنێ یا نەهێنێ، چاک بکا، یا خراپ بکا. بەڵام، کاتێ مافی ئەوەی پێ داوە، بەو واتایە نا، گەر چاکە، یا خراپە بکا، هەر بڵێ: دەس خۆشبێ. نەخێر، شتی وا نییە! بەڵام، لە « شەریعەت »ی ئیسلامییدا، خوای پەروەردگار فەرموویەتی: خۆشم « جەبر »م لە سەر مرۆ بەکار نەهێناوە. لەبەرئەوە، نە هیچ پەیامبەرێ بۆی هەیە، نە هیچ پێشەوا و سەرکردەیەکیش بۆی هەیە، خوای پەروەردگار زۆر بە ڕاشکاویی، بە پەیامبەری « د.خ. » فەرمووە: (و لو شاء ربک لامن من فی الارض کلهم جمیعا افانت تکره الناس حتی یکونوا مؤمنین.)
واتە: گەر پەروەردگارت بیویستایە، هەموو خەڵکی سەر زەویی، باوەڕیان دەهێنا. ئایا، تۆ زۆر لە خەڵک دەکەی، تا باوەڕبێنن؟ واتە: خوا بە خوایەتیی خۆی، بە ڕەوای نەزانیوە، زۆر لە بەندەکانی خۆی بکا، تا، بە تۆبزیی باوەڕبێنن. کەواتە: نەک هەر پەیامبەر « د. خ. » بۆی نییە، بەڵکوو، هیچ کەسێکی دیکەش، بۆی نییە، ئەو کارە بکا.
لە ڕووی « شەرع »ەوە، مرۆ ئازادیی تەواویی پێ دراوە. بەڵام، پێشی گوتراوە: گەر باوەڕبێنی، ئەوە پاداشتی باوەڕە. گەر بێ باوەڕیش بی، ئەوە سزای بێ باوەڕییە. بەڵام، بۆت هەیە، هەر دوو لا هەڵبژێری، هیچ بەربەستێ، لە بەردەم ویستی ئازادانەی مرۆدا نییە.
ئەو قسەیەی ئیمامی « عومەر » خوا لێی ڕازیبێ، قسەیەکە، لە مێژوودا بۆتە پەندێ. بە یەکێ لە کوڕەکانی « عەمری کوڕی عاص »ی گوتووە. ئێستە نازانم، ناوی چی بووە. فەرموویەتی: (متی استعبدتم الناس و قد ولدتهم امهاتهم احرارا.) واتە: لە کەیەوە، خەڵکتان کردووە بە کۆیلە؟ خۆ دایکیان بە ئازادیی دایناون! ئەوەش، لە باسی کابرای « قیبتیی »یەوە هاتووە. کوڕەکەی « عەمری کوڕی عاص »، پێشبڕکێی غارغارێنی ئەسپی لەگەڵ کردووە. ئەو کاتە، « عەمری کوڕی عاص »، والی « میسر » بووە.

وەک سەرۆک کۆماری ئێستە وابووە. ئەسپەکەی کابرای « قیبتیی »، پێش ئەسپەکەی کوڕەکەی « عەمر » کەوتووە. جا، کوڕەکەی « عەمر »، کابرای بەر قامچیی داوە و گوتوویەتی: (خذها و انا ابن الاکرمین.) واتە: بگرە، من کوڕی ژن و پیاوە بەڕێزەکەم. کوڕی والی « میسر »م.
کـابراش، لای « عـومـەری کـوڕی خـەتاب »، سکالایکردووە. ئەویش قامچییەکەی داوەتە دەس کوڕە « قیبتیی »یەکە. « قیبتیی » واتە: « فەلە » پێی گوتووە: لێیدە، لە کوێی داوی، لەوێی بدە، چۆنی لێداوی، وای لێدە.
ئەویش، بەر قامـچی داوە. دوایی گوتوویەتی: « ادرها علی صلعه عمر » واتە: « بۆ سەری باوکی عەمری وەرسووڕێنە. »
کوڕەکەش گوتوویەتی: هەر کوڕەکەی لێی داوم.
ئەویش فەرمووپەتی: ئاخر، بە هێزی باوکی لێی داوی!
جا، جگە لەو ڕستە ناودارەی « عومەر » فەرمووپەتی، لەو بارەیەوە، دەقی « قورئان و سووننەت »یش زۆرن، کە مرۆ ئازادە، بایی هێندەی پاداشت و سزای بدرێتەوە.
بەلام، لە ڕووی پێکهاتە و درووستـبوونەوە، بە ڕاسـتیی، مـرۆ ئازادیی ڕەهای نییە. وەک ئەوەی هەناسە نەدا، بژی، مرۆ بە دەس خۆی نییە، دلی بوەستێنێ. مرۆ گەلێ شتی دیکەی بە دەس نییە. بە دەس خۆی نییە، بتوانێ، نەنوێ. یا نەخوا. لەوانەدا، مرۆ زۆرلێکراوە، واتە: « موجبر »ە. گەلێ یاسای « گەردوونیی، فیزیایی، کیمیاویی و بیۆلۆژیی »، بە سەر مرۆدا دەسەلاتدارن و سەپێنراون. مرۆ ناتوانێ، خۆیان لێ دەربازکا.
بەلام، لە بەشێکی دیکەی کارەکاندا، مرۆ بۆ چاکەکردن و خراپەکردن، وەک خوای پەروەردگار فەرمووپەتی: (و هدیناه النجدین) واتە: ئێمە دوو ڕێمان پیشانداون. یا فەرمووپەتی: (إما شاکرا و إما کفورا.) واتە: چ دەتوانی، سوپاسگوزاریی، چ دەتوانی، سپلەیی.
کەواتە: کەسێ بلێ: مرۆ ئازادە، بە شێوەیەکی ڕەها نەیپێکاوە. چونکە، مرۆ بە دەس خۆی نییە، کە لەدایکدەبێ. مرۆ، کاتی لەدایکبوونی، شوێنی لەدایکبوونی، بە دەس خۆی نییە. هەروەها، ڕەنگی، ڕەگەزی، ڕەچەلەکی، گەلێ شتی دیکەشی، بە دەس خۆی نییە. کەواتە: مرۆ ئازادی ڕەها نییە.
بەلام دیسـان، مـرۆ ئەوەش نییـە، وەک « جـەبریی »یەکـان دەلێن: وەک پەڕەمریشکێ وابێ، لە بەردەم ڕەشەبایەکدا، هیچ توانا و ویستێکی نەبێ.

هەڵبەتە لێرەدا، سێ جۆرە دید و بۆچوونی جیاواز هەیە: بۆچوونێ تێپەڕاندووە، بۆچوونێ کورتیهێناوە، بۆچوونێکیش، هێڵی نێوەڕاستی گرتووە.
« جەبریی »یەکان دەڵێن: مرۆ هیچی بە دەس نییە. « قەدەریی »یەکان دەڵێن: مرۆ بۆ خۆی، کردەوەکانی خۆی دروستدەکا و خوا حەقی بە سەر کردەوەکانی مرۆوە نییە. زانایانی سەر بە « سووننە و جەماعەت »یش دەڵێن: نەخێر، مرۆ نە ئەوەیە، هیچی بە دەس نەبێ، نە ئەوەشە، هەموو شتێکی بە دەسبێ. بەڵێ، مرۆ شتی بە دەسە، چونکە، کردەوەی هەیە و شت وەردەگرێ. بەڵام، دروستکردنی نییە. ( الله خالق كل شئ .) واتە: خوا هەموو شتێ بەدیدێنێ. بەڵام، مرۆ بکەرە و کردەوەکانی خۆی ئەنجام دەدا. لە سەر ئەنجامدانیشیان، سزادەدرێ، یا پاداشتدەدرێ، (جزاء بما كانوا يعملون .) یا، (جزاء بما كانوا يكسبون.) خۆی کاریکردووە و بە دەسیهێناوە. بۆیە، سزا یا پاداشتی هەیە.
کەواتە: لە ڕاستییدا، ئەوە بۆچوونێکی ڕاستە، کە لەگەڵ ڕیالیزمدا بگونجێ، دیارە، منیش هەر ئەو بۆچوونەم هەیە.
— بەڵام، لە نێو خەڵکدا، شتێ زۆر باوە، هەمیشە دەڵێن: لەو ڕۆژەوە، مرۆ لەدایکدەبێ، تا دەمرێ، چ شتێکی بەسەردێ، لە خۆشیی و ناخۆشیی، لە چاکە و خراپە، هەمووی لە نێوچەوانی نووسراوە. گەر بەگوێرەی، ئەم قسە باوەی نێو کۆمەلانی خەڵک بێ، واتە: مرۆ، هەر شتێکی خراپە و تاوانێکیش بکا، گوناحی نییە!
کاک دوکتۆر! لێرەدا دەبێ، تەماشاکەین، نووسینەکە واتای چییە؟
— فەرموو.
ئەوەی خەڵک گوتوویەتی، دیارە، « شەرع » نافەرموێ، لە نێوچەوانی نووسراوە. بەڵام لە « شەرع »دا دەفەرموێ: هەموو شتێ تۆمارکراوە. خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (و كل شيء احصيناه في إمام مبين.) پەیامبەر « د.خ. » لە فەرموودەی « صحيح »دا فەرموویەتی: هەرچی کردەوەیەک ئێوە دەیکەن، تۆمارکراوە. نووسراویشە، دەچنە بەهەشت یا دۆزەخ.
لە فەرموودەیەکی « صحيحی بوخاریی »دا هاتووە: ڕۆژێ، هێندێ لە هاوەڵان، لە پەیامبەریان « د.خ. » پرسیوە: ئەی پەیامبەری خوا، ئایا ئەو

کردەوانەی ئێمە دەیکەین، لە لایەن خوای پەروەردگارەوە نووسراوە، یا نەنووسراوە؟ ئایا ئێمە لە بەهەشت، یا لە دۆزەخ شوێنمان بۆ دیارییکراوە یا نەکراوە؟ پەیامبەر « د.خ. » فەرمووویەتی: بەڵێ، کردەوەکانیش نووسراون و شوێنەکانیشتان بۆ دیارییکراوە.

گوتیان: (ففیماالعمل إذا؟) کەواتە: بۆ کاربکەین؟!! بۆچی بجوڵێین؟!!

پەیامبەر « د.خ. » ڕستەیەکی فەرمووە، زۆر جێی سەرنجە. فەرمووویەتی: (إعملوا فکل میسر لما هو خلق له.) واتە: کاربکەن، چونکە، هەر کامێکتان کاری ئەو شوێنە دەکا، کە بۆی دانراوە!

واتە: کردەوەکەی خۆت، چارەنووسی ئاوێنەی خۆت دەبێ، سەرەنجامی تۆ دەسنیشاندەکا، بە کردەوەکەی خۆتدا دەزانی، کوێت بۆ نووسراوە. خوا فەرمووویەتی: هەر کەسێ، بڕوای هەبێ و کردەوەی چاک بکا، بەهەشتم بۆ نووسیوە. هەر کەسێ گومڕاییبکا و خراپەی هەبێ، دۆزەخم بۆ نووسیوە.

من نووسینەکەی خوام لێ دیار نییە، بەڵام، کردەوەکەی خۆم لێ دیارە.

پەیامبەر « د.خ. » فەرمووویەتی: هەر کەسێ، بۆ کوێ نووسرابێ، کوێی بۆ دیارییکرابێ، کردەوەی ئەو شوێنە دەکا. کەواتە: بە کردەوە و هەڵسوکەوتەکانی خۆمدا دەزانم، خوای پەروەردگار، لە هەکبەکەیدا، چی بۆ من داناوە.

ـ کەواتە: من گوناحم نییە؟

با. چونکە، خوای پەروەردگار نووسیوێتی، تۆ بە ویستی ئازادانەی خۆت، ئەو کارە ئەنجامدەدەی و بە هۆیەوە، بە بەهەشت یا بە دۆزەخ دەگەی.

ـ بەڵام، پێش ئەوەی، من لەدایکبم، ئەوانەم هەموو بۆ نووسراوە!

بەڵێ. جا مامۆستایەکیش پێشبینییدەکا، لە سەرەتای ساڵەوە، بە فلان قوتابی دەڵێ: تۆ دەر ناچی و دەکەوی. یا، پێشبینییدەکا، فلان قوتابی یەکەم دەبێ. هەروەها، پێشبینییشدەکا، فلان قوتابی هەر وا دەردەچێ. مامۆستا خەتای چییە، کە دوایی یەکێکیان دەکەوێ، یەکێکی دیکەیان یەکەم دەبێ و ئەوی دیکەشیان دووەم دەبێ؟ ژیریی مامۆستا، بە هۆی کردەوەکانیانەوە، تەنیا ڕاستیی ئاشکرادەکا. چونکە، کردەوەکانیان دەبینێ. تەماشادەکا، ئەوەیان خاووخلیچکە، باش گوێ لە وانەکانی ناگرێ، باش نایاننووسێتەوە و هەوڵ نادا، فێربێ. دەڵێ: گەر ئاوا بڕۆی، تۆ دەکەوی. بە ئەوی دیکەشیان دەڵێ: تۆ گەر ئاوا بەردەوامبی، یەکەم

دەبێ. خوای پەروەردگاریش هەر وایە. جا خۆ، ئەوەی مامۆستایەک، دەربارەی قوتابییەکانی دەیزانێ، درووسکارێکیش دەبێ، دەربارەی درووسکراوەکانی خۆی، زۆر لەوە پتر بزانێ!

پ18 : بەڵێ وایە. باشە، بە لای بەڕێزتەوە، ئیسلامی ڕاستەقینە کێیە؟ چۆن پێناسەی ئیسلامی ڕاستەقینە دەکەی؟
و18 : دیارە، مەبەست لە موسوڵمانی ڕاستەقینەیە؟
ــ بەڵێ. موسوڵمانی ڕاستەقینە.
چونکە، ئیسلام بەرنامەکەیە و موسوڵمانیش، ئەو کەسەیە بە بەرنامەکەوە پابەنددەبێ.
ــ بەڵێ، ڕاست دەفەرمووی.
ئەوە وەڵامی کورت و وەڵامی تێروتەسەلیشی هەیە. وەڵامە کورتەکەی ئەوەیە: موسوڵمانی ڕاستەقینە، ئەو کەسەیە، بە ڕاستیی لە ئیسلام تێگەیشتبێ و بە ڕاستییش، لە خودی خۆیدا، لە چوارچێوەی ماڵ و خێزانیدا، لە پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکانیدا، لە چوارچێوەی ئەو کۆمەڵگەیەی تێیدا دەژی، پیادەیکردبێ. ئەوە بە کورتیی. بەڵام، گەر وەڵامی درێژتریشت بوێ، بێ گومان، کاتی پتری دەوێ.
ــ ئەوەی من بیستوومە و لە بەرهەمێکی خۆشمدا نووسیومە، دەڵێن: لە پەیامبەریان پرسیوە، موسوڵمانی ڕاستەقینە کێیە؟ فەرموویەتی: ئەو کەسەیە، کە دەڵێ: « امنت بالله و ملائكته و كتبه و رسله و باليوم الاخر و بقدره و خيره و شره من الله تعالى).
کاک دوکتۆر گیان! با ئەوەیانت بۆ باسکەم. ئەوە فەرموودەیەکی « صحیح »ە. ئیمامی « عومەر » خوا لێی ڕازیبێ، گێڕاوێتییەوە. ئیمامی« موسلیم »، لە فەرموودەی « صحیح »ی خۆیدا هێناوێتییەوە، زۆر لە خاوەن پەرتووکەکانیش، کە فەرموودەی پەیامبەریان « د.خ. » کۆکردۆتەوە، هێناویانەتەوە. کورتەکەی ئەوەیە: ڕۆژێ، پەیامبەر « د.خ. »، لە نێو هاوەڵەکانیدا دانیشتووە. لە جەنگی « تەبووک »، لەگەڵ « ڕۆم »ەکاندا بووە. بەڵام، جەنگەکە ڕووی نەداوە و بە ڕێککەوتن کۆتاییپێهاتووە. گوتوویەتی: پیاوێ هات، (شدید بیاض الثیاب، شدید سواد الشعر .) واتە: بەرگەکەی زۆر سپیبوو، مووەکانیشی زۆر ڕەشبوون.( لا یری علیه

اثر السـفـر.) نیشـانـەی کـۆچکردنی پێوە دیار نـەبوو. واتە: تۆز و خـۆڵی ڕێوبانی لێ نەنیشتبوو، ئارەقی نەکردبۆوە. هات و لە نزیک پـــەیامبەرەوە « د.خ. » دانیشت. گوتی: ئەی « موحەممەد !»، پێم بڵێ، ئیسلام چییە؟
پەیامبەریش « د.خ. » فەرمووی: ئیسلام لە شایەتمان بە خوا و پەیامبەر پێکهاتووە. ( اشـهـد ان لا اله الا الله و اشـهـد ان مـحـمـدا رسـول الله) هەروەها، لە ڕۆژێکدا، پێنج جـار نوێژبکەی. زەکـات بدەی. ڕۆژوو بگری. حەجی ماڵی خوا بکەی. فەرمووی: ئەوە ئیسلامە.
کابرا گوتی: ئەدی « ئیمان » چییە؟
فـەرمـووی: « ئیـمـان »یش ئەوەیە: بڕوا بە خـوا، بە فـریشـتـەکـانـی، بە پەرتووکەکانی، بە پەیامبەرەکانی، بە ڕۆژی دوایی، بە قەزا و قەدەر بێنی.
ـــ ئەوەی من باسمکرد.
ئەوەی بەڕێزت باستکرد، ئەوە پێناسەی « ئیمان » بوو.
دوای ئەوە، پرسیاریکرد: ئەدی « ئیحسان » چییە؟
فەرمووی: « ئیحسان »یش ئەوەیە: بە شێوەیە خوا بپەرستیی، پێت وا بێ، خوا دەبینی، یا، خـوا تۆ دەبینێ. لێرەدا، لە کۆتایی فەرمـوودەکەدا هـاتووە و دەڵێ: پەیامبـەر « د.خ. » فـەرمـووی: (إن هذا جبريل اتاكم يعلمكم امر دينكم.) واتە: ئـەوە « جوبریل » بوو، هـاتبـوو، کاروباری ئایینەکـەتانی پێ ڕاگەیاندن. زانایان لێرەوە، ئەو ئەنجامەیان دەسکەوتووە، کاک دوکتۆر!
ـــ بەڵێ.
دەڵێن: کەواتە، ئایین یا بەرنامـەی خوا، لە سێ بەش پێکهاتووە. بەشێکی ئاشکرایـە: ئیـسـلامـەتییـە، « شـایـەتمـان، نوێژ، ڕۆژوو، زەکات و حـەج »، ئەمانە هـەموویان ئاشکران. درووشمن، پابەندیین، نوێژ هێما و درووشمی پێوەندیی نێوان خـەڵک و خوایە. « زەکـات » هێمـایە و درووشـمـی نێوان خـەڵک و خەڵکە و دەبێ، قازانجی لە خەڵکەوە بۆ خەڵک بێ و دەسگیرۆیی هەبێ. « حـەج » کۆبوونەوەیە، لە ڕووی ڕامـیـارییـیـەوە، پێوەندیی نێـوان خـەڵک و کـۆمـەڵگە دیاریـیـدەکـا. ڕۆژوو لە ڕووی گـیـانەوە، هـەروەها، شایەتمانیش دیارە، دەربڕین و ڕاگەیاندنە.
بەشی دووەمی ئایین، پێوەندیی بە دەروونی خەڵکەوە هەیە، ئەویش بڕوایە. بڕوا بە خـوا، بە فریشتـەکانی، بە پەرتـووکەکانی، بە پەیامبـەرەکانی، بە ڕۆژی دوایی، بە قەزا و قەدەری. ئەوانەش، کەس نایانبینێ.

بەشی سێیەمی ئایینداریی: « ئیحسان »ە. لە « ئیسلام و ئیمان » شتێکی زیادە نییە. « ئیحسان » واتە: ئیسلامێتییەکەت چاککەی، گەر نوێژتکرد، نوێژەکەت چاکبێ. بڕوات بە خوا باشبێ. بڕوات بە فریشتەکان باشبێ. هەروەها، « زەکات »دانەکەت باشبێ. بەلام، لێرەدا ئەوەی پەیامبەر« د.خ.» لەو فەرموودەیەدا باسیکردووە، هەمووی لە ئایینداریی تاکەکەسیی پێکهاتووە، کاک دوکتۆر!

ـــ بەڵێ.

ئەوە ئایینداریی تاکەکەسییە، خۆی لە « شایەتمان، پێنج فەرزەی نوێژ، زەکات، حەج، ڕۆژوو و ئیحسان »دا دەبینێ.

ئەدی فرمان بە چاکە و ڕێگرتن لە خراپە؟ ئەدی جیهادکردن؟ ئەدی داکۆکییکردن لە نیشتمان و وولات؟ ئەدی چەسپاندنی دادپەروەریی؟ ئەدی ڕاوەستان بەرانبەر زۆرداریی و خراپە؟ ئەدی لەسەرکردنەوەی لێقەوماوان؟ ئەدی یارمەتییدانی هەژاران؟ ئەدی پێوەندیی لەگەڵ دەوڵەتان؟ ئەوانە چییان لێهات؟ ئەوانە بە ئایینداریی کۆمەلایەتیی ناودەبرێن. چونکە، کاک دوکتۆر! ئایینداریی و موسوڵمانێتیی دوو بەشە، ئەوە ڕاستییەکە پێویستە، ڕوونکرێتەوە. زۆر لە موسوڵمانانی جیهان، لە نێویاندا گەلەکەی خۆشمان، بە باشی لەوە نەگەیشتوون.

هەڵبەتە، وەک گوتم: ئایینداریی و موسوڵمانێتیی، دوو بەشە: بەشێکی وەک تاک، پێوەندیی بە دەروونی مرۆڤ خۆیەوە هەیە. بەشێکی وەک تاکێ لە نێو کۆمەڵدا، پێوەندیی بە مرۆڤەوە هەیە. زۆربەی موسوڵمانان، بەشی یەکەم نابینن، کە دەڵێن: موسوڵمانێتیی و ئایینداریی چییە؟ دەڵێن: وەڵڵا، خۆی لە « شایەتمانهێنان، نوێژکردن، ڕۆژووگرتن، زەکاتدان، حەجکردن و بڕواهێنان »دا دەبینێ. کەسانی « سۆفیی » و خاوەن ڕێبازەکانیش دەڵێن: پاککردنەوەی دەروون و ناوهێنانی خوایە. ئەوانە هەموویان ڕاستن، ئەوانە هەموویان ئایینداریی تاکەکەسین. بێ ئەوانە، مرۆ ناتوانێ، موسوڵمان بێ. بەلام، ئایا موسوڵمانێتیی، لێرەدا کۆتاییدێ؟! گەر موسوڵمانێتیی لێردا کۆتاییپێبێ، ئەدی ئەوەی خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (اليوم اكملت لكم دينكم ) واتە: ئەورۆ ئایینەکەم بۆ تەواو کردن. باشە، ئایینی تەواو، ئەوەیە چارەسەری کێشەی نەتەوایەتییم بۆ بکا، چارەسەری کێشەی ئابووریيم بۆ بکا، چارەسەری کێشەی ڕامیارییم

بۆ بکا، چارەسەری کێشە کۆمەڵایەتییەکان بکا، چارەسەری کێشە فەرهەنگییەکان و کێشەی ڕەوشت بکا. واتە: دەبێ، چارەسەری هەموو کێشەکان بکا. بەڵام، ئەوەی پێشتر، بە تەنیا باسکرا، چارەسەری ئەو بوارانەی تێدا نییە. کەواتە: ئیسلامەتیی هەر ئەوە نییە. بەڵکوو، ئەوە ئایینداریی تاکەکەسییە.

بەشی دووەمی ئایین: ئایینداریی کۆمەڵایەتییە، یا، ئەو یاسا و دەستوورانەی، وەک تاکێ لە نێو کۆمەڵدا، ڕوو لە مرۆ دەکەن. من چەن وێنەیەکت بۆ دێنمەوە: یەکێ لەوانە، خوای پەروەردگار فەرموویەتی: « یا ایها الذین امنوا، کتب علیکم القتال) واتە: ئەی خاوەن باوەڕەکان! جەنگتان لە سەر پێویستکراوە. کاتێ، دوژمنێ هێرش بۆ سەر وڵاتی تۆ دەکا، دەبێ، خۆت بەدەسەوەبدەی، یا دەبێ، بەرهەڵستییبکەی؟

ــ وا وردەوردە، هاتینە سەر ئەو باسە گرنگە!

ئایا، بە تەنیا، جەنگ دەکرێ؟ نەخێر. « جیهاد » و جەنگ فەرزێکە، موسوڵمانان دەبێ، هەموو پێکەوە ئەنجامیبدەن. یا، خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (و السارق و السارقە فاقطعوا ایدیهما.) واتە: دەسی ژن و پیاوی دز ببڕن. ئایا، ئەو بڕیارە، بە تاکەکەسێ جێبەجێدەکرێ؟ نەخێر.

ــ نەخێر. دەسەڵاتی دەوێ.

یا فەرموویەتی: ئەوانەی ڕێگریی دەکەن، ئەوە سزاکەیانە. یا ئەو سزایە، بە تەنیا و بێ بوونی دەسەڵات جێبەجێدەکرێ؟ نەخێر.

یا فەرموویەتی: (امرت لاعدل بینکم.) واتە: دادپەروەریی بچەسپێنن. دادپەروەریی، بە تەنیا چۆن دەچەسپێ؟ دەبێ، دادگەیەک هەبێ.

یا فەرموویەتی: « کی لا یکون دولە بین الاغنیاء منکم.) واتە: با ماڵ و دارایی، لە دەسی دەوڵەمەندەکاندا کۆ نەبێتەوە و چینایەتیی درووست نەبێ. باشە، چۆن کارێکی وا بکەین، لە ڕووی ئابوورییەوە، چینایەتیی درووست نەبێ؟ بە تاکەکەسێ دەکرێ؟ ئایا، گەر هەر کەسێ، بە ئارەزووی خۆی ئازادبێ، وەک لە ڕژێمی « کەپیتالیزم »دا هەیە، هەر کەسێ بە ئارەزووی خۆی، چ جۆرە کارێ دەکا، با بیکا، بێ ئەوەی، گوێ بە « حەڵاڵ و حەرام » بدا، بێ ئەوەی، گوێ بە زیانگەیاندن بە کۆمەڵ و گەل بدا، دەکرێ؟ نەخێر. لەبەرئەوە دەبێ، سیستێمێ هەبێ. پاشان، ئەو هەموو یاسا و دەستوورانەی ئیسلام، کە پێوەندیی بە دابینکردنی ڕێوبان،

دابینکردنی پێویستییەکانی ژیان و باری خەڵکەوە هەیە، خەڵک پەروەردەکردن لە سەر ئایین، بروا و ئیسلام، بڵاوکردنەوەی رەوشتی چاک، بەرز و پەسەند، رێگرتن لە زۆرداریی، ستەم و خراپە، ئەوانە چۆن جێبەجێدەکرێن، گەر سیستێمێکی فرمانڕەوایی و گەر کۆمەڵگەیەک نەبێ؟!!
کەواتە: کورتەی قسەم ئەوەیە: کاتێ، زۆربەی خەڵک دەڵێن: ئاینداریی و موسوڵمانێتیی، واتە: بروا، یا شەیەتمان، یا نوێژ و رۆژوو، ئەوە بە راستیی، بەشێکی پچووکی ئاینداریی پێکدێنێ. هەڵبەتە، لە رووی قەبارەی ئیسلامێتییەوە، بە بەشێکی پچووکی دادەنرێ. ئەگینا، لەو رووەوە، بەشی هەرە گرنگییەتی و هەر کەسێ ئەوەی نەبێ، بە موسوڵمان ناژمێررێ.
بەڵام، پانتایی بڕیارە ئیسلامییەکان، پانتایی « شەریعەت »ی ئیسلامیی، بە راستیی، پتر بە کۆمەڵ جێبەجێدەکرێ، بە دەوڵەت هەڵدەسووڕێ، بە گەل بە ئەنجامدەگەیەنرێ، بە هەرەوەزیی سەردەگرێ.

پ19: ئاخر، من بۆیە، پرسیاری پێشووم کرد، خاوەن بروا کێیە؟ ئیسلام چییە؟ تا، جیاوازیی لە نێوان ئیسلام و ئیسلامیی رامیارییدا بزانین. هەموومان دەزانین، گەر یەکێ لە رێکخراوێکی ئیسلامییدا ئەندام نەبێ، هەر بە موسوڵمان دادەنرێ. ئەو کەسەی لە رێکخراوێکی ئیسلامییشدا ئەندام بێ، چەکی لە شان کردبێ، لە رێی خوا و پەیامبەردا « جیهاد » بکا و خۆی بە کوشتبدا، هەر موسوڵمانە. بەڵام رەنگە، ـ لای خۆی و لای رێکخراوەکەی وابێ ـ خۆی بە پلەیەک بەرزتر بزانێ، لەو موسوڵمانەی لە رێکخراوێکی ئیسلامییدا ئەندام نەبێ. چونکە، بە کردەوە، کار بۆ ئیسلام دەکا. تۆ ئەو جیاوازیی و بۆچوونە، چۆن دەبینی؟
و19: کاک دوکتۆر! لێرەدا پێویستە، دوو شت روونکرێتەوە:
یەکەم: زاراوەیەک هەیە، من تێبینیم لە سەری هەیە. بە دڵنیاییشەوە دەڵێم: بە هەڵەی دەزانم. ئەوەش زاراوەی « ئیسلامی رامیاریی »یە.
ـ چۆن؟
بەرێزت ئاگاداریی و دەزانی، هەر کاتێ، شتێ بە ئاوەڵناوێ باسکرا، وەک « ئیسلامی رامیاریی »، ئاماژە بۆ چەندێتیی ئەو باسکراوە دەکا.

« ئیسلامی ڕامیاریی »، ئیسلامی ناڕامیاریی، ئیسلامی بیریی، ئیسلامیی « جیهادیی »، ئیسلامی نا« جیهادیی ». لەبەرئەوە، ئەو زاراوەیە هەڵەیە. چونکە، یەک ئیسلام هەیە، وەک خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (و رضیت لکم الاسلام دینا.)
زاراوەی « ئیسلامی ڕامیاریی »، نەیارانی ڕەوت و تەوژمی ئیسلامیی، بە سەر ئیسلامییەکاندا دایانبڕیوە. ئێمە دەبێ، بڵێین: ڕامیاریی ئیسلامیی. ئیسلامی جوڵاو و نەجوڵاومان هەیە. ئیسلامێ خەباتدەکا و ئیسلامێ خەبات ناکا. ئیسلامی هەڵساو و ئیسلامی دانیشتوومان هەیە. ئیسلامی هەڵخزاو و ئیسلامی ڕاپەڕیومان هەیە. بەڵام، « ئیسلامی ڕامیاریی » و « ئیسلامی ناڕامیاریی »مان نییە. چونکە، یەک ئیسلام هەیە. بەڵام، ڕامیاریی ئیسلامیی و ڕامیاریی نائیسلامییمان هەیە. چونکە، ڕامیاریی بەشێکە لە ئیسلام. هەر لایەنی ئابووریی، لایەنی کۆمەلایەتیی، لایەنی بیر، بەشێ لە ئیسلام پێکدێنن. بەشێکە لەوەی، ئیسلام بایەخی پێداوە و نەخشەی بۆ داناوە. ئەوە کێشەیەکە، ئێمە، چەن ئیسلامێکمان نییە، یەکێکیان ڕامیاریی و ئەوەی دیکەیان ناڕامیاریی بێ! ئێمە، تەنیا یەک ئیسلاممان هەیە. بەشێ لەو ئیسلامە، « ڕامیاریی »یە.
« ڕامیاریی » واتە: سەرپەرشتیکردنی کاروباری خەڵک، بەڕێوەبردنی کاروباری وولات، مشوورخواردن.
سەبارەت بە ڕاستیی دووەم: مرۆڤی ئیسلامیی و نائیسلامیی، موسوڵمانی ئیسلامیی و نائیسلامیی، پێویستە، ڕوونیکەمەوە، ئەوەیە: زۆر جار، لە گوتارەکانمدا گوتوومە: ووشەی ئیسلامیی، دوو چەمک و واتای هەیە: چەمکێکی گشتیی، هەموو موسوڵمانێ « ئیسلامیی »یە. هەموو موسوڵمانێ، باوەڕی بە ئیسلام هەبێ، بە بەرنامەی ژیانی خۆی بزانێ، بڕوای بە خوا هەبێ، پەروەردگار و پەرستراوی بێ، بڕوای بە « موحەممەد ـ د.خ.» هەبێ، پەیامبەری خوایە، هەموو موسوڵمانێ، بەو چەمکە ئیسلامییە. واتە: بڕوای بە ئیسلام هەبێ، بەرنامەی ژیانی بێ، ئەو موسوڵمانانە هەموو، بە پیر و گەنج، ورد و درشت، ئەوەی لە ڕێکخراوێکی ئیسلامییشدا کاربکا، ئەوەی لە ڕێکخراویشدا کار ناکا، تێیدا بەشدارن. ئەوە واتایەکی ووشەی « ئیسلامیی » بوو.
ـ بەڵێ.

واتای دووەمی: بە واتای ڕێکخراوەیی و پارتی « ئیسلامیی » دێ. واتە: کەسێ لە ڕێکخراوێکدا، لە پارتێکی ئیسلامییدا، خۆی ببینێتەوە. ئەمەش، بە کارکردنی پارتایەتیی و ئەوی دیکەشیان، سەر بە ئایین و باوەڕ دێ.

هەموو موسوڵمانێ، پێوەندییەکی ئایینیی خۆی هەیە. بە پێوەندیی ئایینیی و باوەڕ، هەموو موسوڵمانەکان، بە « ئیسلامیی » دادەنرێن. وەک چۆن، هەموو کۆمۆنیستەکان، کۆمۆنیست و « مارکسیی »ن. واتە: هەموو « مارکسیی »یەکان، دوای « مارکسیزم » کەوتوون. هەروەها، هەموو دیمۆکراسییەکان، دوای « دیمۆکراسیی » کەوتوون. بە هەمان شێوەش، هەموو موسوڵمانەکانیش، دوای « ئیسلام » کەوتوون. هەموو موسوڵمانەکانیش، « ئیسلامیی »ن.

بەڵام، واتای پێوەندیی ڕێکخراوەیی و پارتایەتیی، پێوەندیی ڕامیاریی، دیارە، تەنیا بە ئەوانە دەڵێن، کە لە لایەنێکی ئیسلامییدا کاردەکەن. لێرەدا، هەر ئیسلامییەک، بە واتای دووەم. واتە: بە واتای لایەنێکی ئیسلامیی، پێی وابێ، لەبەرئەوەی، لە ڕێکخراوێکی ئیسلامیی دایە، لە خەڵکێکی دیکە چاکترە، ئا ئەو خۆ پێ چاکبوونەی، بەڵگەیە لە سەر ئەوەی، کە خراپە! چونکە، بە پێچەوانەی ئایەتی خواوە ڕەفتاردەکا. خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (فلا تزکوا انفسکم هو اعلم بمن اتقی.) واتە: خۆتان بە چاک مەزانن، خوا دەزانێ، کێ خاوەن « تەقوا »یە. خۆ پێ چاکبوون، بەڵگەی خراپبوونە.

زۆر جار، لە سەر پێپیلکەی مزگەوتی « جیهاد » لە شاری« سولەیمانیی »، بە ڕاشکاویی گوتوومە: ئامۆژگاریی خۆم و هەموو خوشک و برایەک دەکەم، لەبەرئەوەی، لە لایەنێکی ئیسلامیی دایە. خۆی لەو خەڵک و کەلە موسوڵمانە، بە چاکتر نەزانێ. بەڵکوو دەبێ، بە کردەوە، بە هەڵوێست، بە ڕاژەکردن بیسەلمێنێ، لەوان ڕاژەکارترە و ئەوانیش گەواهیی چاکیت بۆ بدەن. نەک، خۆت بانگەشەی چاکیی خۆت بکەی. خۆ پێ چاکبوون، خراپە. چاکەکردن باشە. بەڵام، خۆ چاککردن، بە قسە شتێکی خراپە.

کەواتە: ئیسلامی ڕامیاریی یا مرۆڤی ئیسلامیی و نائیسلامیی، لام وابێ، لە ڕوانگەی ئێمەوە، چەمک و واتاکەی، بۆ بەڕێزت ڕوونبۆوە؟!!

ــ بەڵێ، بۆم ڕوونبۆوە. بەڵام، ئەوەی ئەوڕۆ، پتر لە نێو خەڵکدا باوە و لێی تێگەیشتوون، ئەوەیە: دوو جۆر تێگەیشتن، بۆ ئەو کێشەیە هەیە:

یەکێکیان ئەوەیە: ئەو موسوڵمانانەی، لە ماڵی خۆیان و لە مزگەوت، خواپەرستیی دەکەن، خۆیان بە بنچینە سەرەکییەکانی ئیسلامەوە بەستۆتەوە، بە ئیسلامی ڕامیاریی، ناو نابرێن.
بەڵام، ئەو موسوڵمانانەی، لە ڕێکخراوێکی ڕامیارییدا کاردەکەن، پێیان دەگوترێ: ئیسلامی ڕامیاریی. جا، جیاوازییەکەیان، لە چیدا خۆی دەبینێ؟ لەوەدا خۆی دەبینێ، ئەمان، پەنا بۆ بەر کاری ڕێکخستن دەبەن. پروپاگەندەی چاک بۆ خۆیان و خراپ بۆ دوژمنەکانیان دەکەن. کۆمەڵانی خەڵک، بۆ « جیهاد » هاندەدەن. جەنگی نێوخۆ دەکەن، هەر وەک پارتەکانی دیکەش هەوڵدەدەن، دەس بە سەر دەسەڵاتدا بگرن. ئەمە خۆی لە خۆیدا، واتای « ئیسلامیی ڕامیاریی »یە و ئەوڕۆ، بەو شێوەیە، باس دەکرێ.
بەڵام، ئەو موسوڵمانانەی، وەک بەڕێزت ڕوونتکردەوە، ئەوانەی لە ماڵی خۆیاندا، یا لە مزگەوتەکاندا نوێژدەکەن، موسوڵمانێکی خواپەرستن و هیچ جۆرە پێوەندییەکیان، بە کاری ڕامیاریی و پارتایەتییەوە نییە. بە لای منەوە، زۆربەی خەڵک، بەو شێوەیە، لەو چەمکە تێگەیشتوون.
کاک دوکتۆر! هەر موسوڵمانێ، لە ئایین تێگەیشتبێ، لە ئیسلام تێگەیشتبێ، ناتوانێ، بەشداریی ڕامیاریی نەکا. ناتوانێ، خەم لە گەلەکەی خۆی نەخوا. خۆی، ڕامیاریی واتای چییە؟ واتە: مشوورخۆریی، خەمخواردن، هەوڵدان بۆ ئەوەی، باری ژیانی خەڵک، کۆمەڵگە و گەل باشتربێ، بە شێوەیە، بۆ خۆی بە ڕاستی بزانێ. جا، هەر موسوڵمانێ، یا لە ماڵی خۆشی بێ، ئێمە بە مەرجی ناگرین، موسوڵمانێ، کاتێ کاری ڕامیاریی ئیسلامیی دەکا، دەبێ، هەر لە لایەنێکی ئیسلامییدا بێ!
من بۆم باسکردی، لە درێژەی باسی سەرگوزشتەی ژیانی خۆمدا، هەر لەو کاتەوە، من بە ئیسلام ئاشنابووم، لە ئایینەکەم وا تێگەیشتبووم و ئێستەش، هەر باوەڕم وایە، بێ ئەوەی، لە هیچ لایەنێکی ئیسلامییدا بووبم، پێم وابووە، وەک چۆن، لە سەرم پێویستە، پێنج فەرزە نوێژبکەم، لە سەریشم پێویستە، باسی زۆرداریی و ستەمی ڕژێمی « بەعس »یش، بۆ ڕۆڵەکانی گەلەکەم بکەم. باسی ئەوەش، بۆ ئەو خەڵکە بکەم، وەک چۆن خوای پەروەردگار، نوێژ و ڕۆژووتان لێ داوادەکا، ئەوەشتان لێ داوادەکا، دژی ئەو ڕژێمە بن، داکۆکیی لە گەلی خۆتان بکەن، داکۆکیی لە وڵاتی

خۆتان بکەن، دژی ستەم و خراپە بن. واتە: مەرج نییە، تۆ کار و چالاکیی ڕامیاریی، تەنیا لە چوارچێوەی پارتێکی ئیسلامییدا بکەی. ئێستە، ئێمە زۆر خەڵکمان، لە « سولەیمانیی و هەولێر » هەیە، کەسایەتییەکی ئیسلامیین، پیاوی ڕامیاریشن، ئێمە، وەک لایەنێکی ئیسلامیی، پرس و ڕاوێژیان پێ دەکەین. ئەوانیش، ئامۆژگارییماندەکەن، وەک چۆن، کوردایەتیی بە ڕێکخراوە نەتەوەییەکانەوە نەبەسراوەتەوە، کاری ئیسلامییش، بە پارتە ئیسلامییەکانەوە گرێ نەدراوە. بۆ نموونە: بەڕێزت، کاتی خۆی، لەگەڵ برادەرانی « پاسۆک » بووی. ڕەنگە ئێستە، لە هیچ ڕێکخراوێکی ڕامیاریی کوردییدا نەبی. بەڵام، ڕەنگە، زۆر ڕاژەش بکەی، ڕێکخراوە ڕامیارییەکان نەیکەن! لە پەرتووکەکانتدا هەستدەکەم، هەموو ڕێکخراوەکان هەڵدەسەنگێنی، ڕەخنەیان لێ دەگری، چاکەکانیان دەڵێی، خراپەکانیان ناشارێتەوە و خەوشەکانیشیان پیشاندەدەی، بۆ ئەوەی ڕاستیکەنەوە! ئەوە لە کاتێکدا، تۆ لە هیچ ڕێکخراوێکی ڕامیاریی کوردییشدا نیت و ڕۆڵی خۆشت دەبینی. کاری ئیسلامییش، هەر بە هەمان شێوەیە. مەلایەک، کاتێ لە سەر پلیکانەکەی گوتاردەدا، ڕاستیی دەردەبڕێ، ڕاستییەکانی ئیسلام دەخاتەڕوو و گەلەکەی ئاگاداردەکاتەوە، ئێمە دەڵێین: ئەو مامۆستایە، کاری ئیسلامیی خۆی دەکا. ئینجا، باسی هەموو کێشە و گرفتەکانی گەلەکەی دەکا، خاڵ لە سەر پیتەکان دادەنێ و دەس بۆ دەردەکان ڕادەکێشێ. ئەوە هاوکاریی لەگەڵ ئێمە دەکا. ئەوە هاوکارییەکە، بۆ ئەو کارە ڕامیارییە ئیسلامییەی، ڕێکخراوە ئیسلامییەکان دەیکەن.

پ20 : ئەدی، ئازایەتیی لە ئیسلامدا چی دەگەیەنێ؟ بە باوەڕی تۆ، موسوڵمانێکی ئازا و نائازا، چۆن لە یەکدی جیادەکرێنەوە؟

و20 : ئازایەتیی لە ئیسلامدا، ئەوەیە: ئەوەی خوا فەرموویەتی، مرۆ بتوانێ، لە هیچ شتێ نەسڵەمێتەوە، بیڵێ. مرۆ، بەپێی توانای خۆی هەوڵ بدا، بێ پرینگانەوە و سڵەمینەوە ئەنجامیبدا. واتە: هەم بە قسە، هەم بە کردەوە، ئەوە بڵێ و بکا، کە خوا پێی خۆشە. بە دڵنیاییەوە، ئەوەی خواش پێی خۆشە و فرمانی پێ کردووە، لە ڕاژەکردنی خەڵک و گەلیش دایە. ئەوە ئازایەتییە.

پەیامبەر « د.خ. »، چەمکی زۆر لە ووشەکانی فراوانترکردووە، دەسکاریی کردوون و بە جۆرێکی دیکە دایڕشتوونەتەوە. بۆ وێنە: پەیامبەر « د.خ. » پرسیاریکردووە و فەرمووویەتی: (اتدرون من الصرع؟) واتە: دەزانن، پاڵەوان کێیە؟ زۆرانباز کێیە؟

ئەوانیش گوتوویانە: ( من یصرع الناس.) ئەو کەسەی خەڵکی لە زەویی دەدا.

فەرموویەتی: (الصرعه لیس شدید بصرعته و انما شدید من یملک نفسه عند الغضب.) پاڵەوان ئەو کەسە نییە، خەڵکی لە زەویی دەدا، بەڵکوو، ئەو کەسەیە، لە کاتی تووڕەبووندا، خۆی دەگرێتەوە.

واتە: کاتێ تووڕەدەبێ، جڵەوی دەروونی خۆی توندەکا، نایەڵێ، لە ڕەوا دەرچێ. هەر وەک چۆن، کاتێکیش، ترس ڕووبەڕووی دەبێتەوە، دیسان نایەڵێ، لە ڕەوا دەرچێ، لەبەرئەوەی، ترسێ ڕووبەڕووی بۆتەوە، ناڕەوا بڵێ، یا لەبەرئەوەی ڕقیەهەڵساوە، ناڕەوا بڵێ.

بە کورتیی: ئازایەتیی لە پێناسەی ئیسلامدا، ئەوەیە: چ بە قسە و چ بە کردەوە، مرۆ سنوورەکانی « شەرع » نەبەزێنێ. نە لە بەر گوشاری دەرەکیی و خەڵک، شتێکی ڕەوا بە ژێر لێوەوە بکا، کە پێویستە بگوترێ. نە لەبەرئەوەی، ڕقیشی لە خەڵک هەستاوە، شتێ بڵێ، کە لە « شەرع » بەدەربێ و لە « شەرع »دا نەبێ!

پ21 : « جیهاد » چییە؟

و21 : واتای « جیهاد »، لە جەنگ فراوانترە. چەمک و واتای « جیهاد »، واتە: « بذل اقصی ما فی الوسع » ئەو پەڕی توانا بەکاربێنرێ. جا، ئەو پەڕی توانای دەربڕین بێ، ئەو پەڕی توانای ماڵیی بێ، ئەو پەڕی توانای جەستەیی بێ، هەمووی دەگرێتەوە.

پەیامبەر « د.خ. » فەرموویەتی: (جاهدوا المشرکین باموالکم و السنتکم و قلوبکم.) لەگەڵ بێ باوەڕەکاندا، بە ماڵ و سامان، بە زمان، بە دڵ « جیهاد » بکەن. کەواتە: بە دڵ و زمانیش « جیهاد » دەکرێ. بەڵام، جەنگ ئەوەیە، مرۆ بە چەک و بە ڕووبەڕووبوونەوە بیکا.

ـــ کەواتە: ئایا دەتوانین، « جیهادکردن » بۆ موسوڵمانان، بە جۆرێ لە ئازایەتیی دانێین؟

بە دڵنیاییەوە. گومانی تێدا نییە، بە واتا فراوانەکەی « جیهاد »، گەر یەکێ ئازا نەبێ، نە « جیهاد »ی بۆ دەکرێ، بە واتا تەسکەکەشی، نە جەنگیشی بۆ دەکرێ. چونکە، واتای باو و « شەرعیی » « جیهاد » لە کێشە « شەرعیی »یەکاندا، واتای جەنگ دەگەیەنێ. بەڵام، لە « قورئان » و « سووننەت »دا، ووشەی « جیهاد » لە جەنگ فراوانترە.

ــ مەبەست لە « جیهاد »، لەگەڵ کێ دایە؟

خوای گەورە، بە پەیامبەری « د.خ. » فەرمووە: (و جاهدهم به جهادا كبيرا.) لەگەڵ بێ باوەڕەکاندا، بە قورئان « جیهاد » بکە، « جیهاد »ێکی گەورە، « جیهاد »ێ بە « قورئان » بکرێ، دیارە، « جیهاد »ی بانگەواز و تێگەیاندنە، « جیهاد »ی دیالۆگ و وتووێژە. دیسان، خوای پەروەردگار، لە سوورەتی « حەج »دا فەرموویەتی: (و جاهدوا في الله حق جهاده.)

ــ خەریکبوو، ئێستە، ئەو پرسیارەت لێ بکەم. فەرموو.

ئەوە، ئەو درووشمەی ئێمەیە. لە سوورەتی « حەج » دایە و سوورەتێکی « مەکی »یە. ئەو ئایەتە بۆ خۆی، ئایەتێکی « مەکی »یە. واتە: لە پێناوی خوادا خەباتبکە. چونکە، « جیهاد » بە واتای تێکۆشان، فیداکاریی و قوربانییدان دێ.

ــ بە جەنگ نایەت؟

مەرج نییە، هەر بە جەنگ بێ. ووشەی « جیهاد »، جەنگیش دەگرێتەوە، بانگەواز، گفتوگۆ و جەنگی « حوجە »تیش دەگرێتەوە. (الحرب حربان، حرب لسان و البرهان، و حرب السيف و السنان.) « جیهاد » هەر دووکی دەگرێتەوە. بەڵام، جەنگ تەنیا کوشتار دەگەیەنێ.

ــ بەڵام، وا دیارە، کاتێ لە هەموو ووڵاتە ئیسلامییەکاندا، شتێ ڕوودەدا، بۆ نموونە: جەنگەکانی نێوان « عەرەب و ئیسرایل، ئەفگانستان و ڕووس، کۆسۆڤۆ و یۆگۆسلاڤیا ... تاد » ئەوانەی، لە ئیسلامدا بڕیاریان بە دەسە، دەڵێن: « جیهاد »مان ڕاگەیاند. ئایا، خەڵک چی لە ڕاگەیاندنی ئەو « جیهاد »ە تێدەگا؟ ئەوانەی ڕایانگەیاندووە، مەبەستیان ئەوەیە: هەموو دەوڵەتە ئیسلامییەکان، هەموو خەڵکی موسوڵمان بێن، بە هەموو توانایەکیانەوە، بەشداریی لەو « جیهاد »ەدا بکەن، ئەوەی پارە دەدا، پارە بدا. ئەوەی بەشداریی لە جەنگدا دەکا، چەک هەڵگرێ و بچێ بۆ ئەو ووڵاتانە بجەنگێ.

کاک دوکتۆر! من بۆم باسکردی. له زاراوەی « قورئـــان »دا، له زاراوەی « سوننەت »دا، ووشەی « جیهاد »، واته: خەرجکردنی هەموو توانایەک دەگرێتەوە. توانای دەروونیی، توانای زمان، ماڵبەخشین، فیداکاریی، داکۆکییکردن به زمان و بانگەواز، هەموویان دەگرێتەوە. لەو ئایەتەی هێنامەوە، دەڵێ: تەنانەت به گیانیش دەکرێ. بەڵام، ووشەی جەنگیشمان هەیە. جەنگ له « قورئان »دا، تەنیا کاتی ڕووبەڕووبوونەوە دەگەیەنێ و بەکارهێنانی چەک دەگرێتەوە. له پەرتووکە « شەرعیی »یەکانیشدا، ووشەی « جیهاد »، واتـــا باوەکەی، که زاناکان له سەری ڕێککەوتوون، « جیهاد » بووە به جەنگ. واته: له جەنگدا چڕیانکردۆتەوە و واتاکەیان تەسککردۆتەوە. ئەگینا، ئەو واتایەی « قورئان » بۆی دیارییکردووین، تەنیا هەر جەنگ ناگرێتـــەوە، بەڵکوو، بانگەواز، پەروەردە، زانین، ماڵبەخشین و هەمووی دەگرێتەوە.
ـ به باوەڕی تۆ، ئایا، لەم سەردەمەدا، « جیهـــاد » دەکرێ؟ ئایا دەکرێ، گرووپێکی ئیسلامیی له « کوردستان »دا، بەرانبەر گرووپێکی دیکەی کوردستانیی « ناسیۆنالیست » یا هەر گرووپێکی دیکەی « سیکولار » بێ، بوەستێ و « جیهاد » بکا؟
ئامانجی « جیهاد »، کاک دوکتۆر! بۆ وەڵامی پرسیارەکەی بەڕێزت.
ـ بەڵێ. فەرموو.
« جیهاد » له ئیسلامدا، دوو ئامانجی هەیە:
1. داکۆکییکردن له خۆ، داکۆکییکردن له دەوڵەتی ئیسلامیی و له گەلی موسوڵمان.
2. ڕێتەختکردن و ڕێکردنەوە بۆ گەیاندنی پەیامی خوا به خەڵک.
به واتای یەکەمیان، که پێی دەگوترێ: « جیهادی دیفاعیی » یا « جیهادی دفع »، ئەوە، له کاتێکدا دەکرێ، هێرش بۆ سەر موسوڵمانان بکرێ و پەلاماربدرێن. جا، چ به کۆمەڵ بێ، چ به دەوڵەت بێ، له لایەن کەسانێکی دیکەوە دژایەتییانبکرێ. بێ گومان، له سەر ئایین، له سەر موسوڵمانێتیی ڕێیان پێ بگیرێ. یەخەیان پێ بگیرێ. بەڵێ، داکۆکیی له « خۆ، ئالا، پەیام و ڕێبازە »کەیان، به « جیهـاد » دادەنرێ. چونکه، خوای پەروەردگار فەرزیکردووە. (فمن اعتدى عليكم فاعتدوا عليه بمثل ما اعتدى عليكم.) هەروەها فەرموویەتی: (و قاتلوا في سبيل الله الذين يقاتلونكم و لا

تعـتدوا.) له ڕێی خـودا بجـەنگن، لەگەڵ ئەو کـەسانەی جـەنگتان لـەگەڵ دەکەن، بەڵام، دەسـدرێژیی مەکەن. گەر ئەوانە جـەنگیان نەکرد، ئێوەش له خۆتانەوە، له جەنگیانەوە هەڵمەپێچن! ئەوە یەکەمین ئامانجی « جیهاد » بوو.

دووەمین ئامانجی « جیهاد »یش ئەوەیە: گەر دەوڵەتێکی ئیسلامیی هەبوو، دەسـەڵاتێکی هەبوو، ئەو قـەوارە و دەسـەڵاتە ئیـسلامـیـیـە، له سـەری پێـویستـە، بانگەوازی ئیـسلامـیی، به دوورترین شوێنی سـەر ڕووی ئەم زەوییە بگەیەنێ. بەڵام، بانگەوازی ئیسلامیی، بۆ ئەوە ناگەیەنێ، خەڵک به زۆر موسـوڵمانکا، بەڵکوو، تەنیا بەربەست و پەرچەکان لادەبا، تا خـەڵک، دەنگی زوڵاڵی ئیسلام ببیستێ. ئەو کاتە، باوەڕدێن یا نایهێنن، ئارەزووی خـۆیانە. گـەر باوەڕیانهێنا، زۆر چاکـە و ئەوا مـوسـوڵمـان دەبن. گـەر باوەڕیشـیـان نەهێنا، ئـەوا ئازادن و له سـەر ئایینی خـۆیان دەمێننەوە. بەڵام دەبێ، سەرانە به دەوڵەتی ئیسلام بدەن.

کەواتە: ئێمـە، وەک لایەنێکی ئیسلامیی، له باری ڕیالیزمی ئـــــەورۆی « کـوردسـتـان »دا، بەپێی بۆچوونی خـۆمـان، زۆر خـۆمـان پاراسـتـووە و خۆشـمـان زۆر دەپارێزین، خـۆمان زۆر دوورگرتووە. به ڕاستیی، تەنانەت، هێندێ له لایەنه ئیـسـلامـیـیـەکـان، جـاری وا هـەیە، هێندێ خـەڵکی ئیسلامیی ساکار، تێ نەگەیشتووی کرچوکاڵ و سەرکێڵ، که ڕەنگه زۆر جار، لاسایی موسوڵمـانانی شوێنانی دیکه بکەنـەوە، دەیانەوێ، ئەزموونی وڵاتانی دیکە، له « کوردسـتـان » دووبارەکـەنەوە! ڕەخنەمـان لێ دەگرن، مزایەدەمـان به سـەرەوە دەکەن و دەڵێن: « کۆمـەڵی ئیسـلامیی »، جـەنگ ناکەن، « جیهاد » ناکەن، نەرمکێشییدەکەن، چاوپۆشییدەکەن!

ئێمه دەڵێین: بەڵێ. چونکە، خوێنڕشتنی خەڵک، چ خـەڵکی خۆمـان بێ، چ خـەڵکی لایەنەکـانی دیکەی بەرانبـەر بێ، کـاتێ « شـەرع » ڕێیپـێـدەدا، هێنانەدی ئامـانجێکی ئیسلامیی، پەکی له سـەر ئەوە کەوتبێ. ئەگینا، کوشتنی خـەڵک، هەر وا شتێکی ئاسان نییه و کەی ڕەوایە؟ (و لا تقتلوا النفس التی حرم الله الا بالحق.)

کـاتێ خـەڵک، ڕێمـان لێ بگرێ، ئاییندارییی بکەین و دەسـدرێژییـمـان بکەنەسـەر، مافی خۆمـانە، داکۆکیی له خۆمان بکەین. بێ گومـان، ئێسته نا، بەڵکوو، کاتێ دەوڵەتێکی ئیسلامیی هەبوو. « فتوحات »ی ئیسلامیی

بۆچی کراوە؟ موسوڵمانان، هاوەڵانی پەیامبەر « د.خ. »، خۆ هەر وا بە خۆڕایی، شێت نەبوون، وڵاتانیان گرتووە! بەڵکوو، لە سەریان پێویست بووە، پەیامی خوا، بەو گەلانە بگەیەنن، لە ڕیزی ئەو گەلانەشدا، بە نەتەوەی کوردی بگەیەنن. جا، چ گەلانی زۆر چەپۆکی وەک ئێمەی کورد بووبێ و هیچ قەوارەیەکی نەتەوەیی نەبووبێ. چ گەلانی خاوەن دەسەڵات و دەوڵەت بووبن، ڕۆڵەکانی گەلەکەی خۆیانیان چەوساندبێتەوە، تا پەیامی خوایان پێ بگەیەنن. جا، کام گەل پەسەندیکردووە، باشە، کام گەلەش پەسەندی نەکردووە، ئەوا ئیسلام نەیکوتووە، هەر دەبێ، موسوڵمان بێ. بەڵام، کوتوویانە دەبێ، ڕێمانبدەن.

ــ باشە، من نموونەیەکی زیندووت بۆ دێنمەوە. ئەو « جیهاد »ەی بەڕێزت دەفەرمووی، لە سەردەمی پەیامبەردا، لە سەردەمی هەر چوار جێنشینەکەدا، لە سەردەمی هەر دوو دەوڵەتە ئیسلامییەکەی « ئەمەوی و عەبباسیی »دا، تەنانەت لە سەردەمی ئیمپراتۆریای « عوسمانیی »شدا، کە بە « جیهاد »یان داناوە، لەشکرێکی زۆریان، لە گەلانی موسوڵمان کۆکردۆتەوە، جەنگێکی زۆریان کردووە، لە کیشوەری « ئاسیا »وە، تا دیوارەکانی « چین » و لە کیشوەری « ئەورووپا »شەوە، تا شاری « ڤییەن » ڕۆیشتوون. چوون، پەیامی ئیسلامیان پێ ڕاگەیەنن. کوتوویانە: ئایینێ هەیە، ناوی ئیسلامە. وەرن، موسوڵمان بن. ئەوانەی موسوڵمان نەبوون، جەنگیان لەگەڵ کردوون و کووشتوویانن. یا هێندێ وڵات هەبووە، سەرانەیانداوە و جەنگەکە درووست نەبووە. ئایا، ئەورۆ دەتوانین، ئەو تاقیکردنەوەیەی ئیسلام، لە جیهاندا دووبارەکەینەوە؟ دەوڵەتێکی ئیسلامیی گەورە، لە « ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست »دا دامەزرێنرێ، بە چەن دەوڵەتێکی زلهێزی وەک: « چین، ئەمێریکا، ڕووسیا، فرەنسە، بریتانیا » و هەموو ئەو دەوڵەتانەی موسوڵمان نین، بڵێین: ئەوە ئایینی ئیسلامە، گەر وەریدەگرن، باشە. گەر وەری ناگرن، دەبێ، سەرانە بدەن. ئایا، شتی وا دەکرێ؟ ئەو ئەزموونە، سەردەمەکەی بەسەر نەچووە؟ چونکە، گەر وابێ ... لێرەدا، کاسێتەکە تەوابوو، لەبەرئەوە، پرسیارەکەم بە شێوەیەکی دیکە دووبارەکردۆتەوە، تا، مامۆستا بە باشیی لێی تێبگا:

من ویستم، نموویەکت لە سەر « جیهاد » بۆ بێنمەوە. ئەوەی لە ئیسلامدا ناوی « جیهاد »ە و بەڕێزت ڕوونتکردەوە، لەو سەردەمانەدا، دەوڵەتی

ئیسلامیی هەبووە. یەکەمین دەوڵەتی ئیسلامیی، لە شاری « مەدینە » دامەزراوە. تا سەردەمی « عوسمانیی »یەکانیش، هەر بەردەوامبووە. گوتم: ئیمپراتۆریای « عوسمانیی »، تا دیوارەکانی « چین » چوون. لەم لاشەوە، تا نێوەڕاستی « ئەورووپا » ڕۆشتوون، بۆ ئەوی پەیامی ئیسلامیان پێ ڕابگەیەنن. ئەوان قەبووڵیان نەبووە. لەبەرئەوە. جەنگ لە نێوانیاندا دەسپێکردووە. هەڵبەتە، جەنگێکی زۆر و درێژخایەن ڕوویداوە. لە چ لایەک زۆر کوژراوە و کەی گەڕاونەتەوە، ئەوە مەبەستی باسەکەی ئێمە نییە. لە هێندێ شوێندا توانیویانە، پەیامی ئیسلام، بە سەر ئەو گەلانەدا بسەپێنن. بەلام، موسوڵمان نەبوون، بەڵکوو، سەرانەیانداوە. ئایا، ئەوڕۆ دەتوانرێ، گەر دەوڵەتێکی ئیسلامیی گەورەی یەکگرتووش دامەزرێ، هەموو دەوڵەتە ئیسلامییەکان یەکگرن، نزیکەی یەک میلیار و دووسەد میلیۆن موسوڵمان لە جیهاندا هەیە، هەموویان یەکگرن و دەوڵەتێکی ئیسلامیی سەربەخۆ دامەزرێنن، یەک جێنشین هەبێ، وەک لە سەردەمی ئیمپراتۆریای « عوسمانیی »دا هەبوو، ئەو دەوڵەتە دەتوانێ، ئەم پەیامە بە هەموو گەلانی « ئەورووپا، ئەمێریکا، ئوستراليا و ئاسیا » بگەیەنێ؟

چونکە، ئەو دەوڵەتانە، چەکێکی زۆری مۆدێرنی « ئەتۆمیی، بیۆلۆژیی، بەکتیریۆلۆژیی، کیمیاویی، ئەلکترۆنیی » و هەرچی چەکی کۆکوژیی دیکە هەیە، هەیانە. باشە، ئێوە پێیان دەڵێن: ئێمە موسوڵمانین، یا دەبێ، موسوڵمانبن، یا دەبێ، سەرانە بدەن. ئەوانیش دەڵێن: ئێمە موسوڵمان نابین، ڕێز لە ئایینەکەتان دەگرین، بەلام، سەرانەش نادەین. لەو کاتەدا، تۆ چۆن ئەو داواکارییەی خۆتیان، بە سەردا دەسەپێنی؟ چونکە، گەر جەنگێ لە نێوان ئیسلام و ئەواندا بەرپابێ، گومانی تێدا نییە، بەڵەنسی هێزەکان لە هەموو ڕوویەکەوە، وەک یەک نابن و نین! مەبەستم ئەوەیە، ئایا، سەردەمی ئەوە بەسەر نەچووە، گەر لەگەڵ ئەوڕۆدا بەراوردیکەین؟!!

بەڵێ. ئێستە بۆت ڕووندەکەمەوە. کاک دوکتۆر! جارێ پێویستە، ئەوە تۆزێ ڕۆشنکرێتەوە، ئەو کاتە، وەلامی پرسیارەکە ئاساندەبێ.

زۆر کەس وا دەزانێ، لەگەڵ دەوڵەتێکی ئیسلامیی دامەزرا، بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکیی دەبێ، دەس بە « فتوحات » بکا، وەک بەڕێزت دەفەرمووی، یا موسوڵمانبە، یا سەرانەبدە! ئەوە خۆی، بەو شێوەیە نییە، بەڵکوو، بە جۆرێکی دیکە لێکدەدرێتەوە.

گەر تەماشای « تەئریخی تەبەریی » بکەین، هەروەها، تەماشای « بیدایە و نیهـایە » و « ئەلکامـیل فی ئەلتـەئریخ »ی « ئیبن ئەلئەسـیـر » و پەرتووکەکانی دیکەش بکەین، کە لەم ڕۆژانەدا، بۆ بابەتێ گەرام، چەن بەسەرهاتێکیان هێناوەتەوە، دوای ئەوەی، لە جەنگی « قادسییە » دا، بە تایبەتیی، سوپای ئیسلام بە فرماندەی « سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص »، لەگەڵ سوپای « فارس »ەکاندا بە سەرکردایەتی « ڕۆستەم » لە سەردەمی ــ « ساسانیی »یەکان.
بەڵێ. لە سـەردەمی « ساسانیی »یەکان و « کیسرا »دا بوو.
نازانم، ناوەکەیم لە بیرچۆتەوە، ناوێکی هەیە! هەرچی چۆنێبێ، کاتێ ڕووبەڕووبوونەتەوە، سوپای ئیسلام، لە پێشدا، چوار پێنج جار، نوێنەری بۆ لای « کیسرا » ناردووە. پاشان، نوێنەری بۆ لای « ڕۆستەم »یش ناردووە. لێیان پرسیوون و گوتوویانە: ئێوە بۆچی هاتوون؟
« عەمری کوڕی عامر » و دوو سێیەکی دیکە لە هاوەڵان، لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا گوتوویانە: ئێمە، کۆمەڵێکین، خوای پەروەردگار، لە نێوماندا، پەیامبەرێکی ناردووە. ئێمە خەڵکێکی بێ سەروبەربووین. مردارەوەبوومان دەخوارد. کچمان زیندەبەچاڵدەکرد. زۆرداریمان لەگەڵ یەکدیدا دەکرد. دەوڵەمەندەکان، هەژارەکانیان دەچەوساندەوە. دواکەوتوویووین. بتمان دەپەرست. ئاوامان دەکرد و ئاوامان دەکرد. پەیامبەرێ، لە نێو خۆماندا پەیدابوو، ئەوانەی هەموو لێ قەدەغەکردین و پێی گوتین: بەندایەتیی بۆ خوا بکەن، پێکەوە برابن، پێکەوە ڕێک و تەبابن. چاوتان لە پاکیی بێ، ئاگاتان لە چاکیی بێ. ئێستەش، ئەو پەیامەی خوای پەروەردگار، بۆ پەیامبەری ئێمەی ناردووە، ئێمەی ڕاسپاردووە، لە نێو خەڵکی سەر زەوییدا بڵاویکەینەوە. ئێمەش هاتووین، لە ئێوەی بگەیەنین. تا ئێوەش، دوای ئەو ئایین و پەیامە نوێیە بکەون.
ئەوانیش گوتوویانە: باشە، گەر وەرمانگرت، دەڵێن: چی؟ دەگەڕێنەوە؟
گوتوویانە: بەڵێ. خۆتان وڵاتی خۆتان بەڕێوەبەرن، گەر ئەو ئایینەتان وەرگرت و ئەو پەیامەتان پەسەندکرد، ئێمە دەگەڕێینەوە. ( ندعکن و بلادکم و شانکم.)
ئەمەش، دوو سێ گێڕانەوەی هەیە. « فارس »ەکان گوتوویانە: گەر ئایینەکەمان وەر نەگرت، چی دەکەن؟

ئەوانیش گوتوویانە: پێمان خۆشە، وەریگرن، بۆ ئەوەی، ئەو ڕووناکیی و فەرەی، ئێمە لێی بەهرەمەندبووین، ئێوەش، هەر لێی بەهرەمەندبن. لێتان دەگەڕێین، خۆتان وولاتی خۆتان بەڕێوەبەرن. بەلام، گەر وەرتان نەگرت، گەر موسولمان نەبوون، دەبێ، سەرانەبدەن.
بێ گومان، ئەو سەرانەیەی لە ئیسلامیشدا دەدرێ، نیشانەیەکە بۆ ئەوەی: ئەو وولاتە، دژایەتیی ئەو قەوارە ئیسلامییە ناکا. لێی دەگەڕێ، ئەو ئاوە زولالەی لە کانیاوی ئیسلامەوە هەلقوولاوە، ئەو جۆگەیە، ئەو ڕووبارە، بە هەموو ئەو گەلانەی دیکەش بگا، کۆسپ و پەرچی نەخاتە ڕێ. واتە: ئەو سەرانەیە بۆ ئەوە نەبووە، کەساسبن. چونکە، بۆ نموونە: « عێراق »، لە سەردەمی « عومەری کوڕی خەتاب »دا، دوای ئەوەی گیراوە، خەلکەکەی موسولمان بوون. ئەوانەی، لە دوای جەنگ خۆیان بەدەسەوەداوە، هەر لە شوێنی خۆیان هێشتوویاننەتەوە. بەلام، « خەراج »یان لە سەر زەوییەکانیان داناوە. ئەوانەی موسولمانیش نەبوون، لە سەر ئایینی خۆیان ماونەتەوە، لە سەر جێ و ڕێی خۆشیان بوون.
بۆ زانیاریی بەڕێزیشت، شای « بەحرەین »، ناوی « مونزیر بین ساوا ئەلعەبدیی » بووە. پەیامبەر « د.خ. »، نامەی بۆ ناردووە و بۆی نووسیوە: ( اسلم، تسلم. ) واتە: موسولمانبە، سەلامەتدەبی. ( و نجعل ما بین ایدیک لک. ) واتە: ئەوەی لە ژێر دەسدایە، بۆ خۆت دەبێ. گەر موسولمان دەبی و شایستەی ئەوەبی، بۆ فرمانڕەوایی وولاتەکەی خۆت ئامادەبی، « شەریعەت » پیادەکەی، لە شوێنی خۆت بمێنەرەوە. ئینجا، بە کردەوە موسولمان دەبێ و پەیامبەر « د.خ. »، لە شوێنی خۆی دەیهێلێتەوە.
جا، مێژووی ئیسلام وا هاتووە. گەر گەلێ موسولمان نەبووبێ، سەرانەشی نەدابێ، مەبەستیان ئەوەبووە، بە هیچ شێوەیە، ئەو پەیامەیان قەبوول نییە و ئەو بەرنامەیەی خواشیان ناوێ. بەلام، ڕێشیان نەداوە، بلاوبێتەوە. لەبەرئەوە، موسولمانەکان، پەنایان بۆ چەک بردووە. واتە: لە بەر ڕێگرتنەکە بووە، نەک لەبەرئەوە بووبێ، موسولمان نەبووبن.
بەلگەمان بۆ ئەم قسەیە چییە؟ بەلگەمان ئەوەیە: هەموو زانایانی ئیسلام، لە سەر ئەوە یەکدەنگن و دەلێن: هەر کاتێ، لە گەرمەی جەنگیشدا بێ، لەبەرئەوەی، کۆمەلێ موسولمان نەبوون، بە هیچ جۆرێ، ئامادەش نەبوون، سەرانەبدەن، بۆیە، جەنگیان لەگەلدا کراوە. گەر لە گەرمەی

جەنگەکەشدا گوتیان: جەنگ ڕاگرن، سەرانەتان دەدەیْنیْ، دەبیْ، جەنگەکە بوەستیْنریْ یا دریْژەی پیْ بدریْ، تا موسوڵمان دەبن؟ دەڵیْن: دەبیْ، یەکسەر جەنگەکە ڕاگیریْ. چونکە، جەنگەکە لەبەرئەوە ناکریْ، کە موسوڵمان نابن، بەڵکوو، جەنگەکە لەبەرئەوە دەکریْ، کە سەرانە نادەن.
سەرانەدان چی دەگەیەنیْ؟ واتە: ئەو کۆمەڵ و گەلانەی، موسوڵمان نابن، بەلام، سەرانەدەدەن و مل بۆ سیستیْمی فرمانڕەوایی ئیسلامیی کەچ دەکەن، کە دەیەویْ، ئایینەکە بە هەموو جیهاندا بلاوکاتەوە، لە خەڵکیش دەگەڕیْن، دا خوا بڕوای پیْ دیْن، یا ناهیْن؟!! بنچینەی ڕاستەقینەی هەموو « فتوحات »ی ئیسلامییش، هەر بەو شیْوەیە بووە.
من یەک شتی دیکە، بۆ بەڕیْزت باسدەکەم.
ـــ فەرموو.
بیْ گومان، لە سەردەمی « ئەمەویی، عەبباسیی و عوسمانیی »یەکاندا هەڵە هەبووە. لەبەرئەوە، ئیْستە، ئیْمە وەک ئیسلامیی، کاتیْ تەماشای میْژووی ئیسلام دەکەین، دەڵیْین: میْژووی موسوڵمانان و ناڵیْن: میْژووی ئیسلام. چونکە، جاریْ لە سەردەمی « معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان »دا، « یەزید »ی کوڕی، لە سەردەمی خۆیدا، بە تۆبزیی، پەیمانی باوەڕپیْهیْنانی لە خەڵک وەرگرتووە. بۆیە، زۆر لە زانایانی ئیسلام دەڵیْن: « یەزید » جیْنشین نەبووە و ڕەوایەتی نەبووە. چونکە، بە زۆر ئەو پلەیەی وەرگرتووە. لەبەرئەوە دەبیْ، موسوڵمانان بە ویست و ئارەزووی ئازادانەی خۆیان، فرمانڕەوا و کاربەدەسانی خۆیان هەڵبژیْرن.
خۆ، زۆربەی زانایانی ئیسلام، هەر ئەشکەنجەدروان، دەربەدەرکراون و ئارامیان لیْ هەڵگرتوون. ئیدی، لەو کاتەوە، کیْشەی فرمانڕەوایی و ڕامیاریی ئیسلامیی، لەگەڵ کیْشەی « شەریعەت » و بەرنامەی ئیسلامییدا، لە یەکدی ترازاون. بەلام، بیْ گومان، بەو ئەندازەیە نەبووە، کە لە « ئەوروپا »، لە سەر دەستی پیاوانی « کەنیسە »دا ڕوویداوە. چونکە، زانایانی ئیسلام، خۆیان بەدەستەوە نەداوە، هەر لە « ئەبو حەنیفە »وە بیگرە، تا بە « ئیمام مالک، ئەحمەدی کوڕی حەنبەلیی و ئیمام شافعیی » دەگا، ئامادەبوون، بەندبکریْن، لیْ بدریْن، دەربەدەربکریْن، بەلام، هەرگیز خۆیان بەدەستەوە نەداوە، وەک پیاوانی « کەنیسە »، لە ئاستی « تسار » و دەسەلاتدارەکاندا، بیْ دەنگبوون.

ئێستە، بەڕێزت گرفتەکەت لەوە دایە، بۆ نموونە: گەر قەوارە و دەوڵەتێکی ئیسلامیی هەبێ، چۆن ئەو کارە دەکا؟ باشە، کاک دوکتۆر! کام دەوڵەتی ئیسلامیی؟!! خوای پەروەردگار، بنچینەیەکی گشتیی داناوە و فەرموویەتی: ( لا يكلف الله نفسا الا وسعها ) خوا داوا لە هیچ کەسێ ناکا، ئەوە نەبێ، لە توانایدا هەیە. ئێستە قەوارە و دەوڵەتێکی ئیسلامیی درووستبێ، لە سەداسەدیش « شەرعیی » بێ، چونکە، ئەو قەوارانەی ئێستە هەن، ئێمە تێبینییمان لە سەریان هەیە، « کۆماری ئیسلامیی ئێران، سۆدان » بۆ نموونە.

ـ « عەرەبستانی سعوودییە ».

بەڵێ. « سعوودییە، ئەفگانستان » کوێ و کوێی دیکەش، ئێمە تێبینییمان لە سەریان هەیە. بەلام، بڵێین، قەوارە و دەوڵەتێکی ئیسلامییش دامەزرا، لە سەداسەد « شەرعیی » و ڕێکوپێکیش بوو، « شەرع » داوای چی لێ دەکا؟ داوای ئەوەی لێ دەکا و دەڵێ: تۆ دەبێ، بەپێی توانای خۆت هەوڵ بدەی، جارێ پێش ئەوەی، ئەو موسوڵمانانەی ژێر چەپۆکن، ڕزگاریانکەی، « شەرع »، چ مافێکی دانێ، با پێیان بدا. « شەرع »، چ مافێکی بە گەلی کورد دا، با بیدا. نەتەوەیەکە، لە چل میلیۆن پێکهاتووە، با، چی دیکە نەچەوسێنرێتەوە، با، چی دیکە کیمیاباران نەکرێ، بە ناو « ئەنفال » نەکرێ، جینۆسایید نەکرێ. بابە! چ خوا بەردارە... جا، ئەو قەوارە ئیسلامییە، لە « ئێران » بێ، لە « عێراق » بێ، لە هەر شوێنێ بێ، گرنگ نییە! چونکە، ئیسلام دەڵێ: پێش ئەوەی، مافی تاکێ بدەی، دەبێ، مافی گەلێ بدەی. جا، دوای ئەوەی، گەلی کورد، یا هەر گەلێکی دیکەی زۆرلێکراو، گەر هەبوو، موسوڵمانیشن و دەچەوسێنرێنەوە، دوای ئەوەی، ئەو دەوڵەتە ئیسلامییە، هەموو گرفتەکانیان چارەسەردەکا. ئینجا، گەر لە دەسەلات و توانایدا هەبوو. پێی دەڵێ: دەی باشە، ڕوو لەو خەڵکە بکە. پەیامی خوایان پێ ڕاگەیەنە.

چ کاتێ، ئەو دەوڵەتە ئیسلامییە درووستدەبێ؟ کاتێ، کە چەکی لە چەکی ئەوان بەهێزتربوو، توانایەکی وای هەبوو، بەرانبەریان بوەستێ. ئەو کاتە، خەڵکی پسپۆڕ و شارەزا کۆدەکاتەوە، لێیان دەپرسێ: ئەرێ خەڵکینە! ئێمە ئەو جەنگە بکەین، سەرکەوتوودەبین، یا ژێرکەوتوودەبین؟! ئاخر ئێستە، جەنگەکە بکەین یا نەکەین، خۆ زلهێزێکی وەک « ئەمریکا »، بێ

جـەنگ، لە ڕێی هـۆکـانـی ڕاگـەیاندنەوە، لە ڕێی بەکـارهێنانی چەکی ئابوورییـیەوە، « جـیـهـانگیریـی » خۆی، بە سـەر هەمـوواندا سـەپاندووە. بەڵام، مـەرج نییـە، دەوڵەتێکی ئیـسـلامـیی، ئەو ئامـرازانە بەکـاربێنێ. بەڵکوو، بەپێی سـەردەم، بەپێی ڕۆژگـار، ئەو ئامـرازانە بەکـاردێنرێ، بۆ ئەوەی، ئەو پەیامە خواییـیە، بە گوێی ئەو خەڵکە بگا.
خۆی کێشـەکە ئاوایە. (و قاتلوهـم حتی لا تکون فتنە و یکون الدین کلە للە.) واتە: لەگەڵیان بجەنگە، تا، « فیتنە » نامێنێ، تا، بۆ وەرگرتنی ئایین، گوشار و زۆر لە سەر خەڵک نامێنێ. جا، چ بۆ وەرگرتنی ئایینی ئیسلام بێ، چ نائیسلامیی بێ. گرنگ ئەوەیە، مرۆکان زۆرداریییان لێ نەکرێ، نە ئایینی ئیسلام و نە ئایینێکی دیکەشیان، بە سەردا بسەپێنرێ.
دوای ئەوەی، ئیسلام دەسەڵات پەیدادەکا، هەمـوو جیهان وا لێ دەکا، هیچ کـەسێ ناتوانێ، لە سـەر بیـر، گوشـار بۆ کەسـێکی دیکە بەرێ. چونکە، گوشارکردن لە خەڵک، بۆ ئەوەی، بیرێ قەبووڵکا، ئا ئەوە، خۆی لە خۆیدا، کاکڵەی تیرۆرە. واتە: گوشار لە خەڵک بکەی، بۆ ئەوەی بیرێکی دیاریکراو پەسـەندبکەن، ئەوە قەدەغـەیە، ئەوە بە پێچەوانـەی سرووشـتی مرۆڤـەوەیە. بە پێچەوانەی سرووشتی ئایینیشەوەیە، خـوای پەروەردگاریش، ئەوەی بە ئامانجی کۆتایی « جیهاد » داناوە. (و قاتلوهـم حتی لا تکون فتنە و یکون الدین کلە للە.) « فیـتنە » واتە: ئازار و ئەشکەنجە، لە سـەر بیروباوەڕیان نامێنێ و هەمـوو ملکەچییـیـەک، هەر بۆ خـوا دەبێ، واتە: جگە لە خـوا، کەس لە کەسی دیکە ناترسێ. جا، ئەو کاتە (فمن شاء فالیؤمن فمن شاء فالیکفر.).
ـ ئاخر، بەڕێزت باسـی « شەریعەت » دەکەی!
بەڵێ.
ـ بەڵام، بۆ باسی کردەوەی ڕێکخراوە ئیسلامییەکان لە هەمـوو جیهاندا ناکەی؟ چونکە، ئەوە دوو شتی جیاوازە.
بەڵێ.
ـ واتە: ئەو ئایەتانەی بەڕێزت هێناتنەوە، (و قاتلوهـم حتی لا تکون فتنە.) بە زۆر شت لێکدەدرێنەوە. لەوانەیـە، لایەنێ هەوڵیش نـەدا، « فـیـتنـە » درووستکا. بـــەڵام، لایەنە ئیسلامییەکە دەسپێشخەرییبکا و بڵێ: با، « فـیـتنـە » درووست نەبێ! بـۆ ئەوەی، بەو بیـانوانەوە، خـۆی بە سـەریدا

بسەپێنێ و دەسەڵات وەرگرێ. لەبەرئەوە، جەنگیشی لەگەڵ دەکا. من وای تێدەگەم، بۆچوون و لێکدانەوەی جیاواز، بۆ لێکدانەوەی ئایەتەکان هەیە. واتە: بەگوێرەی تێگەیشتنی گرووپە رامیارییەکان، بەگوێرەی ئامانجەکانیان، بەگوێرەی ستراتیژیان، لێکدانەوەی ئایەتەکان دەگۆڕێ.
لێرەدا، لە باسی سەرانەدا، من شتێکم بۆ دەرکەوت، ئەویش ئەوەیە: لایەنێکی گەورەی ئەو سەرانەوەرگرتنە، لە فاکتەری ئابووریدا خۆی دەبینێ. وا نییە؟
بەڵێ.
— چونکە، هەر لە کۆنەوە، تا ئەو ڕۆژەی، سەرانە باوبووە، ئەوانە، بۆچی سەرانەیان بە دەوڵەتی ئیسلامیی داوە؟ لە پاشەڕۆژیشدا، گەر ئەو دەوڵەتە ئیسلامییە درووستبێتەوە، بۆچی درووستدەبێتەوە؟ کەواتە: فاکتەری ئابووریی، ڕۆڵێکی زۆر گەورە و گرنگی، لە تێڕوانین و دیدی ئیسلامیی، لە دەسەڵاتی ئیسلامییدا هەبووە و هەیە.
بەڵێ. کاک دوکتۆر!
— فەرموو.
بۆ ئەوە دەگونجێ، لێکدانەوەی جیاواز هەبێ. هێندێ شت لێکدانەوەی جیاواز هەڵدەگرێ. بەڵام، هێندێ شتی دیکە هەن، ڕوونن و هیچ جۆرە لێکدانەوەیەکی جیاوازی دیکەیان نییە. ئامانجی کۆتایی « جیهاد » ئەوەیە: هەموو مرۆڤایەتیی، لە ژێر سایەی فرمانڕەوایی « شەریعەت »دا کۆکاتەوە. جا، ئەوەی براوی هەیە و باوەڕدێنێ، خۆی بە « شەریعەت »ەوە دەبەستێتەوە. ئەوەی براوشی نییە و باوەڕیش ناهێنێ، لە سەر ئایینی خۆی دەمێنێتەوە. بەڵام دەبێ، ملکەچکا و ڕێزی ئەو دەسەڵاتە رامیارییە ئیسلامییە بگرێ، کە هەموو جیهانی لە ژێر دەسی خۆیدا کۆکردۆتەوە. ئەوە ئامانجی کۆتایی « جیهاد »ی ئیسلامییە و زانایانی ئیسلام، لە سەری یەکدەنگن.
ئەوەی بەڕێزیشت دەڵێی، لێرەدا گرووپە ئیسلامییەکان و قەوارە ئیسلامییەکان، بەپێی ئەو قۆناغەی تێیدەکەون، بەپێی توانایان ڕەفتار دەکەن و دەجوڵێنەوە.
بۆ نموونـــــــە: ئێستە ئێمە، لای برادەرانی نائیسلامیی خۆمان، کە لە « کوردستان »دا هەن، دەڵێین: ڕەنگە ئێمە لەو قۆناغەدا بین، کە پێکەوە

دڵنەوایی یەکدی بکەین. لەبەرئەوەی، ئامانجێکی هاوبەشی گشتییمان هەیە. ئــــەو ئامانجەش، پتر خۆی لەوەدا دەبینێ: هێمنیی و ئاساییشی « کوردستان » بپارێزین. ئەو ڕەوشە تێک نەدەین، کە وەک کەشتییەک وایە، هەموومانی تێداین. گەر تێکچوو، لە هەموومان تێکدەچێ. با، ئەو ستێبەرە تێک نەچێ، چونکە، کە تێکچوو، خۆرەتاو لە هەموومان دەدا.

ئێمە، لەم قۆناغەدا ئاواین. لە قۆناغێکی دیکەدا، بۆ نموونە: کاتێ هەستمانکرد، نەخێر، ئەو خەڵک و گەلە هەمووی لەگەڵ ئێمە دایە، جەماوەر هەمووی باوەڕی بە ئێمە هەیە، ڕەنگە، ئەو کاتە، بە شێوەیەکی دیکە، بە برادەرانی « پارتیی و یەکێتیی » بڵێین: ئەرێ براینە! ئێوە مافی ئەوەتان نییە، بە ناوی گەلەوە، لە « پەرلەمان » دانیشن، کە دە جار، بۆ خۆتان ڕاتانگەیاندووە، ڕەوایەتیی نەماوە!

ــ بەڵێ.

بە ناوی « پەرلەمان »ەوە دابنیشن، پێشتر بڕیارەکان بدەن، وەک پارت، کاکەوبراینەی لە سەر بکەن و دواییش، وەک شتێکی چاوبەست، لە ژووری « پەرلەمان » دانیشن و بۆ نموونە: دەنگدانێکی ڕووکەشیی لە سەر بکەن. پێشتریش، (ما ورائە ئەلکەوالیس) لە پشت پەردەوە، لەو لاوە، بڕیارتان لە سەر هەموو خاڵەکان دابێ. ڕەنگە، ئەوە قەبووڵ نەکەین. بەڵام، بۆ نموونە دەڵێم: گەر ڕەوشەکە تێکچێ، لە هەموومان تێکدەچێ.

دواییش، ئێمە خۆشمان، قەبارەی خۆمان دەبینین، دەڵێین: ئێمە با جارێ، شتێ نەڵێین، لە قەبارەی خۆمان گەورەتربێ! کاتی خۆی، هەڵبژاردن کرا، خەڵکێکی زۆر، دەنگیان بە « پارتیی و یەکێتیی » دا. ئێمە دەبوو، ڕێزی ویستی ئەو خەڵکەش بگرین، با، بۆچوونەکانیشمان وەک یەک نەبن.

کەواتە: گرووپ و لایەنە ئیسلامییەکان دەبێ، بەپێی ئەو قۆناغەی تێیدان، لە چوارچێوەی « شەرع »دا قسەبکەن و هەڵوێست وەرگرن. مەرج نییە، ئەو شتە، شتێبێ، تا ئەو ڕۆژەی جیهان کۆتاییدێ، بەردەوامبێ.

واتــــە: با وا بڵێین، ئێستە ئێمە، نوێنەری « 5٪ » یا « 10٪ »ی خەڵکی « کوردستان »ین. دەبێ، بەقەدەر ئەو ڕێژەیە، ڕەفتاربکەین. چونکە، قەوارەی ئیسلامیی، بە بنکەیەکی جەماوەریی دروستدەبێ، قەوارەی ئیسلامییش، هەر ئەوە نییە، دەسەلات هەبێ، بەڵکوو، پێش هەموو شتێ، پێویستی بە بنکەی جەماوەریی هەیە، خەڵکێکی لەگەڵ بێ و پشگیریبکا.

بۆ نموونە: پەیامبەر « د.خ. »، تا بنکەی جەماوەریی بۆ درووست نەبوو، فرمانڕەوایی ئیسلامیی لە « مەدینە » ڕا نەگەیاند. بۆچی لە « مەککە »، دەوڵەتی دا نەمەزراند و لە « مەدینە » دایمەزراند؟ بەڵێ، لە « مەککە » خەڵک موسوڵمان بووبوون، بەڵام، بنکەی جەماوەریی پێک نەهێنابوو. کەچیی، لە « مەدینە »، ئەو بنەکەیە درووستبووبوو.

ــ دیارە، هێز، توانا و دەسەڵاتی دەوێ!

جگە لەوانەش، دەسەڵاتی جەماوەریشی دەوێ.

ــ بەڵێ. ڕاستە هەمووی پێکەوە دەبێ.

بۆ ئەوەی فەرمووت، پرسیارەکەت، بێ گومان، پێش ئەوە باسی ئەوەت کرد، لێکدانەوەی جیاواز هەیە. ئەو ڕوونکردنەوەیەم لە سەر ئەوەبوو، بەڵام، شتێکی دیکەت فەرموو، ببورە، من باشم لە یاد نەماوە.

ــ با واز لەوە بێنین و شتێکی دیکە باسکەین.

فەرموو.

پ22 : ئەم بۆچوونانەی دەڵێی: ئیسلام، تێڕوانینێکی بۆ جیهان هەیە، ئەویش ئەوەیە: بیروباوەڕی ئیسلام، لە هەموو جیهاندا بڵاوکاتەوە. مەرجیش نییە، هەموو کەسێ بکا بە موسوڵمان. لێرەدا، شتێکم بیر دێنێتەوە. لە « یەکێتی سۆڤێت »، نزیکەی « 300 - 350 » میلیۆن کەسی تێدا دەژیا. دەوڵەتەکە، لە چەندین « کەمینەی نەتەوەیی، گەل و نەتەوە »ی جیاواز پێکهاتبوو. چەندین ئایینی جیاوازی وەک: « فەلە، جوو، ئیسلام » و هەموو جۆرە ئایینەکانی دیکەشی تێدا بوو. بەڵام، کێ فرمانڕەوایی و پێشڕەوایەتیی ئەو خەڵکەی دەکرد؟ تەنیا هەر، « پارتی کۆمۆنیستی سۆڤێت » بوو، هیچ جۆرە پارتێکی دیکە نەبوو. ژمارەی ئەندامانی ئەو کۆمۆنیستانەی، لە « پارتی کۆمۆنیست »یشدا کاریاندەکرد، لە هەموو « یەکێتی سۆڤێت »دا، لە « 20 - 25 » میلیۆن کەس تێپەڕی نەدەکرد. لەگەڵ ئەوەشدا، کەسیان بە زۆر نە دەکرد بە کۆمۆنیست، کەسێکیش کۆمۆنیست بووایە، بۆی نەبوو، وازبێنێ. بەڵکوو دەبووایە، خۆیان دەریان کردایە. واتە: گوشارێکی زۆریان، لە سەر کۆمەڵەکە دا نەنابوو، تا ببنبە کۆمۆنیست. کەچیی، ئەنجامەکەشی ئەوەبوو، کە هەمووومان دیمان!

بەڵێ.

دوای « 70 - 80 » ساڵ هەرەسیهێنا. من پێم وایە: ئەو نموونەیەی بەڕێزت هێناتەوە. هەر هەمان شتە، گەر تۆ بتەوێ، بیروباوەڕی ئیسلام، لە هەموو جیهاندا بڵاوکەیتەوە. خۆ ئەوانیش، هەر دەیانویست، بیری کۆمۆنیستیی، لە هەموو جیهاندا بڵاوکەنەوە. نموونەکەشمان کوێ بوو؟ « یەکێتی سۆڤیێت » بوو. وەک گوتم: کەسیشیان، بە زۆر نەدەکرد بە کۆمۆنیست، ژمارەیەکی زۆر کەمیشبوون، کەچیی، سەریشی نەگرت. بۆ؟ چونکە، خوای پەروەردگار، ئەو خەڵکەی بە « سرووشت، خەسڵەت، بیروباوەڕ، دید و بۆچوون »ی جیاوازەوە درووستکردووە. هەموویان ناتوانن، یەک شت وەرگرن. تۆ گەر بتەوێ، هەموو ئەو بیروباوەڕە بچەسپێنی، بڵێین، تەنیا هەر، لە نێو کۆمەڵگەی « کوردستان »یشدا بێ، چونکە، لە یەک گەل پێکهاتووە و زۆربەی زۆریشیان هەر موسوڵمانن، واز لە جیهان بێنە، کە لە چەندین گەل و نەتەوەی جیاواز پێکهاتووە، هەر گەل و نەتەوەیەکیش، لە سەر ئایینێکی جیاواز دەڕۆن. ئایا پێت وایە، دەتوانی، کۆمەڵگەیەکی موسوڵمانی ڕاستەقینە، لە « کوردستان »دا دامەزرێنیّ؟!!

و22 : کاک دوکتۆر « حوسێن » ! جارێ، ئەو بەراوردکردنە، لە نێوان قەوارەیەکی ئیسلامیی، لەگەڵ قەوارەیەکی بە ناوی « سۆسیالیزمی زانستیی »یەوە، بە ناوی قەوارەیەکی « کۆمۆنسیتیی سۆسیالیستیی »، لە « یەکێتی سۆڤیێت »ی پێشوو دامەزرا، ئەو بەراوردکارییە و پێوانەیە، بێ گومان، وەک زانایانی لۆژیک پێی دەڵێن « قیاس مع ئەلفارق ». ئەو قەوارە ئیسلامییەی، پەیامبەر « د.خ. »، لە ساڵی یەکی کۆچیی دایمەزراند، تا ساڵی « 1300 » کۆچیی، سێسەد و شتێکی کۆچیی دەوامیکرد. واتە: سیازدە سەدە، ئەو دەوڵەتە ئیسلامییە ژیا و بەردەوامبوو.

ــ مەبەست تا سەردەمی « عوسمانیی »یەکان بوو؟

بەڵێ. تا ساڵی « 1924 ز. » کاتێ « کەمال ئەتاتوورک » بە فەرمیی، خەلافەتی ئیسلامیی هەڵوەشاندەوە و ڕەتیکردەوە. تەماشادەکەین، ڕەنگە، بە درێژایی مێژوو، دەوڵەتێ نەبووبێ، سیازدە سەدە درێژەی کێشابێ! ئەو دەوڵەتە، بۆچی هێندە مایەوە و ژیا؟ لەگەڵ ئەوەشدا دەگونجا، ئێستەش، هەر بەردەوامبێ، گەر ئەو هۆکارانەی وایان لێ کرد، دەوڵەتەکە نەخۆش کەوێ، کە بە دەوڵەتی « عوسمانیی »یان دەگوت: « پیاوە نەخۆشەکە ». پاشان، ڕوخا. گەر خۆی لەو هۆکارانە بپاراستایە.

بەلام، « یەکێتی سۆڤێت »، لە ساڵی « 1917 »، کاتێ شۆڕش لە سەر دەستی « لێنین »دا بەرپابوو، تا ساڵی « 1991 » بوو، وا نییە؟
ــ بەڵێ.
واتە: نزیکەی حەفتا ساڵێ یا کەمتریش ژیا.
ــ من مەبەستم لە ماوەکە نییە، ئەو دوو دەوڵەتە چەن ژیاون. بەڵکوو، جگە لە جیاوازیی ئایدۆلۆژیا، مەبەستم
بەلام، من مەبەستمە.
ــ بەڵێ.
من دەڵێم: بۆچی ئەویان سیازدە سەدە بەردەوامبوو، بەلام، ئەوی دیکەیان، تەنیا « 60 - 70 » ساڵ ژیا. لێرەدا دەڵێم: چ « مارکسیزم » و چ هەر بیرێکی دیکەش، کە زادەی بیر و هۆشی مرۆ بوو، هەر هێندەی مرۆ دەتوانێ، تەمەن بکا و بەردەوامبێ. بەڵێ. کۆمۆنیستەکان دەیانگوت: ئێمە خۆمان بە سەر کەسدا ناسەپێنین. بەلام، لە ڕاستییدا، بە کردەوە، ڕاستیان نەدەکرد. چونکە، ئەوانەی کۆمۆنیست نەبوون و ئەندامی پارت نەبوون، لە هەموو دەسکەوتێکی باشی ژیان بێ بەشبوون. ئەوانەی کۆمۆنیستیش بوون، بە ڕاستیی، زۆر لە خۆشییدا بوون، بەڕێزت لەوێ بووی، بە چاوی خۆت دیوتە، بە تایبەتیی، ئەوانەی لە پارتایەتیدا پلە و پایەیەکیان هەبوو. واتە: باری ژیانیان، زۆر لە سەرمایەدارەکان باشتر بوو. بەلام، ئیسلام کاتێ دەڵێ: زۆر لە خەڵک ناکەم، ڕاستدەکا و زۆر لە خەڵک ناکا. بە درێژایی مێژووی ئیسلام، « زەردەشتیی، جوو، فەلە و یەزدیی » هەبوون. زۆربەی پیاوانی سەر بەو ئایینانە، هەر پیاوی دەوڵەمەند و پارەدار بوون. هێندێ لەو نائیسلامییانە، لە دەوڵەتە ئیسلامییەکاندا، تا پلەی شالیاریش ڕۆشتوون. بەلام، لە « یەکێتی سۆڤێت »، کەسێکت دەبینی، نەک تا پلەی شالیار، بەڵکوو، تا پلەی چی بڵێم، بڕوا، گەر کۆمۆنیست نەبووایە؟! چەن زانایەکی وەک « ئەندرێی زەخارۆف » و کێ و کێی دیکەش، کە زۆر خەڵکی پسپۆڕ و شارەزابوون، لەبەرئەوەی، ئەندامی « پارتی کۆمۆنیست » نەبوون، یا لەبەرئەوەی، ڕاستیی زانستەکەیان، لەگەڵ ئەندێشەکانی « مارکس ـ لێنین » و ئەوانی دیکەدا، یەکیان نەدەگرتەوە، دەرکران، « یەکێتی سۆڤێت »یان بەجێهێشت.

بێ گومان، جارێ، جیاوازییەکی کاکڵەیی، لە نێوان ئەو دوو فەلسەفەیەدا هەیە. ئیسلام ئایینی خوایە. بەڵام، « کۆمۆنیزم » بەرهەمی بیری مرۆڤە. پاشان، لە پراکتیک و جێبەجێکردنیشدا، ئیسلام ڕاستیکردووە. چونکە، زۆری لە خەڵک نەکردووە. بە بەڵگەی ئەوەی، زۆر لە « فەلە و جوو »مکان، تا پلەی شالیار، ڕاوێژکار و زۆر پلەی دیکەی دەسەڵاتیش، لە دەوڵەتی ئیسلامییدا ڕۆشتوون. هەروەها، نەک هەر ڕێشیان پێ دراوە، کار و بازرگانیی خۆیان بکەن، ئایینی خۆیان پیادەکەن، بەڵکوو، ماوەشیان پێ دراوە، ڕاژەی دەوڵەتی ئیسلامییش بکەن و ڕۆڵی خۆیانی تێدا ببینن. بەڵام، بێ گومان، لە « یەکێتی سۆڤێت »، جۆرێکی دیکە بووە. ئەمە لە لایەک، لە لایەکی دیکەوە، « مارکسیزم » جگە لە گوشاری دیکتاتۆرانە، کە هەر بۆ خۆیان « دیکتاتۆریای پرۆلیتاریا »یان پیادەدەکرد، بەڕێزت بۆ خۆت زۆر چاک دەزانی.

ــ بەڵێ.

ئیسلام، هەرگیز دیکتاتۆریی نەبووە. هەرگیز بڕوای بە دیکتاتۆرییەت نەبووە. بەڵکوو، سەرکووتانەوە، چەوساندنەوە و دیکتاتۆرییەت، لەگەڵ بەندایەتیی بۆ خوا دژایەتیی هەیە. واتە: خەڵک، بۆیە بەندایەتیی بۆ خوا دەکا، تا کەسی دیکە پەرستراو و پەروەردگار نەبێ. پاشان، لە « یەکێتی سۆڤێت »ی پێشوو، بە ڕاستیی، بیردۆزەی « مارکسیزم ـ لینینیزم »، کە بانگەشەی « نێونەتەوەیی ـ ئینتەرناسیۆنالستیی » دەکرد، دانی بە خاوەندارێتی تاکدا نەدەنا. دانی بە هەست و نەستی نەتەوایەتییدا نەدەنا، دانی بە چارەنووسی گەلاندا نەدەنا. ئەوانە، وایان کرد، پێچەوانەی سرووشتی خەڵک، پێچەوانەی هەست و نەستەکانی مرۆڤ، پێچەوانەی ڕەوتی ژیان بجوڵێنەوە. ئینجا، لە ڕاستییدا، بیری « مارکسیزم ـ لینینیزم » و سۆسیالیزم، پتر لە کاردانەوەی سەرمایەدارییدا پەیدابووە.

ــ مامۆستا! دوایی، دێینە سەر ئەوانە.

بۆیە، هەرچی سەرمایەداریی دەیگوت، « مارکسیزم » دەیویست، بە پێچەوانەوە بیکا. لە ئەوێ تاک ئازادە و لیبرالییەت لە ئارادایە. لە ئەوێ دەبێ، سۆسیالیزم لە ئارادابێ و کۆمەڵ تاک بپلیشێنێتەوە. بەڵام، ئیسلام کاردانەوە نییە. بەڵکوو، لە جێی خۆیدا، مافی خۆی بە تاک و بە کۆمەڵیش دەدا. لە ڕووی « ڕامیاریی، ئابووریی و کۆمەڵایەتیی »شەوە،

هاوسەنگییەکی زۆر وردی ڕاگرتووە. لەبەرئەوە، ئەو دوو شتە ناکرێ، بە یەکەوە بەراوردکرێن، چونکە، ئەو هەمووی « 60 - 70 » ساڵێ توانیویتی، بەردەوامبێ و هەرەسیهێناوە. بەڵام، دەوڵەتی ئیسلامیی، سیازدە سەدە بەردەوامبووە.

ــ ڕاستە، دەوڵەتە ئیسلامییەکە، پتر بەردەوامبوو، ماوەکەی زۆر درێژتر بوو. بەڵام، ئەنجامی هەر دوو دەوڵەتەکە « ئیسلامیی و مارکسیی »، هەر وەک یەکبوو. چونکە، هەر دووکیان، وەک دەوڵەت نەمان. نەک وەک بیر، سەرکەوتوو نەبوون، چونکە، هیچیان تا ئێستە، وەک بیر، مایە پووچ نەبوون. لەبەرئەوە، فەلسەفە نامرێ، چ « مارکسیزم » بێ، چ « ئیسلام » بێ، چ هەر فەلسەفەیەکی دیکەش بێ. لاوازدەبێ، نەخۆشدەکەوێ، بەڵام، لە سەردەمێکی دیکەدا هەڵدەداتەوە. بۆ نموونە: ئایینی ئیسلام، بە چەن قۆناغێکی جیاوازدا تێپەڕبووە. خۆت دەفەرمووی و دەڵێی: ئەم قۆناغی ڕاپەڕین و ڕابوونە ئیسلامییە، پێشتر وا نەبووە. وا نییە؟

بەڵێ.

ــ دووریش نییە، بیری « مارکســـــیزم »، ڕۆژێ لە ڕۆژان، جارێکی دیکە، سەرهەڵداتەوە. ئێمە نازانین، ئەوە گۆڕانکارییەکانی کۆمەڵ بڕیاری لە سەر دەدا.

ڕاستە. بەڵام، من پێم وایە: بیردۆزەی زادەی بیر و هۆشی مرۆ، وەک چۆن مرۆ دەمرێ، ئەویش دەمرێ. بەڵام، شتێ لە خواوە سەرچاوەبگرێ، چۆن خوای گەورە دەمێنێتەوە، ئەوەش دەمێنێ، مادام خوای پەروەردگار ویستبێتی، بمێنێ. لێرەدا، کەسێ بۆی هەیە، بپرسێ و بڵێ: باشە، بۆچی ئایینی « فەلە و جوو »، هەروەها، « زەردەشتیی » گەر ئەویش ئایین بووبێ و « زەردەشت »یش پەیامــبــەر بووبێ، بۆچی نەمــان؟ چونکە، خـــوای پەروەردگار، وای نەناردوون، بمێنن!

ــ « زەردەشتیی » ماوە، چۆن نەماوە؟ بەڵام، کزبووە، زۆر کزبووە.

دەزانم. هەموویان ماون، بەڵام، بەو ڕووە پرشنگدار و ڕاستییەی خۆیان نەماون.

ــ بەڵێ.

خوا « ئینجیل »ی بۆ « عیسا » ناردووە، بەڵام، ئێستە چوار « ئینجیل » هەیە. چونکە، هەمـــوو ئەو پەرتووکـــانە، « تەورات، ئینجـــیل »

دەسکارییکراون. « ئاڤێستا »ی « زەردەشت »، کەس نازانێ، ئاخۆ چەندی ماوە و چەندی نەماوە. بەڵام، « قورئان » دەسکاریی نەکراوە. چونکە، « قورئان » خوا ویستوویەتی، بمێنێ.

ــ بەڵێ. هەر وەک خوا لەو بارەیەوە فەرموویەتی: (انا انزلنا هذا القران و انا له لحافظون.)

(انا نحن نزلنا الذكر و انا له لحافظون.) چونکە، خوای پەروەردگار، « قورئان »ی بۆ مرۆڤایەتیی ناردووە، تا، لە سەر زەویی کۆتاییپێدێ. ئەوەشی لە باردا هەیە، گرفتەکانی چارەسەرکا. بەڵام، ئایینی « فەلە »، لە باریدا نییە، گرفتە « رامیاریی، نەتەوەیی و ئابووریی »یەکانی چارەسەر کا. بۆیە، خەڵک ناچاربوون، پەنا بۆ « سیکولاریزم، لیبرالیزم و سۆسیالیزم » بەرن. چونکە، ئایینی « فەلە » تێیدا نەبووە.

ــ زۆر چاکە. مامۆستا! با لێرەدا بوەستین. دەس خۆشبێ.

کاک دوکتۆر! خاڵێ مابوو، سەبارەت ئەو بەراوردەی بەڕێزت، لە نێوان ئەو دوو دەوڵەتدا کردت. ئەو دەوڵەتەی، ئیسلام دەیەوێ، لە سەر ئاستی مرۆڤایەتیی و بە پانتایی زەویی دایمەزرێنێ، لەگەڵ ئەوەی، بیرێکی وەک « کۆمۆنیزم و سۆسیالیزم »یش ویستی، بەڵام، دوایی شکستیهێنا. بەڕێزت، باسی ئەوەت کرد، ئەوەتە ئیسلامیش، هەر شکستیهێنا. بەڵام، لە ماوەیەکی درێژتردا، گەر ئەوەی ئەو « 60 - 70 » ساڵی پێچووبێ، هی ئیسلامیش سیازدە سەدەی پێچووە. واتە: هەزاروسێسەد ساڵ.

ئەوەی شایانی باسبێ و مابوو، لێرەدا بیڵێم، ئەوەیە: کاتێ، ئەو قەوارە ئیسلامییە، لە بەر یەک هەڵوەشا و نەما، کە موسوڵمانان، پابەندییان بە « شەریعەت »ەوە نەما. جا، چ لە ڕووی هەڵسوکەوتیان، لەگەڵ گەلاندا بووبێ، چونکە، « عوسمانیی »یەکان، دوور لە گیانی برایەتیی و گیانی موسوڵمانێتیی، هەڵسوکەوتیان لەگەڵ گەلەکاندا کردووە. بۆ وێنە: گەلانی « کورد و عەرەب »، لە ئەنجامدا ناچاربوون، بوونی خۆیان بسەلمێنن. واتە: « عەرەب » جەخت لە سەر عەرەبایەتیی خۆی و « کورد »یش جەخت لە سەر کوردایەتیی خۆی بکا. هەروەها، گەلانی دیکەش، هەر وابوون. جگە لەوەی، بایەخیان بە کێشەی دادی کۆمەڵایەتیی نەدەدا. لەگەڵ کێشەکانی ڕەوتی ڕۆژگاردا نەدەڕۆی. لە بواری تێکنۆلۆژیا، کەڵکوەرگرتن و بەهرەمەندبوون لە بەرهەمی بیری مرۆڤایەتییدا، کەمتەرخەمبوون.

واته: دەوڵەتی « عوسمانیی »، لەو دوادوایانەدا، لە هەموو ڕووەکانەوە، بەرەو دواوە گەڕابۆوە. لە کاراونی ڕاپەڕینی زانستیی، بەرەو پێشکەوتنی تێکنۆلۆژیا و ئەمانە، زۆر دواکەوتبوو. ئەوەش، خۆی لە خۆیدا، بە پێچەوانەی « شەریعەت »ەوەیە. چونکە، « شەریعەت » دەفەرموێ: (الحکمه اله المؤمن.) ؟؟

موسوڵمان دەبێ، هەمیشە، بە دوای زانستی نوێ، شتی تازە و بەکەڵکدا بگەڕێ. لە هەر شوێنێ دۆزییەوە، لە هەموو کەس پتر، خۆی بە خاوەنی بزانێ. بەڵام، بە پێچەوانەوە، بیری « کۆمۆنیزم و سۆسیالیزم »، کاتێ، لە باشترین شێوەی جێبەجێکردنیشدا بوو، هەرەسیهێنا.

کەواتە: ئیسلام، کاتێ پیادە ناکرێ، ئەو قەوارەیەی لە سەری درووست کراوە، هەڵدەوەشێتەوە. بەڵام، « کۆمۆنیزم » کاتێ پیادەکرا، هەڵوەشایەوە. واتە: ئەوە بۆ ئیسلام، شتێکی چاوەڕوانکراوە، کە بەدیهێنەر و پەروەردگاری مرۆ داینــاوە. چونکە، سرووشت و پێویستییەکانی ژیانی مرۆ دەناسێ و بە بوونی ئاشنایە. بەڵام، بەرنامەی « کۆمۆنیزم »، بیردۆزەی مرۆڤێکە، کە لە هەلومەرجێکی تایبەتییدا، ڕەنگە، لە کاردانەوەی بارودۆخێکی نائاساییدا داینابێ. پاشان، سەیر نییە، گەر لەگەڵ سرووشت و ژیانی مرۆ، لەگەڵ ڕەوتی ژیاندا نەگونجێ. دوای بەسەرچوونی ئەو هەلومەرجەی کە پێویستی کردووە، پەیدابکرێ. مرۆ پێویستی پێی نەمێنێ و وەلای بنێ. ویستم، ئەو ڕوونکردنەوەیەش بڵێم.

پ23 : « ئەسکەندەر » گوتوویەتی: ( ئایین بۆ خوا و نیشتمان بۆ هەموو.) چۆن لەو قسەیە دەڕوانی؟ باوەڕت بەرانبەری چییە، بە تایبەتیی، لەم ڕۆژەی بارودۆخی « کوردستان »ی پێدا تێپەڕدەبێ، گرووپێکی زۆری ڕامیاریی « چ ئیسلامیی و چ نائیسلامیی »، لە « کوردستان »دا هەیە؟

و23 : لە ڕوانگەی ئیسلامەوە، هەموو شتێ هەر هی خوایە. (و لله ملک السماوات و الارض.) بەڵام، گرنگ ئەوەیە: تێبگەین، بەپێی تێڕوانینی ئایین، بۆ خوابوون، چ واتایەک دەگەیەنێ؟

گرفتەکە لەوەدایە، ئایا، هەموو شتێ هی خوایە؟ واتە: « پاپا »یەک، لە شوێنێ بڵێ: من لە سەر زەوی، دەمڕاستی خوام، وەک لە سەدەکانی

ناوەڕاستدا دەیانگوت. یا، کەسێ بە ناوی ئیسلامەوە، خۆی بە سێبەری خـوا بزانـێ، بەپێی بەرژەوەندیی و بۆچوونی تایبـەتیی خـۆی، بەپێی ئارەزووی دیاریکراوی خۆی، حـەڵاڵ بۆ خـەڵک حـەرامکا، حـەرامیـان بۆ حـەڵاڵکا و دەسکاریی « شـەریعـەت » بکا! گـەر ئەوە، هـەمـوو شـتـێ بۆ خوابوون بێ، ئەوا، بە دڵنیاییەوە هەڵەیە. گەر هەمـوو شتێ بۆ خوابێ، واتە: چ سـەر زەوی، چ ئایین، چ ژین، هەمـوو شـتـێ دەبێ، بۆ ژێر سـایەی فـرمـانڕەوایی خـوا بگەڕێتـەوە. واتە: ئەو بەرنامـە خـواییـیەی، دەسکاریی نەکراوە، بۆ مرۆ ناردوویەتی، نەک ئەوەی، بە شتی هیچوپووچ و ئەفسانە، بە بیر و بۆچوونی مرۆ پڕکراوە، وەک لە پەرتووکە ئاسمانییەکانی دیکەدا دەبینرێنەوە. « تەورات، ئینجـیل » و سـەرجـەمی پەرتووکـەکانـی دیکەش، زۆر بیر و شتی دیکەی تێدا ئاخنراوە. دواییش، لەگەڵ ژیان، لەگەڵ مرۆ و پێویستییەکانی ژیاندا ناگونجێن. ئەوەش، خـەتای سەرچاوەی ئایینەکە نییـە، بەڵکوو، خـەتـای خودی ئەو کەسـانەیە، کە دەسکاریـی سـەرچاوەی ئایینەکەیان کردووە، دەقە ڕەسەنەکانیـان شێواندووە، چەن شـتێکیـان بۆ زیادکردووە ودەسیـانتێوەرداوە. بۆیە ئەوەی دەگوترێ: نیشـتـمـان بۆ هەموو لایەک، ئایینیش بۆ خـوای پەروەردگار، لە ڕاسـتییـدا، بە هیچ شێـوەیە، لەگـەڵ ئیسـلامـدا ناگـونجـێ. بەڵکوو، گـەر مـەبەست لە ئایین، ملکەچیی خـەڵک بـێ، دەبێ، تەنیـا هـەر بـۆ خـوا بێ! چونکە، مـرۆ هیـچ ئەڵتـەرناتیڤ نییـە، دەبێ، پەرستـراوێکی هەبێ. جا، گـەر پەرسـتـراوێکی ڕاسـتەقینەی نەبوو، کە خوایە، هێندێکیان، هێندێکی دیکەیان دەکەنە پەرستراو.

ـــ مامۆستا! لێرەدا مەبەست ئەوەیە، ئایین وەک هۆیـەک بەکار نەهێنرێ، بۆ ئەوەی، ناکـۆکیی لە نێـوان ڕیزەکانی گـەلدا درووستـبێ. هـەر کـەسێ، خواپەرستیی خـۆی دەکـا، با بیکا. بەڵام، ئەو بسـتـۆکە زەوییـەی، ئێـمـەی زیندوو، لە سـەری دەژین، نیـشـتـمـانەکـەیە و هـی هەمـوومـانـە، دەبێ، بیپارێزین.

کاک دوکتۆر! ئایین هۆیەک نییە، ناکۆکیی لە نێوان ڕیزەکانی گەلدا پەیدا کا. بەڵکوو، بـێ ئایینیی هۆیەکـە، ناکۆکیی و دووبەرەکیی پەیدادەکا. بێ ئایینیی، خوێن، سەر، ماڵ و ئابڕووی یەکدی بۆ خۆ حەڵاڵدەکا. گەر ئایین، فرمـانڕەوا بێ، بێ گومـان، ئایین بە شێوە ڕاسـتەکەی، تەنیـا ئەوەیە، دوا پەیامبەر « موحەممەد ـ د.خ.» هێناوێتی، ئەو کاتە، ئەو شتانە ڕوو نادەن.

چونکە، ئەو ئایینانەی دیکە، هەمـــوویان دەسکاریکراون و گـــۆڕراون. خوای پەروەردگار، کاتێ فەرموویەتی: (یحرفون الکلمه.) نە « تەورات »، ئەو « تەورات »مەیە، خوا بۆ « موســـــا »ی ناردووە، نە « ئینجیل »، ئەو « ئینجیل »ەیە، خـوا بۆ « عـیســا »ی ناردووە. وە نە هیچ پەرتووکـێکی دیکەش ئەوانەن، خوا بۆ پەیامبەرانی دیکەی ناردووە. بەڵکوو، هەموویان دەسکاریکراون و گۆڕاون. ئاشکراشە، خوا یەک « ئینجیل »ی ناردووە، کەچیی، « فەلە »کان چوار « ئینجیل »یان هەیە، وەک ئینجیلی « مەتیی، یۆحەنا، مەرقەس و لۆقا » ئەو چوارەش، لە کۆبوونەوەی « نیقییە »، لە نێو حەفتا پەرتووکی دیکەدا هەڵبژێرراون.

پاشـان، لە « تەورات »دا، ئەوەی دیارە، کۆمـەڵێ قسـەی هیچـوپووچ و ئەفسانەی تێدایە. یەکێ لەوانە: گوایە « جوو »ەکان، گەلی هەڵبژاردەی خوان! خوای پەروەردگار، هەموو گەلەکانی خۆی، بە یەک چاو تەماشا دەکا، هەموویان خۆی درووستیکردوون و گەلێ شتی دیکەش، کە ماڵ، سەروەت و دەروون، جگە لە « جوو »، بۆ کەسی دیکە ڕەوا نییە.

بێ گومـان، لە « تەورات و تەلموود »دا، گەلێ شـتی لەو چەشنە هەن، بە هیچ پێـوەندێ، لەگـەڵ دادپەروەریی خـوا، لەگـەڵ سـرووشی پاک و بێگەردیی پەروەردگاردا ناگونجێن. جا، بێ ئایینیی، گەر مەبەستی لە ئایینی ئیسلام بێ، دەبێتە هۆی ناکۆکیی

ــ مەبەست لە فرەئایینییە، نەک بێ ئایینیی!

لە ئیسلامدا، هیچ بەربەستێ بۆ فرەئایینیی نییە. بۆ زانیاریی بەڕێزیشت، ئەو ڕایەی زانایانی ئیسلام ڕاستتر، بەهێزتر و بەڵگەدارترە، کە دەڵێ: لە ئیســلامـدا، هەمـوو خـاوەن بیرێ بۆی هەیە، نەک هەر « جوو و فـەلە »، بەڵکوو، بێ باوەڕ و بتپەرستەکانیش، لە ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامدا بژین، بە مـەرجێ، ڕێز لەو دەوڵەت و سیستێمی فرمانڕەواییە بگرن. چونکە، بێ گومان، گەر بمانەوێ، ئەوە بسەلمێنین، دەتوانم، بەڵگە بێنمەوە، نەک تەنیا هەر، خاوەن پەرتووکەکان، واتە: « فەلە و جوو » سەرانەیان لێ وەرگیرێ و بە کەمایەتیی ئایینیی دابنرێن، بەڵکوو، هەمو خاوەن بیرێ، بۆی هەیە، لە ژێر ســایەی دەســەڵاتی ئیـســلامـدا بژی، بۆی هەیە، پارێزکاریی ئایین، باوەڕ و بۆچوونی خۆی بکا، بە خواپەرستیی خۆی، بە شێوەی خۆی، ئەو شتانەی خۆی جێبەجێکا. بەڵام، مل بۆ سیستێم و

دەسەڵاتی ئەو فرمانڕەواییە کەچکا. بە دڵنیایی، لە هەموو شوێنێکیش، هەر وایە. کاتێ، کۆمەڵە موسوڵمانێکیش، وەک کەمینەیەک، لە ژێر سایەی دەوڵەتێکی ناموسوڵماندا دەژین، هەر دەوڵەتێ بێ، دیارە دەبێ، بە سیستێم و دابونەریتی ئەو شوێنەوە پابەندبن.
ــ ئەمە زۆر ڕاستە.
جا، کاک دوکتۆر! ئەوەی جێی سەرنجە، ئەوەیە: لە نێو کۆمەڵگەیەکی ئیسلامیی و لە جیهانی ئیسلامدا، خۆ موسوڵمانان زۆربە پێکدێنن، زۆربەی هەرە زۆرن. باشە، ئەو کێشەیە بۆچی دەوروژێنرێ، گوایە: ئایین، دەبێتە هۆی دووبەرەکیی و پەرتەوازەیی؟!! ئەدی باشە، بۆچی نەڵێین: بێ ئایینیی، دەبێتە هۆی پەرتەوازەیی؟!
باشە، گەر دێمۆکراسییش بگرین، بڕیاری فرمانڕەوایی بۆ گەل بدا و دەسەڵات بۆ گەڵ بێ. چونکە، گەلەکە زۆربەی موسوڵمانە، پێویستە، سیستێمی فرمانڕەواییەکەشی، لە باوەڕ و ئایینی زۆربەوە وەرگیرێ. کەمینەش پێویستە، ڕێز لە باوەڕی زۆرینە بگرێ، نەک لە بەر خاتری کەمینە، زۆرینە، واز لە ئایینی خۆی بێنێ. کەمینە دەبێ، لە بەر ڕێز لێ گرتنی زۆرینە، پارێزگاریی شتە تایبەتییەکانی خۆی بکا. بەلام دەبێ، مل بۆ ڕەوشتی گشتیی و سیستێمی فرمانڕەوایی کەچکا، کە زۆرینە، لە وولاتدا دەسەبەریکردووە. کەچیی، ئێستە لە وولاتی موسوڵماناندا، موسوڵمانەکان، نەک هەر زۆرینە نین، بەڵکوو، جاری واش هەیە، هەر هەموو کۆمەڵگەکە، لە ئیسلامیی پێکهاتووە، هەمووی موسوڵمانە، هەمووی شوێن ئایینی ئیسلام کەوتووە! لەگەڵ ئەوەشدا دەویسترێ، بە بیانووی ئەوەی، چوار « فەلە » هەبێ، یا نەبێ، یا چوار « جوو » هەبێ، یا نەبێ، یا چوار « زەردەشتیی » هەبێ، یا نەبێ، یا چوار « یەزدیی » هەبێ، یا نەبێ، کۆمەڵگەکە بشێوێنن. بۆ نموونە: وولاتێکی وەک « کوردستان »ی ئێمە، بێ گومان، گەلی کورد، زۆربەی هەرە زۆری موسوڵمانن. ئێ باشە، لە بەر خاتری، هێندێ لە برادەرانی « فەلە، جوو، یەزیدیی » نازانم، چی و چی دیکە، کە هیچ کەسێ ڕێیان لێ ناگرێ، خۆ بە درێژایی مێژووی ئیسلام، ڕێزیان لێ گیراوە، نەک ئێستە، موسوڵمانان دەوڵەتیان نییە، لە کاتێکیشدا، موسوڵمانان، لەو پەڕی دەسەلاتیاندا بوون، « جوو، فەلە، زەردەشتیی » و هەموو خاوەن ئایینەکانی دیکە، هەموو کەمینە

ئایینەکانیش هەر هەبوون، زۆر بەڕێزیشەوە تەماشاکراون، هیچ کەسێ، دەسی بۆ پەرسگەکانیان نەبردووە. بۆ؟ چونکە، ئیسلام وای گوتووە. ئیمامی « عەلی » قسەیەکی جوانی هەیە، وەک « صحیحی بوخاریی » گێڕاوێتییەوە، فەرموویەتی: (انما قبل عقد الجزیه حتی تکون اموالهم کاموالنا و دمائهم کدمائنا.) دەڵێ: ئەوانە، بۆیە پەیماننامەی سەرانەیان قەبوولکردووە، تا، لە ژێر سایەی ئیسلامدا، هاووڵاتییبن و ماڵیان وەک ئێمە بێ، خوێنیشیان هەر وەک خوێنی ئێمە بێ. دیارە، شتەکانی دیکەشیان، وەک: ئازادیی ڕادەربڕین، ئایینداریکردن، پەرستن، کێشەکانی باری ژیانی تایبەتیی بە هەموو شتێکیانەوە، ڕاژەکردنیشیان بەو دەوڵەت و قەوارە ئیسلامییە، هەر بە هەمان شێوە، لەو چوارچێوە « شەرعیی »یەدا، جێیدەبێتەوە و ماوەی هەموو جۆرە ڕاژەکردنێکیش دەدرێن. تەنانەت، لە ئەنجوومەنی نیشتمانیی وڵاتێکی ئیسلامدا، « جوو، فەلە، زەردەشتیی ... » بۆیان هەیە، نوێنەریان هەبێ. هەروەها، گەر کۆمەڵێ بێ باوەڕیش هەبن، وەک کەمینەیەکی ئایینیی، بۆیان هەیە، لە ئەندامی شوورای ئەو میرییە ئیسلامییەدا، نوێنەرێکیان هەبێ و نوێنەرایەتیی گەلەکەی خۆی بکا، نوێنەری میللەتەکەی خۆی بێ، تا، دەنگیان بەو شوێنە بگەیەنێ و داکۆکیی، لە کێشەکانیان بکا، باری سەرنجەکانیان ڕوونکاتەوە. ئەوە، زانایانی ئیسلام، لە پەرتووکەکانی ڕامیاریی « شەریعەت »دا، بە درێژیی باسیانکردووە.

پ24 : ئینجا، شتێکی دیکەی گرنگ هەیە. ئەویش ئەوەیە: بە باوەڕی من، ئایین، پێوەندیی لە نێوان خەڵک و خوادا و کاری ڕامیارییش، پێوەندیی لە نێوان خەڵک و خەڵکدا دیارییدەکا. واتە: ئەو پێوەندییەی، لە نێوان ئەندامانی کۆمەڵگەیەکی دیاریکراودا هەیە، ئەو پێوەندییەی لە نێوان خەڵک و خوادا هەیە، پێوەندییەکی زۆر تایبەتیی و پیرۆزە. لە سەروو هەموو پێوەندییەکانی دیکەوە دێ. چونکە، تۆ بەرانبەر درووسکاری خۆت دەوەستی، ڕۆژی پێنج جار، قسەی لەگەڵ دەکەی، نزادەکەی، هەرچی نهێنیی دڵی خۆشت هەیە، دەیدرکێنی. بەڵام لەوانەیە، تەنانەت لە کاری ڕامیارییشدا، لە نزیکترین کەس بسلەمیتەوە. بۆچوونێ هەیە، دەڵێ: تێکەڵاوکرنی ئایین، لەگەڵ کاری ڕامیارییدا، زیان بە ئایین دەگەیەنێ.

بۆچی؟ لەبەرئەوەی، کاری ڕامیاریی، لە ئاستی بەرزیی و پیرۆزیی ئایین کەمدەکاتەوە. لەو بارەیەوە، تۆ چی دەفەرمووی؟

و24 : لەو بارەیەوە، من دەڵێم: گەر ئایین، مەبەست لە ئایینی شێوێنراوی « فەلە » بێ، ئەوا شتێکی زۆر ڕاستە. چونکە ئایینی شێوێنراوی « فەلە »، نەک هەر بە کەڵکی کۆمەڵ، ڕامیاریی و دەوڵەت نایە، بەڵکوو، هەر بە کەڵکی تاکیش نایە. لەبەرئەوەی، بە شتی هیچوپووچ سیخناخکراوە. لە ئایینی « فەلە »دا، « پاپا » دەپەرستن.

ــ ئەم بۆچوونە، هەموو ئایینەکان دەگرێتەوە.

بە لای منەوە، لەو چاخەوە « موحەممەد د. خ. » هاتووە، تا جیهان کۆتایی دێ، ئایینی ڕاست هەبێ، تەنیا هەر ئایینی ئیسلامە. چونکە، ئەوەی دەسکاریی نەکرابێ و نەگۆڕابێ، خوای پەروەردگار بۆ مرۆی ناردبێ، هەر ئیسلامی ناردووە. ( و رضیت لکم الاسلام دینا .) ئیسلامم بە ئایین بۆ هەڵبژاردوون. ئەوانی دیکە، بۆ کاتێکی تایبەتیی و بۆ کۆمەڵگەیەکی دیاریکراو نێرراون. تەنیا « موحەممەد موستەفا »، بە هەموو درێژایی بوون و ژیان، بۆ هەموو پانتایی زەویی نێرراوە. هەر ئیسلامیش، ئەوەی لەباردا هەیە و شایستەی ئەوەیە، گرفتەکانی مرۆڤایەتیی چارەسەرکا. ئایینێکی لەو چەشنە، هەم پێوەندیی نێوان خوا و مرۆ دیاریدەکا، هەم پێوەندیی نێوان مرۆ و مرۆش دەسنیشاندەکا.

ــ واتە: باوەڕ بەوە نییە، ئایین لە کاری ڕامیاریی جیاکەیتەوە؟

هەر نابێ. من ئایەتێک بۆ دێنمەوە. خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (ان الحکم الا لله امر ان لا تعبدوا الا ایاه ذلک الدین القیم و لکن اکثر الناس لا یعلمون.) لێرەدا، سێ ووشەمان هەیە: بەرنامەدانان، پەرستن و ئایین. خوای پەروەردگار لەم ئایەتەدا فەرموویەتی: (ان الحکم الا لله.) ئەوە ئەو « ان »، ئینی « نافییە »یە. « حوکم » واتە: بەرنامەدانان، نەک واتای فرمانڕەوایی بگەیەنێ. تەنیا خوا، مافی ئەوەی هەیە، بەرنامە دانێ. بەرنامەدانان بۆچی؟ دیارییکردنی سیستێمی فرمانڕەوایی، تەنیا مافی خوایە. چونکە، (امر ان لا تعبدوا الا ایاه .) فرمانیکردووە، تەنیا هەر خۆی بپەرسترێ. کاتێ، تەنیا هەر خوا دەپەرسترێ، کە زانیاریی و بەرنامەدانانیش، تەنیا هەر لەو وەردەگیرێ، وەک چۆن ڕاز و نیاز، تەنیا هەر لەگەڵ ئەو دەکەین، « حەلاڵ و حەرام »یش، تەنیا هەر لەو وەردەگرین،

(ذلک الدین القیم.) ئەوە ئایینی ڕاستە، ئایینی ڕاست ئەوەیە: پەرستن هەر بۆ خوابێ. بەرنامەدانانیش، هەر بۆ خوا بێ. خوای پەروەردگار، هەر دووکیانی بە خۆیەوە تایبەتکردووە. بۆیە فەرمووویەتی: (و لا یشرک فی حکمە احدا.) خوا لە بەرنامەدانانی خۆیدا، کەس بە هاوبەش دانانێ.
دەربارەی پەرستنیش فەرموویەتی: (و لا یشرک بعباد ربە احدا.) وەک چۆن بەندەکان نابێ، لە پەرستنیاندا، هیچ هاوبەشێ بۆ خوا پەیداکەن، تەنیا دەبێ، خۆیان بە بەرنامەی خواوە ببەستنەوە. چونکە، هەر لە بنەڕەتدا، واتای بەندایەتیی، کاتێ بە ڕاستیی دێتەدی، کە مرۆ هەموو شتەکان، بۆ خوا بگێڕێتەوە. چ دیارییکردنی « حەڵاڵ و حەرام » بێ، چ دیارییکردنی درووشمەکانی خواپەرستیی بێ، چ تێڕوانین دەربارەی ژیان و بوونەوەر بێ، چ هەڵسوکەوتی مرۆکان، لە نێوان خۆیاندا بێ، چ هەڵسوکەوتی مرۆکان، لەگەڵ خوای پەروەردگاردا بێ، چ هەڵسوکەوتی دەسەڵاتدارەکان، لەگەڵ گەلەکەی خۆیاندا بێ، چ گەلەکە لەگەڵ دەسەڵاتدارەکاندا بێ، هەمووی دەبێ، خوای پەروەردگار دیارییکا.
خۆ کاتێ، تەماشای « قورئان »یش دەکەین، تەماشای « سوونەت »ی پەیامبەر «د.خ. »، بەسەرهات و چیرۆکی کرداری پەیامبەر «د.خ. » و هەڵسوکەوتی چوار جێنشینەکەش دەکەین، لە هەموویاندا، هەر ئەوە بەرجەستەدەبێ. کە پەیامبەر «د.خ. » ئیمامی موسوڵمانان بووە. چونکە، لە « میحراب »دا، پێشنوێژیی بۆ کردوون. دوای نوێژ، کۆمەڵێ گرفتیان هێناوە، دادوەریشی لە نێواندا کردوون. کاتێ جەنگیش هەڵگیرساوە، سەرکردەی جەنگەکانیشی بۆ کردوون. ڕۆژی « هەینیی »ش هاتووە، ئامۆژگاریی گیانیی و ڕامیاریی پێ داون. « ئەبو بەکر » هەر وای کردووە، « عوسمان، عومەر، عەلی » و ئەوانی دیکەش، کەم و زۆر، هەر بەو شێوەیە بوون. هەم ئیمامەتیی موسوڵمانانیان کردبوو بە خواپەرستییان، هەم مشووڕخواردنیان کردبوو بە کاری ڕامیارییان. وە لە ئەرکەکانی ئیمامدا، کاک دوکتۆر حوسێن!
ــ بەڵێ. فەرموو.
« ئەلماوەردیی »، لە پەرتووکی « ئەحکام ئەلسلطانیە »دا گوتوویەتی: یەکێ لە ئەرکەکانی ئیمامی موسوڵمانان، برا گەورەی موسوڵمانان ئەوەیە: (احفظ الدین علی اصولە المستقرە و سیاستە الدنیا بە.)

ئەوەی ئایین، لە سەر بنچینە چەسپاوەکانی خۆی بهێڵێتەوە و نەیەڵێ، داهێنراوی تێکەڵبێ، کاروباری ژیانیشی پێ هەڵسووڕێنێ، « و سیاسە ئەلدنیا بە » یەکێ لە ئەرکەکانی جێنشین و ئیمام ئەوەیە. ئایین لە شوێنی خۆی بهێڵێتەوە. نەیەڵێ، وەک ئایینی « جوو و فەلە »، بەپێی ئارەزووی دەسەڵاتداران، دەسکارییبکرێ و بگۆڕرێ.
ئاخر، « قەشە و پاپا »کان، ئایینیان بۆ گۆڕی؟ بۆ ئەوەی، لەگەڵ ویست و ئارەزووی دەسەڵاتداراندا بیگونجێنن، تا هەموو کردەوە ناشرینەکانیان بۆ بشارنەوە، کردەوە نا« شەرعیی »یەکانیان بۆ « شەرعیی »کەن. تا خوێنمژینی خەڵک و جەماوەریان، بۆ « شەرع »کەن. تا جەماوەر پشکوێ خەن، چونکە نابێ، هیچ مافێکیان هەبێ. کێشە و باسی « سیۆکراسیی » بەرنامەدانانی خوا لە کوێوە هاتووە؟ بێ گومان، لە سەدەکانی نێوەڕاست و تا سەدەی « شازدە ـ حەڤدە » لە ئارادا بوو، « تسار و پاشا »کان، لە کۆمەڵگەی ڕۆژاوادا، بە ناوی خواوە فرمانڕەواییانکردووە و گوتوویانە: ئێمە لە سەر زەویی، نوێنەری خواین! « قەشە و پاپا »کان، چاوی خەڵکیان بەستبوو. « مارکس » کە گوتوویەتی: ئایین تلیاکی گەلانە، بۆ ئەو ئایینەی گوتووە و ڕاستیشیکردووە. چونکە، فرمانڕەوایی دیکتاتۆریی « تسار »ێکی، بە سەر گەلێکی ڕەشوڕووتەوە، بە فرمانڕەوایی خوا داناوە. هەموویانی بە بێکار گرتووە و گوتوویەتی: دەبێ، وەک پەرستنیش لێی تێبگەن، ئەوە تلیاکە! جا ئایینێ بەو شێوەیە، لە ژیان دوورکەوێتەوە، بە دڵنیاییییەوە دەڵێم: نەک هەر دەبێ، لە فرمانڕەوایی و لە دەوڵەت دوورکەوێتەوە، بەڵکوو دەبێ، هەر لە تاکیش دوورکەوێتەوە.
بەڵام، ئێمەی ئیسلام، ئەو بەسەرهاتانەمان نییە. ئەو گرفتانەمان، لە ئیسلامدا نییە. بە داخەوە، زۆر جار، بە چاویلکەی خەڵکی دیکە، تەماشای شتەکانی خۆمان دەکەین. ئێمە، قسەی خەڵکی دیکە دووبارە دەکەینەوە. خەڵکێکی دیکە، لە ناو ئایینێکی هیچوپووچ و پڕ ئەفسانە، ئەو ئایینەی، بە دەس دەسەڵاتدارانەوە، بە دەس « قەشە و پاپا »کانەوە، وەک بازیچەیەک وابوو، لە ڕازەکردنی دەسەڵاتدارەکاندا بوو، جگە لەوەی، « قەشە و پاپا »کانیش، لەگەڵیاندا هاوبەشەدزبوون، لە ناو ئەو ئایینە، ئەو خەڵکە، بەرەو « سیکولاریزم » و بێ ئایینیی ڕایانکرد. ئێمەش وا دەزانین، دەبێ، هەر وا بکەین. نا، کابرا سەری دێشێ، حەبێکی ئەسپرینی

خواردووه، تۆش كه سكت دێشێ، مەرج نییه، ئەو حەبە بۆ تۆ باشبێ! تۆ ڕەنگە، دەرمانێكی دیكەت پێویستبێ.
ئێمە گرفتمان لەگەڵ ئایین نییە. بەڵكو، گرفتمان لەگەڵ بێ ئایینیی هەیە. ئێمە، گرفتەكەمان ئەوەیە، بە شێوەیەكی باش، بە ئایینەكەمانەوە پابەند نین. لێی تێ نەگەیشتووین. واتە: كابرایەكی « ئەوروپایی »، لە سەدەكانی نێوەڕاستدا، ئەم گرفتانەی هەبووە.
لە ڕاستییدا، مێژوونووسەكانی ڕۆژاوا، ئەوانەی ویژدانیان هەیە. هەموویان، لە سەر ئەوە یەكدەنگن و دەڵێن: سەدەی « ڕێنیسانس »، واتە: ڕاپەڕین و وشیاربوونەوەی زانستیی لە « ئەوروپا »، كاتێ سەریهەڵداوە، پەرتووكی موسوڵمانەكان وەرگێڕراون، ڕۆژاواییەكان، لە ژیانی موسوڵمانەكان ئاشنابوون، ڕەوشت و نەریتەكانیان كاریتێكردوون، لە خوێندنگە و زانكۆكان، تێكەڵ بە خوێندنیان بوون، شارستانێتیی ئیسلامیی كارتێكردوون. بەو شێوەیە، ئەوان، لە تاریكایی سەدەكانی نێوەڕاست، خۆیان ڕزگاركردووە.

پ25 : باشە. كەواتە: لە بەر ڕۆشنایی قسەكانی خۆتدا، ڕات بەرانبەر ئایینە « كوردیی »یەكانی وەك « زەردەشتیی، كاكەیی، یەزدیی ... » چییە؟
و25 : لە « شەریعەت »ی ئیسلامییدا، هەر ئایینێ، بنەڕەتێكی ئاسمانیی هەبێ، ئەوە دیارە، ئێمە ڕێز بۆ بنچینەی ئایینەكە دادەنێین. با، دوایی گۆڕابێت و تێكیشدرابێ. بەڵام، وەك باسمكرد، گریمان، گەر « كاكەیی و زەردەشتیی » ئایینیش نەبن، واتە: ئایینێ بن، هەر لە بنچینەدا، یەزدان دای نەنابن، هەر دەبێ، ڕێزیان لێ بگرین.
« زەردەشت » مرۆڤێكی فەیلەسووفی چاكەكار بووە. وەك « بووزا »، هێندێ دەڵێن: پەیامبەر بووە، هێندێكی دیكەش دەڵێن: پەیامبەر نەبووە. بەڵام، مرۆڤێكی فەیلەسووف و ژیر بووە، پیاوێكی خێرخوازبووە، قسەزان بووە، هێندێ قسەی باشی گوتووە و شتی باشیشی كردووە. بۆیە، خەڵك دوای كەوتوون و كاریتێكردوون. ئەوانە، چ پەیامبەر بووبن، پاشان، ئامۆژگاریی و ڕێبازەكانیان تێكدرابێ، چونكە، ئێستە « بووزایی »یەكان، « بووزا » دەپەرستن. « زەردەشتیی »یەكان ئاگردەپەرستن. بە دڵنیاییەوە، هیچ پەیامبەرێكی خوا نەهاتووە، جگە لە خواپەرستیی، خەڵك بۆ شتێكی

دیکە بانگا، تا بیپەرستێ. کەواتە: ئەوەی بنەڕەتێکی ئاسمانیی بووە و تێکدراوە، یا هەر لە بنەڕەتدا، دەقێکی ئاسمانیی نەبووە، هەر کامێکیان بێ، لەبەرئەوەی، کۆمەڵێ مرۆ، شوێن ئەو بیرە کەوتوون، ئێمە، ئەوانە، وەک کۆمەڵێ مرۆ، کە بڕوایان بەوە هەیە، چ ئایینەکەیان، بنچینەیەکی ئاسمانیی و خوایی هەبێ، چ هیچ بنچینەیەکی خوایی نەبێ، ڕێزیان لێ دەگرین.

بۆ نموونە: لە کۆڕێکدا، باسی « سیکولاریزم »م کرد. هەڵبەتە، کەسانێکی « سیکولاریست »، باوەڕیان بە ئایین نییە، دەسکاریی ژین بکا. چونکە، واتای ڕاستەقینەی خۆی، ئەوەیە: ئایین لە ژین دابڕێ، نەک ئایین لە دەوڵەت جیاکاتەوە، واتە: ئایین، پێوەندیی بە سەر ژینەوە نەمێنێ، حسێب بۆ خوا نەکرێ، چی فەرمووە. بەڵکوو، خەڵک چۆنی پێخۆشە و چۆنی پێ چاکە، وا بکا، تەماشای ئەوە نەکرێ، خوا چی فەرمووە؟ پەیامبەر « د.خ.» چی فەرمووە؟ ئێمە، گەر خەڵکێکی « سیکولاریست »یش بێ، بەپێی ئەو لێکدانەوەیە بێ، خۆ هەر بە هیچ جۆرێ، فڕی بە سەر ئایینیشەوە نییە، چونکە « سیکولاریزم » واتە: بێ ئایینیی، « جیهانگەرایی » و گوێ بە ئایین نەدان. لە « شەریعەت »ی ئیسلامییدا، هەر جێیدەبێتەوە. لە کۆمەڵگەیەکی ئیسلامییدا، گەر دەسەلاتیشی ببێ، ئەوە کۆمەڵێ مرۆن و باوەڕیان بەو بیرە هەیە. جا، بیرەکەی، چ بنچینەیەکی خوایی هەبێ، چ نەبێ، ڕێزمان بۆ مرۆ هەیە. واتە: بۆ هەموو مرۆڤێ کە وا دەبینین، خوای پەروەردگار، ئەو ڕێزەی بە هەموو مرۆڤێ داوە، بە ئارەزووی خۆی، بیروباوەڕی خۆی دیارییکا. (فمن شاء فالیؤمن و من شاء فالیکفر)، ( لا اکراه فی الدین.)

ــ ئەو ئایینانە، « کاکەیی، زەردەشتیی و یەزدیی » ئایینی کوردین و لە نێو کۆمەڵی کوردەوارییدا هەن.

من پێم وایە، « یەزدیی و کاکەیی » و ئەوانە، ڕەنگە، لە بنەڕەتدا، هەر ڕێبازی « سۆفیگەریی » بووبن، وەک لە هێندێ سەرچاوەدا، بەرچاوم کەوتووە. دوایی شێوێنرابن، شوێنکەوتووەکانیان شێواندبێتیان.

ــ ئێستە، ئێوە وەک گرووپێکی ئیسلامیی، تێڕوانینتان بۆ ئەوانە چییە؟

ئێمە، وەک کەمایەتییەکی ئایینیی تەماشایاندەکەین.

ــ مافیان دەدەنێ، ئەرکە ئایینییەکانی خۆیان جێبەجێکەن؟

من دەڵێم: نەک هەر ئەوە، بەپێی بیروڕای بەهێزترین زانایان، گەر خەڵکێ هەبن، کۆمەڵێ بێ باوەڕ هەبن، هەر لە بنەڕەتدا، با، باوەڕیشیان بە یەزدان نەبێ، نەک باوەڕیان بە پەیامبەر « د.خ. » نەبێ، بڕوایان بە هیچ یەکێ لە پەیامبەران نەبێ، بڕوایان بە خوای پەروەردگاریش نەبێ، لە دەوڵەتی ئیسلامییدا، لە ژێر سایەی ئیسلامدا دەتوانن، بژین. دەبێ، بژین، دەبێ، هەموو ئەو مافانەی، ژیانی مرۆڤێکی بەڕێز، پێویستییان پێی هەیە، بۆیان دابینکرێ. چونکە، خوای پەروەردگار، ئەم گەردوونەی، بۆ تاقیکردنەوەی مرۆ داناوە، واتە: خۆی شتەکە قووڵە.

ــ بەڵێ. وایە.

خوا ژیانی داناوە، بۆ ئەوەی، مرۆڤی تێدا تاقیکاتەوە. بۆ ئەوەی، ئەو مرۆڤە تاقیکرێتەوە، دەبێ، دەرفەتی بدرێتێ، لەو تاقیکردنەوەیەدا دەرچێ، یا دەر نەچێ. تاقیکردنەوە، واتای چییە؟ واتە: ماوە بە مرۆ بدرێ، وەڵامی ڕاست، یا وەڵامی هەڵە بداتەوە. کەی ئەو دەرفەتە بە مرۆ دەدرێ؟ ئەو کاتەی، لێی گەڕێی و لە سەر ئەم زەوییە بژی. هەروەها، لەو ناز و خۆشییەی خوا، لە سەر ئەم زەوییە دایناوە، هەرچی ژیانی مرۆڤێکی بەڕێز و ڕێزلێگیراو شایەنیبێ، بیدەیتێ. (لقد كرمنا بني ادم) خوای مەزن جارێ پێش ئەوەی، باسی ئایین بکا، باسی مرۆڤی کردووە، کە مرۆ ڕێز لێ گیراوە، ( لقد خلقنا الانسان من احسن تقويم.) ئەو تاقیکردنەوەیەی خوا، مرۆی بۆ ئەفراندووە، دەوڵەتێ، لەو فەلسەفە ئایینییەوە هەڵقووڵێ و سەرچاوەبگرێ، کە دەوڵەتی ئیسلامییە، لە بەر ڕۆشنایی ئەو بۆچوونەدا، مرۆ بۆی هەیە، ڕێی چەوت یا ڕێی ڕاست بگرێ. بۆی هەیە، وەڵامی ڕاست یا هەڵە بداتەوە. لەبەرئەوە دەبێ، ماوەی بدرێتێ، تا ئەو ژیانە بژی، ژیانێکی وا بژی، شایستەی مرۆ بێ. بۆیە، لە ژێر سایەی دەوڵەتێکی ئیسلامییدا، هەمو خەڵک، هەموو بیرێ، بە خوانەناس و گاووریشەوە دەبێ، دەرفەتیان بدرێتێ و پێوستییەکانی ژیانیشیان بۆ دابینکرێ.

پ26 : کەواتە: ئازادیی و دیمۆکراسیی لە ئیسلامدا هەیە؟

و26 : ئازادیی لە ئیسلامدا هەیە. ئازادیی بیروڕادەربڕین، بە شێوەیەکی ڕەها و بێ هیچ سنورێ هەیە. بێ گومان، ئازادیی جنێودان نییە. ئازادیی خواپەرستیی هەیە. ئازادیی کارکردن و نانپەیداکردن هەیە.

بەلام، وەک چۆن پیاوێکی موسوڵمان دەچێ، لە « بریتانیا، ئەمێریکا، فەرەنسە ... » دەژی، دیارە دەبێ، بەو ڕەوشت و ڕێوشوێنە گشتییەوە پابەندبێ، کە ئەو دەوڵەتە دیارییکردووە، ڕێزی بۆ دابنێ، وا نییە؟ خۆ نابێ، هەر لەبەرئەوەی، دیمۆکراسیی هەیە، بچێ، جنێو بە خەڵک بدا، شەق لە خەڵک هەڵدا، خەڵک بکوژێ، شتی خراپە، بەرانبەر بە خەڵک بکاو ئاژاوەبنێتەوە! بە هەمان شێوەش، لە ژێر سایەی دەوڵەتێکی ئیسلامییدا، ئەو هاوولاتییانەی هەن، گەر هاوئایین نەبن، هاوژینن. هاوئایینەکە، ئەوە بەپێی ئایین بەڕێوەدەچن. بەلام، هاوژینەکە دەبێ، ڕێزی ئەو ئایینە بگرێ، ڕێزی ئەو سیستێمی فرمانڕەواییە بگرێ. لەگەڵ ئەوەشدا، پارێزگاریی بیروباوەڕی خۆشی بکا، لە سەر بۆچوونی خۆی، لە سەر بێ ئایینیی خۆی، یا لە سەر ئایینی خۆی بمێنێتەوە.

پ27 : ئایینی « جوو و فەلە »، وەک ئایینەکانی دیکە نین، ئایینێکی نەتەوەیی و تەسک بن. بەڵکوو، ئەو دوو ئایینە، وەک ئایینی ئیسلام، دوو ئایینی جیهانین، لە سەر ئاستی جیهان دانراون و بۆ هەموو کۆمەڵگەی مرۆ هاتوون. بەلام، لە قۆناغێکی دیاریکراودا هاتوون. چۆن لەو دوو ئایینە دەڕوانی؟ تۆ بەگوێرەی دەقی « قورئان » ڕەتیاندەکەیتەوە، یا ڕەتیان ناکەیتەوە؟

و27 : نا نا.

ــ ئاخر، ئایەتی « قورئان » هەیە، ڕەتیاندەکاتەوە.

بەڵێ. ئێستە باسیدەکەم. جارێ ئایینی « جوو »، ئایینێکی داخراوە.

ــ بەڵێ وایە.

ئێستە، « جوو »ەکان، جگە لە خۆیان، کەسی دیکە وەر ناگرن. بەلام، ئایینی « فەلە »، ئایینێکی کراوەیە و خەڵکی دیکە وەردەگرن. ئەو لێبووردنەی، لە ئایینی « فەلە »شدا هەیە، لە ئایینی « جوو »دا نییە. چونکە، ئەوان توندتر و گیرترن. خوای پەروەردگاریش فەرموویەتی: (لتجدن اشد الناس عداوه للذین امنوا یهود و الذین اشرکوا و لتجدن اقربهم موده للذین امنوا الذین قالوا انا نصری.) واتە: سەرسەختترین دوژمنانی ئێوە، « جوو »ەکان و هاوبەشپەیداکارەکانن. بەلام، نزیکترینیان دۆستایەتییان لەگەڵتان هەبێ، ئەوانەن، کە دەڵێن: ئێمە « فەلە »ین.

پاشان فەرموویەتی: (ذلک بان منهم قسیسین و رهبان هم لا یستکبرون.) بێ گومـان، ئایینی « فـەلـە »، لەگەڵ لێبـووردن دایە، لەگەڵ گیـانداریی و ڕەوشت دایە.
ــ وەک دەڵێن: پەیامبەر « مەسیح » فەرموویەتی: گەر یەکێ شەپازلەیەکی لە لای ڕاستت دا، لای چەپی بۆ بکەرەوە.
ئا. جـا، لەو باوەڕەوە فـەرموویەتی: هێندێ « قـەشـە و ڕەبەن »یان هەن، وازیان لە ژیانی سەر زەویی هێناوە، خۆیان بە زل ناگرن و فیزیان نییە.
« عـیـسـا د.خ. » نموونەی بێ فـیـزیی و خـۆ بەکـەمگرتن بـوو. هەمـوو پەیامبەران هەر وا بوون. بەڵام، هەمـــوو ئەو زانیاریی و ئامۆژگارییانەی « مەسیح »، تا ئەندازەیەک، هەر ماونەتەوە. کەچیی، ئەوەی « موسا د.خ.» « جوو »ەکان شێواندوویانە.
ســـــــەبارەت بەوەی، ئایا، ئایەت هەیە، ئەوەمان بۆ دەرخا، ئەو ئایین و « شـەریعـەت »انە ڕەتکاتەوە؟ چونکە، ئێمە دەڵێین: سەرچاوەی ئایینەکـان یەکن. بەڵام، بەرنامەکانیان جیاوازیی هەیە. ئەگینا، تەنیا پێنج پەیامبەر، پێیان دەگوترێ: « ئولو ئەلعەزم » واتە: ئەو پەیامبەرانەی، خاوەنی ویستی پتەوتربوون، وەک: « نووح،ابراڤیم، موسا، عیسا و موحەممەد ــ د.خ. » ئەو پێنج پەیامبـەرە، لە هەمـوو پەیامبـەرانی دیکە، پایە بەرزتربوون. خـوای گەورە فـەرموویەتی:(شرع لکم من الدین ما وصی به نوحا و الذی اوحینا الیک ما وصینا به ابراهیم و موسی و عیسی ان اقیم الدین و لا تتفرقوا فـیـه.) فـەرمـوویەتی: ئەو ئایینەی بۆمـان دیارییکردووی، هی هەر پێنج پەیامبەرەکانە. ئایین واتە: ئەو بەرنامە گشتییەی، خوا بە پەیامبەراندا، بۆ مرۆڤایەتیی ناردووە. بەڵام، بەرنامەی ئایینی واتە: « شەریعەت »ی هەر پەیامبـەرێ، بەپێی هەلومەرجی گەلەکەی بووە. واتە: « شـەریعـەت »ەکان جیـان. ئەگینا، بنچینەی هەمـوو ئایینەکـان ئەوەیە، گـوتوویانە: دەبێ، بەندایەتیی بۆ خوا بکرێ، بەپێی ئەو ڕێبازەی خوا دەستنیشانیکردووە.
ــ سەرچاوەکان هەموو یەکن.
ئا، سەرچاوەکان یەکن، بەڵام، جۆگەلەکان جیان.
ــ بەڵێ.
بۆچی، جـۆگەلەکـان جیـان؟ چونکە، بەپێی هەلومەرجی، ئەو کۆمـەڵگە و گەلانە، کە پەیامبەرانی تێدا ژیاون، پێویستیکردووە، بەرنامـەکانیش جۆرا

وجۆرین، گونجاوین، پڕ بە پێویستیی ئەو بارە ڕیالیزمانەی ئەو سەردەمانە بن. جا لەو ڕوانگەیەوە، خوای پەروەردگار، کە « موحەممەد د.خ. »ی ناردووە، ڕوونیکردۆتەوە و ڕایگەیاندووە، فەرموویەتی: (ما کان محمد ابا احد من رجالکم و لکن رسول الله و خاتم النبین و کان الله بکل شیء علیما.) « موحەممەد ــ د.خ. » کۆتایی پەیامبەرانە...

ــ بەڵێ.

کەواتە: « شەریعەت »ەکەشی، کۆتایی « شەریعەت »ەکان و هەموو بەرنامەکانە. خوای پەروەردگار ڕایگەیاندووە و فەرموویەتی: (و ما ارسلناک الا کافە للناس بشیرا و نذیرا.) تۆمان، بۆ تێکڕای خەڵکیی ناردووە.

یا فەرموویەتی: (و ما ارسلناک الا رحمە للعالمین.)

هەروەها، پەیامبەریش « د.خ. » لە چەن فەرموودەیەکی « صحیح »دا فەرموویەتی: (لو کان موسی بین اظهرکم ما وسعوە الا تباعی.) من هاتووم، گەر « موسا » بمایە، لە نێو ئێوەدا بووایە، دەبوو، شوێن من بکەوتایە.

هەروەها، لە فەرموودەی « صحیح »دا هاتووە: « عیسا »، لە کۆتایی جیهاندا دێ، « جەجاڵ » دەکوژێ. ئەویش، هەر بە « شەریعەت »ی « موحەممەد د.خ. » فرمانڕەواییدەکا. واتە: کۆمەڵێ ئایەت و گوتەی پەیامبەر، لە سەر ئەوە هەن، ئەو « شەریعەت »ەی بۆ « موحەممەد موستەفا ــ د.خ. » هاتووە، هەر ئەو « شەریعەت »ەیە، پڕ بە پێستی ژیانی کۆمەڵگەی مرۆیە.

ــ بەڵێ. بەلام

هەر بۆیە، بەڵگەی هەموو پەیامبەران، جگە لە بەڵگەی « موحەممەد د.خ. »، بەڵگەیەکی ماتیریالیی بووە. واتە: بەرهەستبووە. بۆ نموونە: بەڵگەی پەیامبەریی « صالح »، حوشترێ بووە، لە بەردێ هاتۆتەدەر. بەڵگەی « موسا »، گۆچانەکەی بووە، دەسی پیرۆزی بووە، کە وەک گڵۆپ داگیرساوە و چەن شتی دیکەشی هەبووە. بەڵگەی پەیامبەرێتی « عیسا » ئەوە بووە، مردووی زیندووکردۆتەوە، نەخۆشە جۆراوجۆرەکانی چاک کردۆتەوە. چونکە، بەڵگەی هەر کام لە پەیامبەران، بەپێی ئەو هەل و مەرجەی، لە نێو کۆمەڵگەی مرۆدا تێیدا ژیاون، ڕوویانداوە. دەتوانم، بڵێم:

ئەو کاتە، لە قۆناغێکی ناپوختەیی و ناکامڵییدا بووە. بۆیە، بەڵگەکەش، بەڵگەیەکی بەرهەست و بینراوبووە.
بەڵام، کاتێ مرۆ، پێی لە قۆناغی پێگەیشتن و گەورەبوون ناوە، ئەو کاتە، وای پێویستکردووە، بە ژیریی خۆی، هەست بە بەڵگەکان بکا، پەی بە بەڵگەکان بەرێ، بەڵگەیەکی ژیریی بۆ نێرراوە، کە ئەویش « قورئان » بووە. پەیامبەر « د.خ. » فەرموویەتی: خوا هیچ پەیامبەرێکی نەناردووە، گەر بەڵگەیەکی نەدابێتێ، کە خەڵک لە بەر ڕۆشنایی ئەو بەڵگەیەدا، باوەڕی پێ بکەن. ئەو بەڵگەیەی بە منیش دراوە، « سرووش »ە. واتە: پەرتووکی خوایە. ئومێددەکەم، لە هەموویان پتر، شوێنکەوتووی هەبێ.
لە کاتێکیشدا هاتووە، مرۆڤایەتیی بەوە گەیشتووە، چی دیکە، چاوەڕێی شتی سەرسوڕهێنەر « خاریق ئەلعادە » نەبێ. چاوەڕێ نەبێ، مردوو زیندوویێتەوە، ئینجا، باوەڕبێنێ. بەڵکوو، چاوەڕێی بەرنامەی ژیان بێ. چونکە، ئەوەی کۆمەڵگەی مرۆ، ئێستە پێویستی پێی هەیە، دوای ئەوەی، ژمارەی مرۆ لە سەر زەویی زۆربووە، زۆر گرێگۆڵی تێکەوتووە، سەر زەویی جمەیدێ، پێویستی بە بەرنامەیەکی ڕێکخەر و بەختەوەرکەری خەڵک هەیە، ئەوەش، لە « قورئان و سووننەت »دا خۆی دەبینێ.
ــ بەڵام، من بیستومە، پەیامبەری خۆشمان، هێندێ بەڵگەی هەر هەبووە. وەک کاتی خۆی، لێیان پرسیوە، بەڵگەی پەیامبەرییت چییە؟ ئەویش، پەنجەی بۆ مانگ ڕاکێشاوە، دوولەتبووە.
بەڵێ. پەیامبەر نەک هەر ئەو بەڵگەیەی هەبووە، بەڵکوو، بەڵگەی دیکەشی هەبووە. بۆ نموونە: سی هەزار لە هاوەڵانی، لە جەنگی « تەبووک »دا، ئاویان لێ براوە. پەیامبەر « د.خ. »، دەسی پیرۆزی ڕاگرتووە، وەک کوندەی سەربەرەوژێر، ئاو لە نێوان پەنجە پیرۆزەکانییەوە دەرهاتووە، هاوەڵەکانی تێر ئاو بوون. خواردنی کەم، بەشی سێ چوار کەسێ بووە، نزای بە سەردا خوێندووە، بەشی چەن سەد کەسێکی کردووە. ئەمانەش، چەن جارێ دووبارەبوونەتەوە. جگە لەوەی، بەرد و دەنکە چەو لە دەسیدا، « سوبحانەڵڵا »ی کردووە. واتە: گەلێ بەڵگەی دیکەشی بووە.
بەڵام، ئەو بەڵگانە، بۆ موسوڵمانان بوون. ئەوانە هەموویان، بۆ خەڵکی باوەڕدار بوون، بۆ ئەوەی، باوەڕیان پێی زیاتربێ. وەک چۆن ئێستەش، « کەراماتی ئەولیا » هەیە، کەسانێ گەر چاکبن، دەگونجێ، هێندێ لەو

شتانە، لە سەر دەسی ئەوانیشدا ڕوویدا. بەڵام، ئەو بەڵگەیەی پەیامبەر هەیبووە، بەربەرەکانیی و مەیدانداریی خەڵکی « گاوور »ی پێ کردووە، دژی نەیارەکانی پێی دواوە، تەنیا « قورئان » بووە. بەڵێ، لە گـــــوتەی « صەحیحی موسلیم »دا هاتووە، هەر وەک ئایەتێکیش ئامـاژەی پێ کردووە، (اذا اقتربت الساعه و انشقت القمر.)
لە فەرموودەیەکی « صحیح »دا فەرموویەتی: پەیامبەر « د.خ. » لە شاری « مەککە »، ئامـاژەی بۆ مـانگ کـردووە و مـانگ دووڵەتبـووە. بەڵام، ئەو بەڵگەیەش، هەر وەک هی پەیامـبـەرانی دیکە وابووە، ئەوانەی ئەو کـاتە بینیویانە، بۆ ئەوان بەڵگە بوون. بەڵام، بۆ ئەوانەی دیکەی نەیانبـینیـوە، مەگەر باوەڕ بە پەیامبەرێتیی « موحەممەد ـ د.خ.» بکەن، ئەگینا بە بەڵگە ناژمێررێن. بەڵام، « قورئان » بەڵگەیە، لە ئارادایە و بەرانبەر دەوەستێ!

پ28 : بەڵێ وایە. بەڕێزت، ڕات دەربارەی ئایینزای « شیعە » چییە؟
و28 : « شیعە » کۆمەڵێکن، لە نەتەوەی پەیامبەر « د.خ.» بەڵام، لەو ڕێبازە گشتیی و ڕاست و فراوانەی، چوار جێنشینە سەرڕاستەکەی پەیامبەر، لە سەری ڕۆشتوون، لە هێندێ شتدا لایانداوە. لە سەرەتاوە، لادانەکە کەم بووە. دوایی، تا ڕۆژگار درێژبۆتەوە، کۆشەی لادانەکە فراوانتربووە.
لە سەرەتاوە، « شیعە » وا دروستبووە. لە سەردەمی ئیمام « عەلی »دا، کۆمەڵێ پشتگیرییان، لە بیر و بۆچوونەکانی کردووە. بێ گومان، ئەوانە، لە سەردەمی خۆیاندا ڕاستبوون و ڕاستییان پێکاوە. ئیمام « عەلی » جێنشینی موسوڵمانان بووە. لەگەڵ هەموو نەیارەکانیدا، « ئیمام » لە سەر ڕەوابووە. لە بەرانبەر « معاویە »دا، لە بەرانبەر « خەوارج »دا، لە بەرانبەر « تەڵحە، زوبێر و عائشە »دا، ئیمامی « عەلی » لە بۆچوونەکانیدا، ڕاستیی پێکاوە.
بەڵام، دوای خۆی و لە ئەنجامی ئەوەدا، ئیمام « حەسەن »، بە شێوەیەکی تراژیدییانە سەریناوەتەوە. هەروەها، بیستووتە، ئیمام « حوسێن »یش، چۆن شەهیدکراوە؟ لە دوای خۆشی، « برایم و موحەممەد ئەلزەکیە » پاشان، « زەین ئەلعابدەین، زەیدی کوڕی عەلی » و ژمارەیەکی دیکە، لە « ئەهل و بەیت »، زۆر بە شێوەیەکی تراژیدییانە شەهیدکراون. لە بەرانبەر زۆرداریی و ستەمی « ئەمەویی و عەبباسیی » ڕاپەڕیوون، بۆ

ئەوەی، ئەو ڕێبازەی دەیانەوێ، بەرەو دیکتاتۆریی و سەرکووتانەوەی بەرن، ڕاستیکەنەوە و بۆ « شوورا »ی بگێڕنەوە. لە ئەنجامدا کوژراون. شوێنکەوتووانی ئەو ڕێبازە، کە لە سەرەتاوە پێیان گوتراوە، « شیعەت عەلی »، چونکە « شیعە » واتە: کۆمەڵ.

ــ بەڵێ، واتە: کۆمەڵی « عەلی ».

دوایی، دەستی پیسی خەڵکیش، لە کێشەکە وەردراوە. هەڵبەتە، دەستی پیسی « فارس »ەکان، لە دژایەتییکردنی « عـــەرەب »، یا، دەستی پیسی « جوو »ەکان، لە دژی موسوڵمانەکان، یا، دەستی پیسی « عەبدوڵڵای کوڕی سەبەء » لە سەرێکەوە و « مەجووسیی »یەکانیش لە سەرێکی دیکەوە، « باطنیی »یەکان لە لایەکی دیکەوە، هەموو ئەوانە، لە ژێر پەردەی « شیعەگەریی »، بە پشتگیرییکردن و خۆشویستنی « ئەهل و بەیت »، کۆمەڵێ شتیان داهێناوە، بە داخەوە ئێستە، بەو شێوەیەی لێهاتووە. بێ گومان، کاتی خۆی کۆمەڵەکانی خەڵک، زۆرزۆربوون، واتە: بە « 60 - 70 » دەژمێرران.

ــ بەڵێ. من مەبەستم ئەوەیە، ئێستە ڕاتان چییە؟

ئاخر، ئێستە « شیعە » سێ بەشن، هەر یەکێ لەو سێ بەشە، هەڵوێستی تایبەتیی خۆیان هەیە. « شیعە »ی « زەیدیی » هەن، لە « یەمەن » دەژین. ئەوانە، لە « ئەهلی سوونـنە و جەماعەت »ەوە، بە نزیکترین کۆمەڵ دەژمێررێن. لەگەڵ ئیمام « عەلی »دا، باوەڕیان بە جێنشینێتیی « ئەبو بەکر، عومەر و عوسمان »یش هەیە. من سەردانی « یەمەن »م کردووە. گوێم لە گوتاربێژەکەشیان بووە، باسی ئەو سێ جێنشینەی کردووە و گوتوویەتی: خوایان لێ ڕازیبێ! هەروەها، باوەڕیشیان بە فەرمایشتەکان هەیە، کە هاوەڵان دەیانگێڕنەوە. واتە: لە زۆر شتدا، لە ئێمەوە نزیکن. یەکێ لەوانە، « شەوکانیی » بوو، کە لە سەرەتاوە، « شیعە »ی « زەیدیی » بووە. دوایی، بە یەکجاریی، ڕێبازی « ئەهلی سوونـنە و جەماعەت »ی پەسەندکردووە.

« شیعە »ی « جەعفەریی » هەیە، یا « شیعە »ی « دوازدە ئیمامیی ». ئەوانەی « ئێران، پاکستان، لوبنان ... » و گەلێ شوێنی دیکەش، باوەڕیان بەم جۆرە هەیە. بێ گومان، « شیعە » بە زۆریی، دوای ئەم ڕێبازە کەوتوون. ئەوانە، هێندەی « شیعە »ی « زەیدیی »، لە « ئەهلی

سووننە و جەماعەت »ەوە نزیک نین. بەڵام، ئەوانیش هەر لە بازنەی نەتەوەی ئیسلامدا دادەنرێن. واتە: هەر « ئەهلی قیبلە »ن.
بەڵام، هێندێ جیاوازیی هەیە. لە بنەڕەتدا، پتر جیاوازیی « ڕامیاریی » بووە. کەچیی، ئێستە شێوازێکی « فیقهیی » و هێندێ شتی دیکەشی وەرگرتووە، وەک گۆڕان لە درووشمەکانی خواپەرستیی، (اشهد ان علی ولی الله » لە بانگدا زیادیانکردووە. هەروەها، کێشەی « تووریە » دانان، ئەو شتانە خۆیان زیادیانکردووە. من وتووێژم لەگەڵیاندا بووە. ئەوانەش بە جێی خۆی، ئەوانەش هەر لە بازنەی موسوڵمانیێتیی دان. برای باوەڕمانن. بەڵام، تێبینیمان لە سەریان هەیە، بە تایبەتیی، ئەوەی دان بە سێ جێنشینەکە « ئەبو بەکر، عومەر و عوسمان »دا نانێن، وەک جێنشینی چوارەم، جێنشینی ڕەوای موسوڵمانان بوون! ئەوەش، خۆی لە خۆیدا، بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ، دادپەروەریی و ئازایەتیی ئیمام « عەلی » لەکەداردەکا. چونکە، گەر « عەلی »، شێری خوا بووبێ، چۆن هێشتوویەتی، ئەو سێ کەسە، جێنشینی پەیامبەر « د.خ. » بن؟!! چۆن ڕێیداوە، ئەوانە، لە جێی پەیامبەر « د.خ. » دانیشن، گەر شایستەی ئەوە نەبووبن؟ پاشان، بەرانبەر دادپەروەریی هەموو هاوەڵان، بە جۆرێ لە بێ ڕەوشتیی دادەنرێ. ئەو هاوەڵانە، چۆن هێشتوویانە، ئەو سێ پیاوە، جێنشینیی پەیامبەر « د.خ. » بکەن و گەورەی موسوڵمانان بن، کە شایستەی ئەوە نەبوون؟ هەرچی چۆنێبێ، ئەوە بە ڕێژەی ئەوانەوە وایە.
« شیعە »ی « عەلەویی » هەن. « نووسەیریی »شیان پێ دەڵێن. نەمبینیوە، هیچ کام لە زانایانی ئیسلام، ئەوانە بە « ئەهلی قیبلە » و ئیسلام دانێن. چونکە، ئەوانە کۆمەڵێ شتیان هەیە، باوەڕیان بە پێنج نوێژە فەرزەکان نییە، وەک خوا، لە ئیمام « عەلی » دەڕوانن. باوەڕیان بە « حەج » کردن نییە.
— عەلی ئیلاهیین!
بەڵێ. « عەلی ئیلاهیی »شیان پێ دەڵێن.
— کۆمەڵێکی زۆر لەوانە، لە « باکووری کوردستان »یش هەن و بە « عەلەویی » ناسراون.
بەڵێ. دەڵێن: کوردیشیان تێدا هەن. جا، بە ڕاستیی نازانم، ڕەنگە، هەر « عەلەویی »یەکانیش، دوو سێ جۆر بن.

ــ بەڵێ.
بەڵام، جا ئەوانەی « شیعە » بن، یا « سۆفیی » بن، یا « دەروێش » بن، یا هەر موسوڵمانێکی دیکە بن، خۆیان بە « سوونن‌یی »ش بزانن، هەر کامێ، لەو شتانەی بە ئاشکرا دیارە، کە « کوفرە »، تێیاندا بوو، دوای ئەوەی، بۆیان ڕووندەکرێتەوە، هەر دەسبەرداری نابن، بێ گومان، بە موسوڵمان دانانرێن. هێندەی من زانیاریم، لە سەر « شیعە »ی « نووسەریی » هەبێ و « عەلەویی » یا « عەلی ئیلاهیی »شیان پێ دەڵێن، ئەوانەن، کە « عەلی » بە خوا دەزانن!
ــ بەڵێ وایە. واتـــــە: ئێوە هەر سێ گرووپە « شیعە »کە، بە موسوڵمان دەزانن؟
نەخێر. ئێمە « عەلەویی »یەکان، بە موسوڵمان نازانین.
ــ بە موسوڵمانیان نازانن؟!!
وەک گوتم: نەمبینیوە، هیچ زانایەکی ئیسلام، کاتێ، باسی پۆلەکانی موسوڵمانانیان کردووە، ئەو کۆمەڵە « شیعە »یەیان، بە « نووسەیریی، عەلەویی و عەلی ئیلاهیی » ناسراون، لە ڕیزی موسوڵماناندا دایان نابن.
ــــ باشــــە، گەر هەر بۆ نموونە، « طالیبان »ەکانی « ئەفگانستان » بگرین، کاتێ، دەسیان بە سەر دەسەڵاتی دەوڵەتدا گرت، « شیعە »یەکی زۆریان، هەر سەربڕی و لەنێوبرد، ئەوەیان چی بوو؟
کاک دوکتۆر! ئێمە، نەک هەر ئەو ڕەفتار و هەڵوێستەی « طالیبان »، بەڵکوو، گەلێ شتی دیکەشیان بووە، بە هەڵەمان زانیوە. ئێمە، هەر شێوەی دەسبەسەراگرتنی دەسەڵات، لە لایەن « طالیبان »ەوە، بە شێوەیەکی ڕاستمان نەزانیوە.
ــ نا، نا، دوایی لەو باسە دەدوێین. بەڵام، هەر لێرەدا دەڵێم: بۆچی ئـــەو کردارەیان تواند، هەڵبەتە، بە موسوڵمانیان نەزانیون؟!!
وەڵڵایی، من بە کــــردارێکی هەڵەم زانیـــوە. چونکە، گــــریمان بە موسوڵمانیشیان نەزانیبن، چۆن دەبێ، ئەو کارەبکەن؟ جا خۆ مافێکیان هەر هەیە! واتە: خوا وەک مرۆڤێ درووستیکردوون، هەر هیچ نەبێ، پێش ئەوەی بیانکوژن، دەبوو، بانگیانکەن و بڵێن: فەرموون وەرن، موسوڵمانبن!
ــــ ئاخر، یەکێ لە ناکۆکییەکانی، نێوان هـــەر دوو دەوڵەتی « طالیبان » و « ئێران »یش، ئەوەبوو.

دەزانم. وەڵلا، ئێمە ئەوە بە هەڵە دەزانین. بە تایبەتیی، بۆ « طالیبان »، تازە دەوڵەت بوو، هەر لە ڕێوە، دەس بە خەڵک کوشتن بکەن، ئینجا، بە تایبەتییش « شیعە ». ئاخر، « شیعە » خۆ کەم نین.
ـ بەڵێ وایە.
« شیعە »، لە نێو موسوڵمانانددا، بە هەموویان سەد میلیۆن دەبن. ئاخر، تۆ بە نووکەپێنووسێ بڵێی: وەڵلا کاکە، هیچیان موسوڵمان نین، ئەوە شتێکی خراپە!

پ29 : ئەدی، ئەو دوو ڕێبازە سەرەکییەی لە نێو ئیسلامدا هەن، بە تایبەتیی، لە « کوردستان »دا زۆر بڵاون و بە « قادریی و نەقشیی » ناسراون، لە ڕوانگەی ئیسلامەوە، چۆن هەڵیاندەسەنگێنی؟
و29 : بەڵێ. دیارە، هەموو قوتابخانەکانی « سۆفیگەریی »، هەموو ڕێبازەکانی « سۆفیگەریی »، قوتابخانەی پاککردنەوەی دڵ و دەروونی مرۆڤن، قوتابخانــەی پەروەردەکردنی مرۆڤن. وەک چۆن، قوتابخانەکانی « فیقە »، وەک: « حەنەفیی، شافیعیی، مالیکیی، حەنبەلیی، جەعفەریی، زەیدیی، ئەبو جەعفەری طەبەریی، ئەوزاعیی، لەیسیی و ظاهیریی » ئەوانە هەموویان، قوتابخانەی « فیقهی »ن.
ـ ئەوانە ئایینزابوون، لەگەڵ ڕێبازدا جیاوازییان هەیە.
بەڵێ. دەمەوێ، بۆت ڕوونکەمەوە. ئەوانە هەموویان ئیشیان چی بووە؟ ئەو قوتابخانە « فیقیهی »یانە، ئیشیان ئەوەبووە، هەموو ئەو ئایەت و فەرموودانەی پەیامبەر « د.خ. »، باسی بڕیارە « شەرعیی »یەکان دەکا، بۆ موسوڵمانانی شیکەنەوە.
قوتابخانەکانی « سۆفیزم »، ئیشیان چی بووە؟ ئیشیان ئەوەبووە، ئەو ئایەت و فەرموودانەی پەیامبەر « د.خ. » کە باسی پاککردنەوەی دەروون و ڕەوشتی کردووە، چۆن مرۆ ڕەوشتی خۆی جواندەکا؟ چۆن خووی خراپ، لە خۆی لادەبا؟ چۆن لە خوا نزیکدەبێتەوە؟ چۆن خواپەرستییەکەی، چاکتردەکا؟ چۆن دەروونی خۆی خاوێندەکاتەوە؟ ڕێبازەکانی « سۆفیزم »، باسی ئەوانە دەکەن. ئێمە، بەو شێوەیە، لە بنچینەی ڕێبازی « قادریی و نەقشیی » دەڕوانین. من پەرتووکێکی تایبەتییم، لەو بارەیـــــەوە هەیە، « ڕێگەی صاڵحبوون و بەرەو خواچوون، تەذکیەی نەفس، لە بەر ڕۆشنایی

قورئان و سووننەتدا » گەر دەستکەوێ، زۆر باشە. باسمکردووە، ڕێبازی « قادریی » لە بنەڕەتدا، « عەبدولقادری گەیلانیی » دایمەزراندووە و بە یەکێ لە زانا بەرجەستەکانی ئیسلام دەژمێررێ.
« عەبدولقادری گەیلانیی »، بە « شێخ » ناسراوە. بەڵام، لە ئایینزای ئێمەدا « شافعیی »، هەروەها، لە ئایینزای ئیمامی « ئەحمەدی بین حەنبەل »یشدا، فەتوایداوە. واتە: خۆماندووکارێکی ئایینزایی بووە، لە دوو ئایینزادا، کۆششیکردووە. بەڵام، پتر خەسڵەتی « شێخێتیی » و مامۆستایێتیی بە سەردا زاڵبووە. خەڵک، لە سەر دەسی ئەودا، چاکبوونەتەوە، تۆبەیانکردووە و گەڕاونەتەوە.
ڕێبازی « نەقشیی »، « بەهائەدین نەقشبەند » دایناوە، کە لای « بوخارا » و ئەو ناوانە ژیاوە. ئەویش، پیاوێکی چاک و یەکێ لە مامۆستاکانی خەڵکی زانستپەروەر بووە. یەکێکیش لە شوێنکەوتووانی ڕێبازگەی « نەقشیی »،
ــ « مەولانا خالید » بووە.
« مەولانا خالیدی جاف »ە، جافی « میکایلیی » بووە.
ــ لە « کوردستان » ئەو دایمەزراندووە؟
بەڵێ. لە « کوردستان »دا، ئەو دایمەزراندووە. لە « شام » و زۆربەی وڵاتانی ئیسلامییش، شوێنکەوتووی هەبووە و هەیە. ڕێبازەکەی، لە دوای خۆی پێی دەگوترێ: « ڕێبازگەی خالیدیی ». یەکێ لە شوێنکەوتووە ناسراوەکانیشی، « سەییید ئەحمەدی سەرهەندیی » بووە و بە ئیمامی « ڕەبانیی » ناویدەرکردووە. ئێمە، بە چاوی ڕێزەوە، لە بنچینەی ڕێبازەکان و بنەچەی ئەو پیاوچاکانە دەڕوانین. بۆ نموونە: پیاوێکی ناوداری وەک « کاک ئەحمەدی شێخ » لە « سولەیمانیی » هەڵکەوتووە، یا، چەن پیاوێکی وەک « شێخ عوبێدوڵلای نەهریی، شێخ عەبدولقادری شەمزینیی و شێخ سەعیدی پیران » دەرکەوتوون، ئاخر، ئەوانە بە زۆریی « نەقشیی » بوون.
ــ بەڵێ. جگە لە « حاجی کاک ئەحمەدی شێخ »، ئەو سەر بە ڕێبازگەی « قادریی » بووە.
بەڵێ. دیارە « کاک ئەحمەد »، لە سەر ڕێبازی « قادریی » بووە. کاتێ، تەماشای ژیانی ئەوانە دەکەین، لە پەرژی پاکیان دەڕوانین، پێیان

سەربەرزدەبین. نەک هەر لە نێو گەلەکەماندا، بەڵکوو، لە دەرەوەی گەلی کوردیش، هەر وایە. بەڵام، بنچینەی ئەو ڕێبازانە شتێکە و « سۆفیی و دەروێش »ێکی تێنەگەیشتوو، نەزان و بێ ئاگا لە جیهان، شتێکی دیکەیە. هەڵبەتە، هێندێ لەو شێخانەش هەبوون و ئێستەش هەر هەن، بە ناوی ڕێبازگەیەکەوە، دووکانێکیان داناوە، لەبری ئەوەی، خەڵک بۆ لای خوا بانگکەن، بۆ لای خۆیان بانگیانکردوون! لەجیاتی ئەوەی دڵیان پاککەنەوە، دڵیان پۆخڵکردوون. دیارە، ئەوەش لێکدانەوەیەکی دیکەی هەیە.

پ30 : ئێستە، باسی هێندێ زاراوە دەکەین، حەزدەکەم، بە کورتیی، باری سەرنجی خۆتم بۆ دەربڕی، نەک وەک ئەوەی، لە پەرتووکەکاندا نووسراون.

ــ دێمۆکراسیی:

و30 : دێمۆکراسیی، ئەوە وەک لە پەرتووکدا هەیە، خۆت دەزانی، چی دەگەیەنێ؟

ــ بەڵێ. بە کورتیی: فرمانەوایی گەل.

من، لە مێژ ساڵە گوتوومە: دێمۆکراسیی، لە نێو سیستێمەکانی فرمانڕەواییدا، لە هەموویان چاکترە، چاکی نێو خراپانە، کە مرۆ داینانون. یا، بە کوردیی خۆمان دەڵێن: « لە چاو شلان، پەیتە! »

بەڵام، دێمۆکراسیی، کاتێ وەک فەلسەفە، وەک میکانیزم، لەگەڵ ئیسلامدا بەراورددەکرێ، جیاوازیی نێوان ئاسمان و ڕێسمانیان هەیە. چونکە، ناوەڕۆکی دێمۆکراسیی، سەر بۆ ئەوە دەکێشێ، مرۆ، جگە لە خوا، شتێکی دیکە بپەرستێ. واتە: بەخوداکردنی مرۆ، مرۆ لە شێوەی پەرلەماندا، وەک خوایەک تەماشاکەی. پەرلەمانیش، هەر چەندە دێمۆکراسییش بێ، یەکێ لە میکانیزمەکانی، یەکێ لە تاکەکانی ئەوەیە، کە دێمۆکراسییان لێ پێکدێ، لە فرمانڕەوایی زۆربە پێکهاتووە. بەڵام، کاتێ وردیدەکەیتەوە، دێمۆکراسیی، لە فرمانڕەوایی کەمینەیەکدا خۆی دەبینێتەوە. کەمینەیەکیش، کە پارە، توانا و دەسەڵاتیان زیاتر هەبێ، پتر توانای ئەوەیان هەیە، کار لە بیری خەڵک، لە ژیریی خەڵک و لە باوەڕی خەڵک بکەن. لەبەرئەوە، ئێمە دەڵێین: گەر ئەڵتەرناتیڤی دێمۆکراسیی دیکتاتۆریی بێ، ئەوا دێمۆکراسیی بە حەوت ئاو شۆراوەتەوە!

بەلام، کاتێ دیمۆکراسیی، لەگەڵ ئیسلامدا بەراوردەکەین، کە لە ئیسلامدا، مرۆ تەنیا بەندەی خوایە، لە ئیسلامدا « شەریعەت »ێ هەیە، چوارچێوەیەکی بۆ دیارییکراوە، ماوەی بۆ سەلیقە و ئارەزووی خەڵک نەهێشتۆتەوە، ئەو بەراوردە ناکرێ.

جا کاکە! حاشا لە ڕووی پلەوپایەی دانیشتووان بێ، وەڵڵا، خەڵکی وولاتانی « سوید یا نەرویژ »، یا خەڵکی هەر وولاتێکی دیکە بێ، بیانەوێ و داوابکەن، پیاو لە پیاو مارەبکرێ! بۆ؟ چونکە، خەڵک داوادەکا، پەرلەمانیش دەنگی بۆ داوە، دەبێ، وابێ! ئاخر، ئەوە چۆن دەبێ؟ بە ڕاستیی، لە ئیسلامدا، جێی ئەو گاڵتەجارەییە نابێتەوە.

چونکە، « شەریعەت » چوارچێوەیەکی دیارییکردووە، کۆمەڵێ « حەلاڵ و حەرام »ی دەستنیشانکردووە. هیچ پەرلەمانێ ناتوانێ، هیچ گەلێ بۆی نییە، دەسکارییانبکا. چونکە، خوای خەڵک دایناون. ئەوانەش، لە کۆمەڵێ ڕاستیی « ڕامیاریی، ئابووریی، کۆمەلایەتیی، سۆسیۆلۆژیی و ڕەوشت » پێکهاتوون، تا جیهان هەیە و کۆتاییپێدێ، ڕاستین و ناگۆڕێن.

بۆ نموونە: « داوێنپیسیی، نێربازیی، دزیی، ڕێگریی، درۆکردن، ناپاکیی کوشتن، زۆرداریی، چەوساندنەوەی گەلان ... » هەرگیز، باش نین و باشیش نابن. ئیسلام، ئەو شتە خراپانەی قەدەغەکردووە. لە هەمان کاتیشدا، کۆمەڵێ نەگۆڕی داناوە و بە سەر خەڵکدا سەپاندوویەتی، وەک: « ڕاسگۆیی، دەسپاکیی، دادگەریی، خۆشویستنی خەڵک، دڵسۆزیی بۆ خەڵک ... » ئەوانەشی، لە سەر مرۆ پێویستکردووە! لە نێو ئەو پرینسیپ و شتە نەگۆڕانەشدا، ئینجا، خەڵک لە ئیسلامدا ئاوایە، دەسەلات بە دەس خەڵکە، بەلام، بەرنامەدانان هی خوایە.

ــ دیکتاتۆریی:

دیکتاتۆریی! دیارە، لە دەسەلاتێکی خۆسەپێنەر پێکهاتووە. جا تاک بیکا، چین بیکا، وەک « مارکسیی »یەکان دەیانگوت: چینی پرۆلیتاریا دەبێ، دیکتاتۆریای پرۆلیتاریای هەبێ. سەرمایەداریی بیکا، جیهانگیریی بیکا، چونکە، جیهانگیریی دیکتاتۆرییەتە، ئەوەی « جۆرج بوش » گوتوویەتی: یان دەبێ، لەگەڵم بن، یا، ئەوەی لەگەڵم نەبێ، دژمە. ئەوە دیکتاتۆرییەتە. ئەوە، هەر هەمان ئەو « فیرعەونایەتیی »یە نییە، کە خوای پەروەردگار، لە سەر زمانی « فیرعەون » فەرموویەتی: (و قال فرعون ما اریکم الا ما اری

و ما اهديكم الا سبيل الرشاد:) « فيرعەون » گوتوویەتی: هەر ئەوەتان پێ دەڵێم، کە من پێم چاکە، ئەوەی منیش پێم چاکە، هەمووی هەر ڕاستە! گەر تۆ بڵێی: ڕاستیی و ڕەوا، هەمووی هەر لە سەر من تاپۆکراوە. ڕاستیی هەمووی هەر لای منە. هەر کەسێ لەگەڵ منیش نەبێ، دژمە. ئەوە دیکتاتۆرییەتە!

ــ ئەدی، لە نێوان ئەو دوو چەمکەدا « دێمۆکراسیی و دیکتاتۆریی » چی دیکە هەیە؟

ئیسلام.

ــ کۆمۆنیزم:

کۆمۆنیزم، ئەوەی جێبەجێکراوە، شتێکە،

ــ ئێمە لە تیۆرییەکە دەڕوانین.

وەڵڵا، وای لێ دەڕوانم: ئەوەی جێبەجێکراوە، شتێکە و بنچینەی تیۆریی « کۆمۆنیزم و سۆسیالیزم »یش شتێکی دیکەیە. بە ڕاستیی، لە تیۆرییەکەدا، لەسەرکردنەوەی مافی چینی چەوساوە و نەدارانی تێدایە.

چونکە، تیۆریی « کۆمۆنیزم و سۆسیالیزم »، خۆی لە خۆیدا، کاردانەوەیەک بوو، بۆ ئەو هەموو زۆرداریی و ستەم، قڕیی و بڕیی، ململانێی چینایەتییەی، بلۆکی ڕۆژاوا و سیستێمی سەرمایەداریی پیادەیدەکرد. ئەو جۆرە لەسەرکردنەوەیەی، چینی هەژارانی تێدا هەیە.

بەڵام، چونکە کاردانەوەیە، لە سەر بنچینەیەکی ڕێکوپێک، ڕاست و بە هاوسەنگیی دا نەمەزرێنراوە، گەر لە ڕۆژاوا و « ئەورووپا »، لە ژێر سایەی سیستێمی « کەپیتالیزم »دا، کۆمەڵێ بۆ تاک بچەوسێنرێتەوە، لەوێش، لە ژێر سایەی سیستێمی « کۆمۆنیزم و سۆسیالیزم »دا، تاک بۆ کۆمەڵ دەچەوسێنرێتەوە. جا، خۆی تاک و کۆمەڵە تاکێ، گەل پێکدێنن. گەلێکیش، هەر لە چەن تاکێ پێکدێ. کەواتە: لە هەر دوو سیستێمی « کەپیتالیزم و کۆمۆنیزم »دا، یا تاک یا کۆمەڵ دەچەوسێنرێتەوە. هەر کامێکیشیان بچەوسێنرێنەوە، بە قوربانیی و بەڵاگێڕیی ئەوی دیکەیان بکرێ، هەر دووکیان هەر زیاندەکەن. ئەو بەڵەنسڕاگرتنە، لە نێوان تاک و کۆمەڵدا، کە هیچیان بەشی ئەوی دیکەیان نەخۆن و نەچەوسێنرێنەوە، تەنیا لە ئایینی ئیسلامدا هەیە!

ـــ تیۆریـــــــــــی داروین:
بەڵێ. وەڵڵا، من پێم وایە، « داروینیزم »، بە بێ نرخترین شێوە، تەماشای مرۆی کردووە و پیشانیداوە.
ـــ هیگلیزم: لە « هیگل »ەوە هاتووە.
دەزانم. بێ گومان، « هیگڵ » ئەوەیە، کە دوایی « مارکس » گوتوویەتی: من، یەکسەر ئەوەی « هیگڵ » گوتوویەتی، ئەو بە سەر و بنی دایناوە، من راستمکردۆتەوە. من پێم وایە، چۆن « مارکس » بە مەتیریا، لە رووی ئابوورییەوە، مرۆڤی لە خوار مەتیریا و گەدەوە داناوە، « هیگڵ »یش، بە ئایدیال و ئەوەدا بردوویەتییە خوارەوە. واتە: « مارکسیی »یەتیش بە پێی قسەی خۆیان، راستیانکردۆتەوە، وەک بڵێین: چۆن ئەویان بەو لادا تێیپەڕاندووە، ئەویش بەو لای دیکەدا بردوویەتی.
ـــ « مارکس » گوتوویەتی: تیۆری « هیگڵ »، قاچی لە ئاسمان و سەری لە سەر زەویی بوو، ئێمە هەڵمانگێڕایەوە.
بەڵێ.
ـــ فرۆیدیزم:
وەڵڵایی، من ئەوەی دەربارەی « فرۆیـــــــد » خوێندوومەتەوە، خۆی، هەم « فرۆید »، هەم « مارکس »، دیارە « جوو » بوون. « داروین »یش « فەلە » بوو. بەڵام، لە ژێر کارتێکردنی « جوو »ەکاندا بوو.
بە راستیی، کاتێ « فرۆید »، هەموو مرۆ لە « سێکس »دا پوختەدەکاتەوە، هەموو جۆرە چالاکییەکانی مرۆ، بۆ ئەو سەرچاوەیە دەگێڕێتەوە، بۆ پاڵپێوەنەری « سێکس »ی دەباتەوە، وەک چۆن، « مارکس » هەمووی بۆ گەدە و بۆ گیرفانی دەگێڕێتەوە، « داروین » هەمووی بۆ لایەنی ئاژەڵێتیی دەباتەوە، « نیتشە و دورکایم »، هەموویان بۆ ئەوە گێڕاوەتەوە، کە تاک هیچ نییە، وەک سابونێ لە قاڵب دەرچێ، وایە. هیچ رۆڵێکیان، بۆ تاک نەهێشتۆتەوە، هەموویان بە کۆمەڵ داوە.
من لە پەرتووکی « ئیســــــلام و رێچکاندا »، ئەو وێنەیەم لە سەر هێناونەتەوە، کە کاتی خۆی ئیمام « موحەممەدی غەزالیی » هێناوێتییەوە. دەڵێ: کاتی خۆی، کۆمەڵێ کوێر دەبیستن، « فیل »ێک بۆ وولاتەکەیان هاتووە. ئەوانیش، کوێرن و « فیل » نابینن و پێشتریش هەر نەیانبینیوە، تا، سەرنجێکی گشتیی هەمەلایەنەی لێ وەرگرن. دەچن و هەستی دەس

لێ کوتاندن بەکاردێنن. یەکەمیان دەس لە لاقی دەدا. دووەمیان دەس لە پشتی دەدا. سێیەمیان دەس لە گوێی دەدا. چوارەمیشیان دەس بۆ لمۆزی دەبا. هەر یەکەیان لە دڵی خۆیدا، پێی وایە، دەزانێ، « فیل » چۆنە؟!!
هەرچی چۆنێبێ، دوایی دەگەڕێنەوە. لێیان دەپرسن: « فیل » چۆنە؟ یەکەمیان، ئەوەی دەسی لە لاقی داوە، دەڵێ: « فیل » شتێکە، وەک کۆڵەکە وایە. دووەمیان، ئەوەی دەسی لە گوێی داوە، دەڵێ: تۆ هەر لێی تێ نەگەیشتووی، « فیل » وەک گەڵای دار وایە و زۆر پانە. ئەوەی دەسی لە پشتی داوە، دەڵێ: نەخێر، « فیل » شتێکە، وەک تەختەدارێ وایە. ئەوەی دەسیشی لە لمۆزی داوە، دەڵێ: ئێوە هیچتان لێی نازانن. « فیل » شتێکە، وەک گۆچان وایە. جا، لە ڕاستییدا، هەموویان ڕاستیانکردووە و هیچیشیان ڕاستیان نەکردووە.
ئەو خاوەن بیردۆزانەش، وەک « فرۆید » کاتێ گوتوویەتی: « سێکس » ئەوندە و ئەوەندە کارتێکردنی هەیە. ڕاستە، « سێکس » کار لە مرۆ دەکا. بەڵام، مرۆ لە « سێکس »دا پووختە ناکرێ.
یا کاتێ « مارکس » گوتوویەتی: گەدە کارتێکردنی خۆی هەیە. ڕاستە، بەڵام، هەموو شتێ نییە. (کاد الفقر ان یکون کفرا.) پەیامبەر « د.خ. » دانی بەوەدا ناوە و فەرموویەتی: (اللهم انی اعوذ بک من الجوع فانه اثم رجیع.) یا، ئیمامی « عەلی » فەرموویەتی: ( لو کانَ الفقر رجلا لقتلته.)
ئاخر، « داروین » کە هەموو شتەکانی بۆ لایەنی ئاژەڵایەتیی مرۆ گێڕاوەتەوە، ڕاستە، ئەو هەستە ئاژەڵانەیە لە مرۆدا هەیە، هەروەها، کۆمەڵگە ڕۆڵی خۆی لە سەر مرۆ هەیە. بەڵام، وا نییە، کە ئەوانە هیچ کامێکیان ئەو ڕۆڵەیان هەبێ.
مامۆستا « مەسعوود موحەممەد » یادی بەخێر، پەرتووکێکی هەیە، بێ گومان، بەڕێزت دیوتە، « ئەلتەفسیر ئەلبەشری لیلتەئریخ. »
ـ بەڵێ.
جا، ئەوە کاتی خۆی، بۆی باسکردم و گوتی: من پەرتووکێکی وام بە دەسەوەیە.
گوتم: مامۆستا! ئەوەی تۆ باسیدەکەی، ئەو لێکدانەوە و شیکردنەوەیە، هی ئیسلامە. بەڵام، یەک شتی دیکە، بۆ مێژوو زیادکە.
گوتی: ئەوەش چییە؟

گوتم: ئەوەش، « سوننەت »ی خوای پەروەردگارە! یەزدانی مەزن، کۆمەڵێ یاسای داناوە، ئەو یاسایانە نەگۆڕن. ئەوانەشی کار لە سەر مێژوو دەکەن، بە زیادکردنی ئەو هۆکارانەی تۆ دەڵێی، ئینجا، تەواو دەردەچێ!
جا، ئەویش ڕەخنەی لەوە هەبوو، چۆن دەبێ، هەموو شتەکان بۆ فاکتەری ئابووریی، یا بۆ « سێکس »، یا بۆ چی دیکە بگەڕێنرێنەوە؟؟
لە ڕاستییدا، ئەو فاکتەرانە هەموویان، کارتێکردنی خۆیان، لە سەر مرۆ، لە سەر ژیانی مرۆ، لە سەر ڕەوتی مێژوو هەیە.
ئەوە بە کورتیی، من ئاوای لێ تێگەیشتووم، بەو شێوەیە، تەماشای ئەو بیردۆزانە دەکەم. بەڵام، هەر کامێکیان، لایەکی لە ڕاستیی بینیوە، هەر ئەو لایەنەشی بینیوە و زۆر زلیشیکردووە، هەموو پانتایی مرۆی پێ گرتۆتەوە و لایەنەکانی دیکەی پێ داپۆشیوە!
ـ ناسیۆنالیزم، وەک بیر و فەلسەفە:
ناسیۆنالیزم، وەک بیر و فەلسەفە، ڕەنگە، بەڕێزت پێت ناخۆشبێ. بەڵام، من بە جۆرێ لە بتپەرستیی دادەنێم. چونکە، ئەو کەسە، چ ئارەزووی خۆی بپەرستێ، چ داروبەردبپەرستێ، چ مرۆڤێ بپەرستێ، چ دیکتاتۆرێ بپەرستێ، چ شێخێ بپەرستێ، جگە لە خوا، هەمووی هەر پەرستنە.
مرۆ، کاتێ تەنیا پەرستراوی شایستە و ڕاستەقینەی خۆی پەرستووە، کە خوای پەرستبێ. چونکە، هەر خوا، مرۆڤی دروستکردووە. ئەوەی دیکە، گەر خاک و نیشتمانە، گەر گەل و نەتەوەیە، گەر پارە و سامانە، گەر هەر شتێکی دیکەیە، ئەستێرەیە، مانگە، خۆرە ... هەموویان چەن شتێکی جوان و باشن، خوا بۆ تۆی ئەفراندوون. هیچیان شایستەی ئەوە نین، بیانپەرستی. بەڵێ دەبێ، بیانپارێزی، داکۆکییان لێ بکەی، خۆشتبوێن، بەڵام نابێ، بیانپەرستی. پەرستن دەبێ، تەنیا هەر بۆ خوا بێ.
ناسیۆنالیزم، بەو شێوە فەلسەفیی و بیرەی، مرۆ، وڵات و نیشتمانی خۆی، بە شتێکی زۆر پیرۆز بزانێ و لە سەروو هەموو شتێکەوەی دانێ، هەموو شتێکی لە پێناودا بەختکا و بە قوربانکا، بەو تێگەیشتنە، ئەوە من بە بتپەرستیی دادەنێم.
بەڵام، من لە پەرتووکی « سۆزی نەتەوایەتی و بیری ناسیۆنالیزم »دا نووسیومە و پێم وایە، هەستی نەتەوایەتیی سۆزە، شتێکی خۆڕسکییە. مافی نەتەوایەتیش مافێکە، هەموو گەلێکیش، مافی خۆی هەیە، لە سەر

خاکی خۆی بژی، نیشتمانەکەی ئازادبێ، گەلەکەی سەربەستبێ، گەر مرۆ، خاکی خۆی خۆشبوێ، گەلی خۆی خۆشبوێ، مافێکی سرووشتی خۆیەتی، ئەوەش هەر سۆزێکە و لە « شەرع »دا جێیدەبێتەوە. بەڵام، کاتێ دەبێتە فەلسەفە و جێی ئایین دەگرێتەوە، وەک دەڵێن: « دینمانە ئایینمان، هەر نیشتمان »، ئا ئەوە، لە ئیسلامدا ڕەتدەکرێتەوە.

ــ ئایا، پێت وا نییە، بیری « مارکسیزم »یش، هــەر هەمان تێڕوانینی بۆ « ناسیۆنالیزم » هەبێ؟ چونکە، ئەوانیش هەر بە هەستی دەزانن. بەڵام، مافی گەلیش بە ڕەوا دەزانن.

گەر ئەوانیش وابن، ئەوا دیارە، لەگەڵ ئیسـلامـدا تێکدەکـەنەوە. بەڵام، ئەوان لە ڕوانگەیەکی دیکەوە لێی دەڕوانن.

ــــ بەڵێ وایــــــــــە. ئەوان پێیان وایە، هەستێکە، کەفوکوڵێکی کاتییە، لە قۆناغێکی مێژوویی دیاریکراوی تایبەتییدا سەرهەڵدەدا و هەڵدەچێ، دوایی نامێنێ. ئەم نەمانەش، بە چی دەبێ؟ بەوە بەدیدێ، کاتێ، زۆرداریی و توندوتیژیی، لە سەر نەتەوەکان نامێنێ، یا، مافی نەتەوەکان دەدرێ و گرفتەکانیان چارەسەردەکرێ. ئیدی، ئەو بیرە نامێنێ.

بەڵام، ئێمە ناڵێین: نامێنێ، چونکە، پەیامبەر « د.خ. »، کاتێ « مەککە »ی جێـهێـشـتـووە، پەیامـبەری خـواش بووە، ئاوڕی لە « مەککە » داوەتەوە فـەرمـوویەتی: (و الله انک لأحب بلاد الله الی، لو لا ان قـومک اخرجـونی منک ما خرجت منک ابدا.)

پاشـان، چووە بۆ « مـەدینە » و فـەرمـوویەتی: (اللهم حـبب الینا المدینه کحبنا لمکه و اعده.)

یا، چووە بۆ سەر کێوی « ئوحـود » و فـەرمـوویەتـی: (ان احد جبل یحبنا نحبه.)

ئا ئەو خۆشەویستییەی پەیامبەر وەنەبێ، هیچ جۆرە گوشارێکی لە سەر بووبێ، بەڵکوو، هەستێکی مرۆڤایەتیی ڕەسەنبووە.

ئاخر، هەڵەی « مارکسیزم » لێرە دایە، شتەکان پتر بۆ بارودۆخ، گوشاری ئابووریی و ڕامیاریی دەگێڕێتەوە. کەمـتر، دان بە هەستە بیرییەکاندا دەنێ. پێـیـان وایە، گـەر دەوڵەت هەبوو، کێـشـەی نەتەوایەتیی چارەسـەر دەکرێ. کێـشـەی خـاوەندارێتیی تـاک نامێنێ. خـەڵک پێی خـۆش نابێ، ئارەزوو و خۆشەویستیی خاوەندارێتیی هەبێ. کەچیی دەرکەوت، وا نییە!

ـــ کەواتە: پەیامبەر، هەستی نەتەوەیی، بەرانبەر نیشتمان و خاکەکەی هەبووە؟
بە دڵنیاییەوە.
ـ باشە، چۆن تەماشای ئەم فەرموودەیەی پەیامبەر دەکەی؟ فەرموویەتی:
( احب العرب لثلاث: انا عربی و القران عربی و لغه اهل جنته عربی.)
کاک دوکتۆر! بێ گومان، ئەوە یەکێکە لەو شتانەی، بە ناوی پەیامبەرەوە هەڵبەستراوە. لە سەرچاوەی فەرموودەکانی پەیامبەردا « د.خ. »، ئاماژەی پێ کراوە. وەک لە پەرتووکی « کشف الخف و موذیب الباس عما اشتهر من احادیث علی السنه النبی.) نووسەرەکەی ناوی « عەجیلۆنیی »یە. ئەو پەرتووکەم لایە. هەروەها، لە پەرتووکی « تذکرە الموضوعات » و گەلێ پەرتووکی دیکەشدا هەیە. ئەوە فرمایشتی پەیامبەر نییە. چونکە، نە لەو دەوەشێتەوە، شتی وا بفەرموێ، نە لە ئیسلامییشدا جێیدەبێتەوە.
بۆ زانیاریی بەڕێزت، جارێ، لەگەڵ نوێنەری « بزووتنەوەی حەماس »، لە « سووریا » دانیشتم. ئەو فەرموودەیەی هێنایەوە، لە سەر ئەوە، وتووێژێکمان بوو. گوتی: ئێوە نەوەی « سەلاح ئەلدینی ئەیوبیی »ن. ئێمە خۆمان بە قەرزاربارى ئێوە دەزانین.
گوتم: سوپاستاندەکەین. خوا یاربێ، قەرزەکەمان دەدەنەوە. تۆزێ قسە و باسی دیکەمان کرد.
دوایی، قسە قسەی هێنا و گوتی: ئاخر، « عەرەب » چاکەیان لە سەر هەموو گەلانی دیکە هەیە. چونکە، پەیامبەر « د.خ. » خۆی وای فەرمووە.
منیش گوتم: وەڵڵا، ئێستە باسی ئەوەت بۆ دەکەم، کە فەرموودەی پەیامبەر « د.خ. » نییە، بەڵام. بەڕێزت گوتت: قەرزارباری باپیرەتانین. کەچیی، جگە لەوەی، قەرزەکەی ئەوت نەدایەوە، ئەوەی منیشت، لە سەر خۆت بارکرد.
گوتی: بۆ؟
گوتم: ئەدی باشە، ئەوە ئاخر کەی وایە، بە ڕاستیی ئەوەی بەڕێزت دەیڵێی، تێڕوانینێکی شۆڤێنیانەیە، واتای چییە؟ ئێوە، چ چاکەیەکتان بە سەر خەڵکەوە هەیە؟ لە چیدا، لە خەڵکی دیکە باشترن؟ گوتم: خۆ گەر باسی ئەوە بکەی، خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (انا انزلنا قرانا عربیا لعلکم تعقلون.)

گوتم: ئاخر، خەڵک بۆی هەیە، بڵێ: ئێوە، لە خەڵکی دیکە تێنەگەیشتووتر و نەزانتربوون، بۆیە، « قورئان » لە نێو ئێوەدا هاتووە. گوتم: وا باشترە، ئەو شتانە نەڵێن. نە ئێمە وا دەڵێین، نە ئێوەش وا بڵێن!
بەڵام، دەربارەی گەلان، خوای گەورە فەرموویەتی: (و جعلناکم شعوبا و قبائل لتعارفوا ان اکرمکم عند الله اتقاکم.) ئا ئەم قسەیە، قسەی خوایە.
گوتم: بەڵام، ئەم گوتەیەش، ( احب العرب لثلاث: انا عربی و القران عربی و لغه اهل جنته عربی.) هیچ بنچینەیەکی ڕاستی نییە. چونکە، پەیامبەر شتی وای نەفەرمووە. بەڵکوو، ئەم قسەیە دانراوە، هەڵبەستراوە، لە سەرچاوەکاندا، لەگەڵ ناوەڕۆکی « قورئان و سووننەت »یشدا ناگونجێ.
پەیامبەر « د.خ. » لە هیچ جێیەکی دیکەش نەیگوتووە: بە شێوەیەکی گشتیی، فلان گەل خۆشبوێ. یا، فلان گەل ببوغزێنە. عەرەبی موسوڵمانت خۆشبوێ، بەڵام، عەرەبی گاوورت خۆش نەوێ. چونکە، پەیامبەر « د.خ. »، تا لەگەڵ عەرەبە گاوورەکاندا نەجەنگا، تا لەگەڵ ئەواندا، هەموو حسابێکی پاکتاو نەکرد، پەلاماری « ڕۆم و فارس »ی گاووری نەدا.
کەواتە: ئەوە ڕاست نییە.
ئینجا، زمانی خەڵکی بەهەشت، لە هیچ دەقێکدا نەهاتووە، بڵێ: چ زمانێ دەبێ! عەرەبیی چی؟ خوا دەزانێ، چ زمانێکە، چونکە، جیهانی هەستانەوە و ژیانەوە، بڕیار و بەرنامەیەکی دیکەی هەیە و جیایە.
ــ وەک چەمکێکی سەردەم، چۆن لە جیهانگیریی دەڕوانی؟
وەڵڵا کاک دوکتۆر! من وا تەماشای جیهانگیریی دەکەم. بێ گومان، ئەوان دەڵێن: « عەولەمە ».
ــ عەرەب دەڵێ « عەولەمە ». بەڵام، لە زمانی « کوردیی و فارسیی »دا، بە « جیهانگیریی » ناودەبرێ.
دەزانم. جا گەر وایە، « ئەمرەکە »شم بۆ بکە بە کوردیی. چونکە، بەڕێزت لە کوردییدا زۆر شارەزای! من پێم وایە، بە « ئەمەریکاییکردن »، بە جیهانییکردن نییە. چونکە، گەر مەبەست لە جیهانگیریی ئەوەبێ، هەموو جیهان داگیرکەی، ڕاستە. داگیرکردنی جیهان، زەوتکردنی ویستی گەلان و وڵاتان، دەستبەسەراگرتنی خێر و بێری گەلان، ئەوە ڕاستە. من وای تەماشادەکەم.
ــ واتە: ڕەتیدەکەیتەوە.

به تەواویی ڕەتیدەکەمەوە. چونکە، بێ گومان، جیهانگیریی بەو تێگەیشتنەی ئێستە هەیە، ئەوەیە: « ئەمێریکا » دەیەوێ، خەڵک لە بابۆڵە خواردنیشدا، « ئەمێریکایی »یانە بابۆڵە بخۆن!
ئاخر، ئەوەی ئیسلام دەیەوێ، ئەوەیە: کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیی، لە ژێر سایەی « شەریعەت »ی خوادا دانێ. بەڵام، ئەوەی ئیسلام دەیەوێ، زۆر جیایە، لەوەی « ئەمێریکا » دەیەوێ.
ئیسلام دەڵێ: کابرای « جوو ! »، کابرای « فەلە ! »، گۆشتی بەرازت پێ حەڵاڵە، فەرموو بیخۆ. خواردنەوەت پێ حەڵاڵە، فەرموو بیخۆرەوە. بەڵام، موسوڵمانێ دێ و بەرازەکەت لێ دەکوژێ، دەبێ، پارەکەت بداتەوە. یا، کوپەکەت لێ دەشکێنێ، دەبێ، پارەکەشت بۆ ببژێرێ.
کەچیی، « ئەمێریکا » دەڵێ: دەبێ، وانەی قوتابخانەکانیشتان بگۆڕن، پۆشاکیشتان بگۆڕن، ژیریی و بیرکردنەوەشتان بگۆڕن. ئەوە زۆر جیایە، لەوەی ئیسلام دەیەوێ، جیهان کۆنترۆڵکا و دەسەڵاتی خۆی دامەزرێنێ.
بەڵام، بەو سۆز، دادپەروەریی و لێبووردنەی ئیسلام دەیەوێ، جیهانی پێ بگۆڕێ، پێش موسوڵمانان، ناموسوڵمانان دانیان پێدا ناوە. چونکە، ئیسلام دەسکاریی تایبەتمەندیی گەلان ناکا. دەس بۆ تایبەتمەندێتیی کەمینە ئایینییەکان نابا. واتە: گەر ئیسلام، بە تەواویی و ڕاستیی پیادە کرێ، هەرگیز نایە، بڵێ: ئەی نەتەوەی کورد، زمانەکەی خۆت لابەرە، توورک زمانەکەی خۆت بەکار مەهێنە. بە پێچەوانەوە، خوای پەروەردگار، زمانی گەلان و ڕەنگی گەلانی، بە یەکێ لە نیشانەکانی خۆی داناوە. بۆیە فەرموویەتی: (و اختلاف السنتکم و الوانکم ان فی ذلک لایات للعالمین.)
کەواتە: کەسێ بیەوێ، زمانەکان لەنێوبەرێ، یەکێ لە نیشانەکانی بەڵگەی بوونی خوا لەنێودەبا.
ــ منیش، کاتی خۆی، ئەو ئایەتانەم، هەموویان لە پەرتووکی « سەلیقەی زمانەوانیی »دا، بۆ هەمان مەبەست بەکارهێناوە.
زۆر چاکت کردووە.
ــ دیارە، « سیکولاریزم ــ عیلمانییەت »یش هەر بەو چاوە تەماشادەکەی؟
من پێم هەڵەیە، ووشەی « عیلمانییەت » بەکاربێنرێ. چونکە، بێ گومان، بنچینەی « سیکولاریزم »، خۆی بە واتای « دونیاگەرایی »، یا « بێ ئایینیی »، یا « باوەڕنەکردن بە نادیار، خوا و زیندووبوونەوە » دێ.

ئەوەش، هیچ پێـوەندییـیەکی بە « سـاینتـیـزم »ەوە نـیـیـە. چونکە، ئەو زانستگەرایی و ڕێبازە زانستانەیە نییە. لەبەرئەوە، نووسەرە عەرەبەکان، یا بە هەڵە وەریانگێڕاوە، یا بە هەڵە دەیلـێنەوە. بۆ ئەوەی، واتا و کـرۆکی ڕاسـتـەقـینەی « سـیـکولاریزم »، بە تـەواویی تێـبگەین، دەبێ، تەمـاشـای فەرهەنگە جیاوازەکان بکەین. لەو فەرهەنگانەدا، بە واتای « بێ ئایینیی » یا « دونـیـاگـەرایی » هـاتـووە. وەک لە فـەرهـەنگی « دائیـرەی مـەعـاریفی بریتانیی »دا دەردەکەوێ.

بەڵام، « سیکولاریزم » خۆی، واتە، جیاکردنەوەی ئایین لە ژین؟

ــ نەخێر، لە دەسەڵات، دەوڵەت و کاری ڕامیاریی.

بەڵێ.

ــ ئەوە « سیکولاریزم »ە.

بەڵێ. من کۆڕێکم لە سەر ئەو بابەتە هەبوو. بێ گومان، سەرەتا بە وردیی، باسی هەمـوو فـەرهەنگەکانم کرد. لەو فـەرهەنگانەی زمـاندا هێناومـەتەوە، کە « سـیـکولاریزم » واتە: « بێ ئایینیی »، تەنـیـا بڕوا بە جـیـهـان بکەی و حسێب بۆ ئەو ژیانەی دیکە نەکەی، حسێب بۆ خوا نەکەی، ژین ڕێکخەی، بێ ئەوەی، ئایین پێوەندیی پێوە هەبێ.

بێ گومـان، ئێمە بەو پێیە دەڵێین: خـەڵکی « ئەورووپا » ڕەنگە، ناچاربووبن، ڕوو لە « سـیـکـولاریزم » بکەن. هەڵبـەتـە، بیـانووی خۆیان هـەبووە، چونکە، کاتێ بە دەس ئایینێکی شێوێنراوەوە، گیریانخواردووە، بە دەس پیـاوانی « کڵێسا »وە تووشبـوون، لە دەس چینی « ئەکلیرۆس » پەریشانبوون، ڕێی زانسـتـیـان لێ گرتـوون، ڕێی بیـرکـردنـەوە و چالاکـیـی ڕامـیـارییـیـان لێ گرتوون، مـافەکانیان لێ زەوتکردوون، هەمـوو ئەو مافانە، لە قوولی مـشتی « تسـار و پاشـا »کـاندا کـۆکـراونەتەوە، مـافی خـۆیان بووە، لەو ئایینە ڕاکەن.

بەڵام، موسوڵمـان مافی ئەوەی نییە، لە ئایین ڕاکا، کە هەمـوو ئەو شتانەی لە سـەر پێویسـتکردووە. چونکە، ئایین لە سـەری داناوە، دەبێ، چالاکـیی ڕامـیـاریی هـەبێ. دەبێ، ڕۆڵی کۆمـەڵایەتیی ببینێ. دەبێ، زانست فێربێ. دەبێ، خـەم لە گـەلەکـەی بخـوا. دەبێ، لە بەرانبـەر زۆرداریـیـدا، هەڵوێست وەرگرێ. دەبێ، مـافی چەوساوەکـان بدا. دەبێ، چی و چی دیکە بکا. واتە: بۆ ئەو شتـانەی « کڵێـسـا »، ڕێی لە « ئەورووپایی »یەکان گرتبوو، تا، مـافە

ڕەواکانی خۆیان داواکەن. ئیسلام، نەک هەر ڕێی لە موسوڵمانان نەگرتووە، بەڵکوو، لە سەریشی فەرزکردوون. کەواتە: گەر ئەوان مافی خۆیان بووە، لەو ئایینە هیچوپووچە ئەفسانایییە لادەن و ڕاکەن، ئەوا، ئەو موسوڵمانانە، زۆر نارەواییدەکەن، لە ئایینێ ڕاکەن، کە بە سەرچاوەی زانست، دادپەروەریی و پیتۆڵیی دادەنرێ.

پ31 : چۆن لە هونەر دەڕوانی؟ بۆ نموونە: « مـوزیک، گـۆرانیی، هەڵپەڕکێ، نواندن، سینەما، وێنەکێشان، پەیکەرسازیی، شێوەکاریی » و هەموو بەشەکانی دیکەی هونەر.

و31 : بێ گومان، هونەر، هەڵوێستی مرۆ، هەست و نەستی مرۆ، بەرانبەر بە سرووشت، بەرانبەر بە دەووروبەر دەردەبڕێ. دەرخستن و پیشاندانی ئەو هەست و نەستە، ئەو جوانییییە، هونەرمەندەکە دەیبینێ. هەموو ئەوانە، لە چوارچێوەی « شەرع »دا ڕێپێدراوە. بنچینەی « شەرع »یش باوەڕە. لە ئیسلامدا، هیچ شتێ ڕێی پێ نادرێ، گەر سەر بۆ ئەوە بکێشێ، مرۆ لەبری خوا بیپەرستێ. واتە: گەر هونەر، وا لە مرۆ بکا، جوانیی سرووشت وەک خوا سەیرکا و بیپەرستێ، پەیکەرێ درووستکا، چونکە، پەیکەرتاشین لە ئیسلامدا قەدەغەیە، ئەوە دەرفەتی تێدا نییە.

ـــ وا بزانم، پەیکەرتاشین، بە مەبەستی پەرستن قەدەغەیە. بەڵام، بە مەبەستی جوانیی، قەدەغە نییە!

حەرامە. بێ گومان، هێندێ لەو شتانەی لە ئیسلامدا قەدەغەکراون، وەک ڕێگرتن وایە، وەک پێشگرتن وایە، تا تووشی ئەو قەدەغەیە نەبن. گەر مێژووی ئیسلام تەماشاکەین، هونەری « بیناسازیی » هەبووە. واتە: هونەری ئیسلامیی، ڕووی هونەریی خۆی، لەو شتانە کردووە، کە مرۆ لە کێشە و باسی « سێکس » و پەرستنی سرووشت دووردەخاتەوە. کەواتە: لە ئیسلامدا هونەر هەیە، بەڵام، لەو چوارچێوەیەدا جێیدەبێتەوە، بۆ ئەو مەبەست و نیازە « شەرعیی »یانەی، مرۆ بەرزدەکەنەوە.

ـ واتە: گۆرانییش، هەر لەو قاڵبە دایە؟

هەرچی بێ.

ـ واتە: گۆرانیی و موزیک، هەر دەبێ، بۆ سروودی ئایینیی تەرخانکرێ؟

نا. مەرج نییە، ئایینیی بێ. بۆ نموونە: مرۆ هەست و نەستی خۆی،

بەرانبەر بە سرووشت، بەرانبەر بە بوونەوەر، بەرانبەر بە ئەستێرە، ئاسمان، بەرانبەر بە وڵاتی خۆی، بەرانبەر بە بارانێ کە بە خوڕ دەبارێ، دەردەبڕێ، ئەوانە هەموویان، شتێکی ڕەوا و « شەرعیی »ن.
ــ ئەدی، بۆ جوانیی ژنان نابێ، گۆرانیی بگوترێ؟
ئافرەت! بۆ ئافرەتێکی، کە کابرا بە خێزانی خۆیدا هەڵدەدا، با، تێرتێر پێیدا هەڵدا.
ــ نەخێر. ئاخر، ئەوەی تۆ دەڵێی، لە ماڵەوە دەبێ. بەڵام، من دەڵێم: هونەر گشتیی بێ و بۆ گەل بێ!
نا نا. بێ گومان دەگونجێ، بە گشتیی باسی ئافرەت بکرێ. بەڵام، باسی لایەنە مرۆییەکانی ئافرەت بکرێ. نەک، باسی لایەنە نهێنییەکانی بکرێ. چونکە، ئیسلام نایەوێ، مێیایەتی ئافرەت بەرجەستەکرێ. بۆ ئەوەی، ئەو پۆشاکەی ئیسلام، بۆ ئافرەتی داناوە، ئافرەت وا لێبکا، لایەنی مێیایەتی، کە لایەنی سەرنجڕاکێشانێتی، داپۆشێ، لایەنە مرۆڤایەتییەکەی تێدا دەرخا.
ــ واتــە: دەتوانم، بڵێم: قاڵبێکی دیاریکراو، بۆ نواندن و سینەماش هەیە، وەک لە « ئێران » پێڕەودەکرێ. خۆم دیومە، فیلمی ئیسلامیی لێدەدەن، واتە: ئەو فیلمانەی لە « سێکس » و لە دژایەتیکردنی ئایینەوە دوورن!
دژ بە بەهای بەرز بێ، واتە: وەک هۆکارێ، ڕەوشت دەڕووخێنێ، پەردەی شەرم و شوورەیی دەدڕێنێ. یەک شتی دیکەش هەیە. کاک دوکتۆر!
ــ بەڵێ فەرموو.
کێشەی موزیک، مشتومڕێکی لە سەرە. هێندێ دەڵێن: هەموو جۆرەکانی موزیک قەدەغەیە. هێندێکی دیکە دەڵێن: هەموو جۆرەکانی ڕەوایە. هێندێکی دیکەش دەڵێن: ئەو جۆرانەی، دەماری شەڕ، لە مرۆدا دەجوڵێنن، مرۆ بەرەو خراپە پەلکێشدەکەن، تەنیا ئەوانەیان قەدەغەن. بەڵام، ئەو جۆرانەی، ئازایی، دەماری پیاوەتیی، بەزەیی و هەستی خاوێن، لە مرۆدا دەبزوێنن، ئەو جۆرانە قەدەغە نین.
من خۆم، ئەو ڕایەی سێیەمم، پتر بە لاوە پەسەندە. بەڵام، ئێمە ئێستە، وەک « کۆمەڵی ئیسلامیی »، پتر کار بەو ڕایە دەکەین. لەبەرئەوە، هێندێ لێکدانەوە هەیە، ئێمە هیچ کام، لە شێوەکانی موزیک بەکار ناهێنین.
ــ ئەدی، چۆن لە فۆلکلۆری هەڵپەڕکێی کوردیی دەڕوانی؟

هەڵپەرکێ، گەر پیاوان بۆ خۆیان هەڵپەڕن، ژنان بۆ خۆیان هەڵپەڕن، کارێکی ئاساییە. بەڵام، « ڕەشبەڵەک » و تێکەڵبوونی پیاوان و ژنان نابێ.

ــ ئاخر، ئەوەتەی کورد هەیە، « ڕەشبەڵەک »ی هەر هەبووە!
مامۆستا پێکەنی و هیچ وەڵامی نەدایەوە.
ــ ئینجا، منیش گوتم: ئاخر، پێش ئیسلامیش هەر هەبووە!
ئەویش گوتی: وەڵڵایی، جا، گەر هەموو خەڵکی سەر زەویی، لە سەر شتێ کۆبنەوە، کە خوا قەدەغەیکردبێ، هەر قەدەغەیە!

پ32 : ئایا، چۆن لە وێژە بە گشتیی و هۆنراوە بە تایبەتیی دەڕوانی؟ چونکە، هۆنراوە لە « چیرۆک و پەخشان » کاریگەرتر و بەکارترە. هێندێ لە بیریارەکانی کۆن، لەو سەردەمەدا، دژایەتیی پەیامبەریان کردووە و گوتوویانە: « قورئان » ڕەوانبێژییە. هێندێ هۆنەر هەبوون، لەو سەردەمانەدا توانیویانە، شتێ بنووسن، لە ئاستی « قورئان »دا بێ، یا بەرزتر، یا نزمتر بێ. بۆیە، زۆربەی کەسایەتییە ئیسلامییەکان، دژی هۆنراوە وەستاون.
تەنانەت دەڵێن: پێش ئەوەی پەیامبەر، دەسەڵات پەیدا کا، لە « مەککە »وە بۆ « مەدینە » کۆچبکا، نەزان و گاورەکان، هۆنەری خۆیان هەبووە، موسوڵمانەکان قەدەغەیانکردووە. بەڵام، دوای ئەوەی زانیویانە، هۆنەر، لە گەرمکردنی خەڵکدا بۆ جەنگ، بۆ ستاییشکردن و سەرکەوتنی پەیامبەر، ج ڕۆڵێکی گەورە دەبینێ، ئینجا، ڕێیانداوە، هۆنەر درووستبێ و هۆنراوە بڵێ. تۆ لەو بارەیەوە ڕات چییە؟
و32 : دەربارەی هۆنراوە، زانایانی ئیسلام ئەوەیان گوتووە: (الشعر کلام، قبیحە قبیح و حسنها حسن.) واتە: هۆنراوە خۆی لە خۆیدا، وەک قسەکانی دیکە وایە. ناوەڕۆک و ئەو ئامانجەی بۆی گوتراوە، گەر شتێکی باشبێ، ئەوا باشە. گەر ناشیرینیشبێ، ئەوا خراپە!
پەیامبەر « د.خ. »، چەن هۆنەرێکی وەک: « حەسانی کوڕی ثابت، کەعبی کوڕی مالیک و عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە »ی هەبووە. هەر بە فەرمیی، وەڵامی هۆنەرە بێ باوەڕەکانیان داوەتەوە، کاتێ، هۆنەرە گاورەکان هاتوون، ئیسلامیان داشۆریوە.

بێ گومان، ئەو ئازادیی بیرورایەی ئەو کاتە هەبووە، ڕەنگە، ئێستە، گەر دەوڵەتێکی ئیسلامیی دامەزرێ، زۆر بە گران بتوانێ، بەو ئاستە بگاتەوە، کە کۆمەڵێ هۆنەری گاوور بێنی، لە مزگەوتێکدا کۆیانکەیتەوە و پێیان بڵێی: فەرموو، دژی ئیسلام، قسەی خۆتان بکەن. ئینجا، هۆنەرەکەش بە ئارەزووی خۆی، قسەی خۆی بکا. تۆش، هۆنەری خۆت بێنی، بڵێی: فەرموو، وەڵامیانبدەرەوە. لە مزگەوتدا، کابرا قسە بە ئیسلام بڵێ و ستاییشی « کوفر » بکا! بە خراپە باسی ئیسلام بکا! مەبەستم ئەوەیە، تا ئەو ئەندازەیە، ئازادیی بیرورا هەبووە.

ــ ئـــەوە، لە سەرەتای بڵاوبوونەوەی ئیسلامدا بووە. بەڵام، دوای ئەوەی، ئیسلام بڵاوبۆتەوە و دەسەڵاتی پەیداکردووە، ئەو شتە نەماوە. چونکە، گاوور نەماوە. ئەوانەشی مابوون، ڕێیان پێ نەداون، ئەو شتانە بڵێن.

نا، نا. نەک هەر لە سەرەتادا بووە، بەڵکوو، هەر ئەو کاتە بووە، پەیامبەر لە شاری « مەدینە »، لەو پەڕی دەسەڵاتیدا بووە. لە سەرەتادا نەبووە، لە کۆتایی سەردەمی پەیامبەردا «د.خ. » بووە.

جا، کاتێ « حەسان کوڕی ثابت » وەڵامیداونەتەوە، پەیامبەر «د.خ. » فەرموویەتی: (اهجوهم و روح القدس معاک.) وەڵامیانبدەرەوە، گیانی پاکیشت « جوبریل » لەگەڵ دایە.

خوای پەروەردگار، دەربارەی هۆنەران فەرموویەتی: (و الشعراء یتبعهون الغاون الم تر انهم فی کل واد یهیمون و انهم یقولون ما لا یفعلون الا الذین امنوا و عملوا الصالحات) کەواتە: ئەوانەیان کە ئایینداررن و کردەوەی باشدەکەن، لەو بڕیارە خراپانەی خوای پەروەردگار بە سەریدا داون، بە دوورن. وەک دەڵێن: هەر تیرەیە لە کەندالێکی، زۆر قسەدەکەن، باسی هەموو شت دەکەن، (و انهم یقولون ما لا یفعلون.) واتە: پتر قسەدەکەن، لەوەی کردەوەیان هەبێ. بەڵام، جگە لەوانەی خەڵکی باوەڕدارن و کردەوەی باشدەکەن.

چونکە، ئەو دەڵێ: دوای ئەوەی، ئەو ئایەتە هاتووە، « حەسان، کەعب و عەبدوڵڵا » چوون بۆ لای پەیامبەر « د.خ. » گوتوویانە: خوای پەروەردگار، دەربارەی هۆنەرەکان شتێکی وای ناردووە، وا باشترە، ئیدی لە مەودوا، ئێمەش هۆنراوە نەڵێین. پەیامبەر « د.خ. » ڕاوەستا. دوایی خوای پەروەردگار، ئەو ڕستەیەی دوایی ناردە خوارەوە (الا الذین امنوا و عملوا

الصالحات و ذكروا الله كثيرا انتصروا من بعد ما ضلموا.) جگه له وانەی، کاتێ هێرشیان دەکرێتە سەر، ئەوانیش وەڵامی خۆیان دەدەنەوە.
گەر هۆنراوە، بۆ ئامانجێکی دیاریکراوی پێویست بەکاربێنرێ، گەر بۆ ئامانجێکی ڕێپێدراو « حەڵاڵ » بەکاربێ، پێویستە. گەر بۆ ئامانجێکی قەدەغەکراویش « حەرام » بەکاربێنرێ، قەدەغەیە. بێ گومان، ناوەڕۆکەکەشی تەماشادەکرێ، بەپێی ئەوە، بڕیاری لە سەر دەدرێ.

پ33 : چۆن لە مافی ژنان دەڕوانی؟
و33 : من زنجیرە گوتارێکم هەیە، لە هەفتەنامەی خۆماندا « کۆمەڵ »، تا ئێستە، لام وایە، «21 » ئەڵقەی لێ دەرچووە. « ئافرەت و خێزان لە سایەی شەریعەتدا »، نیازم وایە، دوایی، لە شێوەی پەرتووکێکدا چاپیکەم. زۆر بە درێژیی، باسی مافی ژنانم کردووە.
لێرەدا، هەر بە کورتیی: ئاوا دەڵێم: هەموو ئەو مافانەی بە پیاو دراون، بە ئافرەتیش دروان. بەڵام دەبێ، سرووشتی پێکهاتەی جەستەیی و باری دەروونیی ئافرەت ڕەچاوکرێ. ئەگینا، لە ئیسلامدا، هیچ جیاوازییەک، لە نێوان ژنان و پیاواندا نییە. تەنیا، جیاوازیی لە هێندێ لە ئەرکەکاندا هەیە، ئەویش، خاتری ئافرەتی تێدا گیراوە.
لەبەرئەوە، چ پێکهاتەی سرووشتیی، چ باری دەروونیی، چ بیری ئافرەت، بەو شێوەیە درووستبووە، دەتوانێ، هێندێ ئیش باشتربکا. پیاویش، هێندێ ئیشی، زیاتر و چاکتر بۆ دەکرێ. واتە: گەر هەموو پیاوی جیهان خڕبنەوە، ناتوانن، منداڵێکیان ببێ! ناتوانن، شیر بە منداڵەکانیان بدەن!
هەڵبەتە، ئافرەت هەر هێندێ شتی تایبەتمەندیی خۆی هەیە. ئەگینا، لە ڕووی ئەوەی، هەر دووکیان مرۆڤن، دیارە، هەر دووکیان خواپەرستییان لێ قەبووڵە، هەر دووکیان ڕێزلێگیراون، هەر دووکیان بۆ چالاکیی بیریی، ڕامیاریی، کۆمەڵایەتیی و تەنانەت « جیهاد »یش، ڕێیان لە بەردەمدا کراوەیە. چونکە ئیسلام، جەنگی لە سەر ئافرەتان پێوست نەکردووە. هەروەها، نوێژی ڕۆژی « هەینیی »شی، لە سەر پێویست نەکردوون. هەر چەندە، ڕێی لێ نەگرتوون، بیکەن، لەبەرئەوەی، بۆیان ناکرێ، بیکەن، خاتری گرتوون. بەڵام، گەر ئافرەتێ توانی، بیکا، خێریشی دەگا، پاداشتیشی هەیە و هیچ خراپیشی نەکردووە.

پ34 : چۆن لە دەوڵەتی یاسا دەڕوانی؟
و34 : بەڕێزت، یاسا پێناسەبکە، تا منیش ...
— مەبەستم لە دەوڵەتی یاسا، دەوڵەتی ئیسلامیی نییە! بەڵکوو، مەبەستم لە دەوڵەتێکە، کۆمەڵێ پسپۆڕ کۆبنەوە، جا، ئەو کۆمەڵە خەڵکە، بە شێوەی تاکتاک بن، یا کۆمەڵێ پارت بن، لە بەر ڕۆشنایی بەرنامەیەکی دیاریکراودا، دەستووریێ بۆ دەوڵەتەکە دانێن و دایمەزرێنن. واتە: چوارچێوەیەکی هەبێ، پەرلەمان دەسەڵاتی یاسادانانی هەبێ، دەسەڵاتی جێبەجێکردن واتە: میریی، دەسەڵاتی هەبێ، دەسەڵاتی دادگەریی هەبێ، ڕۆژنامەگەریی ئازادبێ. واتە: کۆمەڵێ بێ، باوەڕی بە « پلورالیزم » فرەپارتایەتیی هەبێ، میلیشیای تێدا نەبێ. ئەوە دەوڵەتی یاسایە!
مەبەستم لەو ڕوونکردنەوەیە ئەوەبوو، ووشەی یاسا لە کوردییدا، لە چییەوە هاتووە، ئێمە دوای ناکەوین. ئێستە، یاسا لەبری « قانون » بەکاردێ، لەبری « نیظام » بەکاردێ. وا نییە؟
— « قانون »یش، لە بنەڕەتدا ووشەیەکی « گریکیی »یە.
دەزانم. واتە: شتێ هەبێ، ژیانی خەڵک ڕێکخا. ئێمە پێمان وایە: تاکە یاسایەک، ژیانی مرۆڤەکان لە نێو خۆیاندا، گەل لەگەڵ دەزگەکانی دەسەڵاتدا، گەل و دەوڵەت لەگەڵ خوای پەروردگاردا ڕێکخا، بە شێوەیەک، مرۆ لە جیهان و لە دوا ڕۆژدا، پێی بەختەوەربێ، تەنیا ئایینی ئیسلامە. تەنیا ئەو بەرنامەیەیە، ئەو سیستیمەیە، کە ئیسلام دایناوە.
لەبەرئەوە، گەر بگوترێ: دەوڵەتی یاسا، گەر مەبەست یاسای ئیسلام بێ، ئەوا دیارە، لە سەر موسوڵمانان پێویستە، هەوڵبدەن، کۆمەڵگەکەیان، کۆمەڵگەیەکی یاسایی بێ. دەوڵەتەکەیان، دەوڵەتێکی یاسایی بێ. گەر مەبەستیش، لە دەوڵەتێکی یاسایی نائیسلامیی بێ، ئێمە تەماشادەکەین و دەڵێین: باری سرووشتیی ئاسایی و چاوەڕوانکراوی گەلێکی موسوڵمان ئەوەیە: ژیانی خۆی، ژیانی « ڕامیاریی، ئابووریی، کۆمەڵایەتیی، بیریی و فەرهەنگیی » خۆی، لە سەر بنچینەی ئیسلام ڕێکخا. گەلێکی موسوڵمان دەبێ، بەرنامەکانی ژیانی خۆی، سیستیمی فرمانڕەوایی خۆی، لە ئایینەکەیەوە، لە باوەڕەکەیەوە هەڵقوڵێ. گەر ئەوەی بۆ کرا، ئەوا دیارە، دەبێ و لە سەریشی پێویستە، بۆ ئەوە هەوڵبدا. بەڵام، گەر لە قۆناغێکدا بوو، هەلومەرجەکە، ڕێی ئەوەی نەدا، بۆی نەڕەخسا، ئەوە بکا، زاناکانی

ئیسلام دەڵێن: (ملک غشوم خیر من فتنە تدوم.) کەسێ هەبێ، یاسایە دانێ، ژیانی خەڵکی پێ ڕێکخا، ئاژاوە و گێرەشێوێنیی نەهێڵێ، با ئیسلامییش نەبێ، با، جارجار، هەڵەوپەڵەشی تێدابێ. بێ گومان، جگە لە ئیسلام، هەموو یاسایەک، هەڵەوپەڵەی هەر تێدا دەبێ. ئەوە، لە ئاژاوەیەک باشترە، کە هەبێ و بەردەوامبێ. کەواتە: لە بارێکدا، دەسمانبڕوا و بۆمان بکرێ، لە سەرمان پێویستە، ئیسلام فرمانڕەوا و بالادەسکەین. گەر دەسمان بەوە نەگەیی، شتێکی دیکە هەبێ، ژیانی خەڵک ڕێکخا، چاکترە، لەوەی ئاژاوە هەبێ، وەک « اهون الشرین ».

پ35 : باوەڕتان بە « پلورالیزم ـ فرەپارتایەتیی » هەیە؟

و35 : بەڵێ.

ــ کەواتە: باوەڕ بە دێمۆکراسییش هەیە؟!!

نەخێر.

ــ ئاخــر، « پلورالیزم »، بە یەکێ لە پرینسیپە گرنگەکانی دێمۆکراسیی دەژمێررێ!

دەزانم. من باوەڕم، بە زۆربەی پرینسیپەکانی دێمۆکراسیی هەیە. ئێستە، من بۆت لە تەتەڵەدەدەم، باوەڕم بە کوێی دێمۆکراسیی هەیە و بڕوام بە کوێی نییە. گەر باسی دێمۆکراسیی بکەین، تا تۆزێ بۆت لە تەتەڵە و بێژنگ بدەم.

ــ باسی دێمۆکراسییمان کرد.

نا. من باسم نەکرد.

ــ یەکەمین زاراوە، دێمۆکراسیی بوو.

دەزانم. بەلام، بە درێژیی باسم نەکرد، باوەڕم بە کوێی هەیە و بە کوێی نییە.

ــ باشە. با، تەنیا هێندەی لێ باسکەین، تا بزانین، باوەڕت بە کوێی نییە!

بێ گومان، دێمۆکراسیی، چەن شێوەیەکی هەیە، بە تایبەتیی، شێوەی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆی هەیە. ڕاستەوخۆ ئەوەیە، گەل هەمووی بەشداربێ. ناڕاستەوخۆکەشی ئەوەیە، لە لایەن نوێنەرانەوە بێ.

بڕوام بەو شوێنەی دێمۆکراسیی نییە، ئەوەیم، لەگەڵ باوەڕی ئیسلامیی و لەگەڵ ئاییندا لا ناگونجێ، کە گەل، چ ڕاستەوخۆ و چ ناڕاستەوخۆ، واتە:

نوێنەرەکان و پەرلەمان سەرپشککرێ، بە ئارەزووی خۆیان، یاسادانێن. ئەوە، بە هیچ شێوەیە، لەگەڵ باوەڕ و « شەریعەت »ی ئیسلامییدا ناگونجێ. بۆچی؟ چونکە، لە ئیسلامدا، مرۆڤان بەندەی خوان. بەندەکانی خواش، خوا ڕێیان پیشاندەدا. (ان الحکم الا للە.) خوای پەروەردگار دەبێ، بەرنامەیان بۆ دانێ. بەڵام، خۆیان دەسەڵات دیارییکەن. دەسەڵات، گەل دیارییدەکا، بە دەس کێوە دەبێ. بەڵام، ئەو دەسەڵاتە دەبێ، لە بەر ڕۆشنایی « شەریعەت »ی خوادا بێ.
جا، لە ئیسلامدا ڕێدراوە، کاتێ بڕیاردەدەن، « شەریعەت » فەرمانڕەوابێ، لە ژێر سایەی ئەو « شەریعەت »ەدا، با لایەنی ڕامیاریی هەبن، یا، با دەساودەسپێکردنی دەسەڵاتیش هەبێ، بە شێوەیە، هەر پارتێ ئازابێ، بەرنامەکانی خۆی، هەمووی لە « شەریعەت »ەوە هەڵێنجێ، لە زەریای فراوانی « شەریعەت »ەوە، لە هەموو ڕووەکانی « ڕامیاریی، ئابووریی، کۆمەڵایەتیی ... » بڕوانێ. وەک چۆن، ئێستە، لە وڵاتانی ڕۆژاوا، پێشبڕکێ هەیە و لە سەر بەرنامەکانیان دەمەتەقێدەکەن، با، ئەو لایەنانەش، هەموویان ئازابن، هەر کامێکیان، کۆمەڵانی خەڵک، بە بەرنامەکانی خۆی قایلکا، کە ئەو چاکتر دەتوانێ، خەڵک بەختەوەرکا، ژیان بەرەو پێشەوە بەرێ، گەل ئاسوودەکا و وڵاتیش ئاوەدانکاتەوە.

پ36 : دێینە سەر بابەتێکی دیکە، ئەویش « تیرۆر »ە. مێژووی « تیرۆر » لە « کوردستان »دا چۆن باسدەکەی؟
و36 : پێناسەی « تیرۆر »؟
ــ گەر پێناسەیەکی جیاوازت هەیە، لەو پێناسانەی هەن، فەرموو.
بەڕێزت، چۆن لە پێناسەی « تیرۆر » تێگەیشتووی؟
ــ پێناسەی « تیرۆر »، وەک ڕەشەکوژیی، وەک جۆرەکانی « تیرۆر »ی تاک و « تیرۆر »ی دەوڵەت، هەموو ئەو شتانە دەگرێتەوە، کە پێوەندیی بە « تیرۆر »ی بیرەوە هەیە، وەک لە پەرتووکەکاندا هەیە و نووسراوە، شتێکی گشتییە. زۆر جاریش، تێکەڵاودەکرێن، لایەنێ لە سەر ڕەوایە، بەڵام، بە « تیرۆریست » تاوانباردەکرێ. ئەمانەش، باری تێبینیی و سەرنجی تایبەتیی خۆیان هەیە. ئێوە، وەک لایەنێکی ئیسلامیی، چۆن سەیری « تیرۆر » دەکەن؟

من هەرچیم گوتووە، وەک خۆم گوتوومە. بەڵام ڕەنگە، ئەو پارتەی من بەرپرسیاریم، لە زۆربەی یا لە هەموو شتەکاندا، لەو ڕایەدا لەگەڵ من بن. سەبارەت بە « تیرۆر »، من هەر هێندە دەڵێم: بە ڕاستیی، من پێم سەیرە، کاتێ دەڵێن: تا ئێستە، بە شێوەیەکی ڕوون، پێناسەی « تیرۆر » نەکراوە! لە ماوەی پێشوودا، کۆڕێکم، دەربارەی « تیرۆر » هەبوو. بۆ ئەو مەبەستە، دیارە، لە ووشەی « تیرۆر »م کۆڵییەوە. هێندێ لە فەرهەنگەکانی زمان و پەرتووکەکانی مێژوو، بە تایبەتیی، پەرتووکەکانی مێژووی « ئەورووپا »م خوێندەوە. بۆم دەرکەوت: بۆ یەکەمین جار لە مێژوودا، ساڵی « 1793 »، ووشەی « تیرۆر »، لە « فرەنسە » بەکارهێنراوە. واتای « زمانەوانیی » ووشەکە، بەکارهێنانی « توندوتیژیی، زەبروزەنگ، ترساندن وتۆقاندن » دەگرێتەوە. واتا « ڕامیاریی »یەکەشی: هەم « مجمع اللغه العربیه »، هەم « المعجم الوسیط » هەم فەرهەنگی « دی خودا » کە بە گەورەترین فەرهەنگی زمانی « فارسیی » دەژمێررێ، لەوانەیە، سی هەزار لاپەڕە بێ. هەم فەرهەنگی « ئۆکسفۆردی بریتانیایی » و کۆمەڵە فەرهەنگێکی دیکەش، دەڵێن: « تیرۆر »، لە بەکارهێنانی توندوتیژیی پێکهاتووە، لە لایەن کەسێ یا چەن کەسێکەوە دەکرێ، بۆ گەیشتن بە ئامانجی ڕامیاریی پێڕەودەکرێ. ئەو توندوتیژییەش، جاری وا هەیە، سەر بۆ کووشتنی خەڵکیش دەکێشێ. کەواتە: « تیرۆر » ئەوەیە، هەوڵبدەی، بیروباوەڕێ، یا بەرنامەیەکی ڕامیاریی، یا بۆچوونی کەسێ، یا کۆمەڵێ، یا دەوڵەتێ، بە سەر کەسێکدا، یا کۆمەڵێکدا، یا لایەنێکدا، بە زۆر بسەپێنی. ئا ئەوە، واتای « تیرۆر »ە، هەر هۆیەک بەکاربێنرێ، تا بە ئەندازەی خەڵک کوشتنیش دەگا.

کەواتە: مەبەستی « ئیغتیال »ە کە بە کوردیی پێی دەگوترێ: ڕەشەکوژیی. من پێم وایە: پێی بگوترێ: « پەنهانکوژیی » ڕاستترە. چونکە، ووشەی « ئیغتیال »، لە « غیلە »وە هاتووە. واتە: « پەنهان » خوای پەروەردگار، کاتێ باسی « خەمر »ی کردووە، فەرموویەتی: (لا فیها غول و لا عنها ینزفون.) دەڵێن: « غول »، بە « یختال العقل » دێ. وەک دەڵێی، ژیریی دەدزێ. « غیلە و غەیب »، هەمووی بە شتی پەنهان و شاراوە دەگوترێ. کەواتە، « ئیغتیال » واتای « پەنهانکوژیی » دەگەیەنێ.

ــ بە نهێنیی. بە ئاشکرا نا.

ئا. بە نهێنیی. جا، ئەوە لەگەڵ « تیرۆر »دا جیایە. کابرا، جاری وا هەیە، لە سەر کێشەیەکی ڕەوا، دوژمنەکەی بە نهێنیی دەکوژێ. وەک ئێمە، لە خەباتی ڕزگاریخوازانەماندا، لە بازاڕەکانی « سولەیمانیی، بەغدا و ... » زۆر لە سەرانی ڕژێمی « بەعس »مان، بە نهێنیی دەکوشت، خۆشمان بە ڕەوا دەزانی. بەڵام، « تیرۆر » واتە: بیرێ، یا بەرنامەیەکی ڕامیاریی، یا هەڵوێستێ، بە زۆر بە سەر خەڵکدا بسەپێنرێ. بێ گومان، ئەوەش شتێکی ناڕەوایە. جا من لەو کۆڕەدا، جوان پێناسەمکردووە. ئێستە، لە شێوەی نامیلکەیەکدا چاپکراوە، خوا یاربێ، کە بڵاوبۆوە، بۆت دەنێرم. بێ گومان، « تیرۆر » بە هیچ شێوەیە، لە « شەریعەت » دا جێی نابێتەوە.
بەڵام، لە « کوردستان »دا لە کوێوە سەریهەڵداوە؟
ــ بەڵێ. ئەوە مەبەستی سەرەکیی پرسیارەکەمە.
بە ڕاستیی، کاک دوکتۆر! لە لایەن برادەرانی « پارتیی و یەکێتیی »یەوە سەریهەڵداوە. ئەوەی بە زەقیی لە یادمبێ، هێندێ تێبینیشم لای خۆم نووسیوە. بۆ وێنە: کاتی خۆی، بنەماڵەی « فاخیر مێرگەسووریی »، خەڵکێکیان لێ کوژرا. واتە: ئەوە بەو پەنهانکوژیی و ڕەشەکوژییە بوو. چونکە، ئێستە « تیرۆر »، ئەو واتایە وەردەگرێ. ئەگینا « تیرۆر »، بە واتای سەپاندنی بیروباوەڕ بە سەر خەڵکیدا دێ، گەر قەبووڵی نەکرد، بیکوژێ. من پێم وایە، ئەوەی ئێستە « ئەمێریکا » دەیکا، گەورەترین جۆری « تیرۆر »ە. ئەوەش، « موسوڵمان، گاوور، تاک، پارت یا دەوڵەت » بیکا، هەر دەبێ، ڕەتکرێتەوە. بێ گومان، خەڵکی دیکەش زۆر کوژراوە، بۆ نموونە: « مەلا ئەحمەدی سینەمۆکیی، مەلا عومەری تیمار ... » کوژراون. ئینجا، دیلەکانی « پارتی کۆمۆنیست » و « بەرەی جود »، لە « قرناقا و پشتئاشان » کوژراون. گەر ئەوانە « تیرۆر » بن! چونکە، ئێستە وەک بڵێین: بەپێی نەریتی باوی خەڵک، دیل کوشتن بە نهێنیی، بە هەر جۆرێ بکوژرێ، بە « تیرۆر » دادەنرێ. بەڵام، لە ڕاستییدا، وا نییە.
بە ڕاستیی، برادەرانی « پارتیی و یەکێتیی »، ئەو ڕێیەیان شکاند. چونکە، دیلەکانی یەکدیان دەکوشت. بە شێوەیەکی ناشیرین و خراپ، یەکدیان لەنێودەبرد. بە « 60 - 70 » کەس لە یەکدیان دەکوشت. پاشان، بە خوێنی یەکدی، دیوارەکانیان دەنووسی. نازانم، بڵێم: بە چی یەکدی دەیانکوژاندەوە. « موحەممەد حەلاق »، لە ڕێ بۆسەیان بۆ دانا، نازانم، لە

کوێ کوشتیان؟ بە ڕاستیی، بە داخەوە، ئەو برادەرانە، لە « کوردستان »، ئەومیان داهێنا. بەڵام، بۆ نموونە دەڵێم: ئەوە هەمووی ڕەشەکوژیی، یا پەنهانکوژیی، یا کوشتنی ناڕەوا بوون. بەڵام، بە ڕاستیی، بەپێی ئەو پێناسەیەی من باوەڕم پێی هەیە، ئەوە « تیرۆر » نییە.

پ37 : ڕاتان بەرانبەر جەنگی دژەتیرۆر چییە، ئەوەی « ئەمەریکا » ڕایگەیاندووە؟
و37 : گەر بە ڕاستیی، کەسێ هەبێ، بیەوێ، خەڵک تیرۆرکا، پێویستە، هەموو کۆمەڵگەی مرۆ، لە بەرانبەریدا، یەکدەس و یەکدەنگ بێ. بەڵام دەبێ، بزانین، « تیرۆر » واتای چی دەگەیەنێ؟
وەک گوتم: « تیرۆر » ئەوەیە: بیروڕا و ڕامیاریی خۆت، بە سەر خەڵکدا بسەپێنی. ئێستە، ئـــــــەوەی « ئەمێریکا » دەیکا، بە گەورەترین جۆری « تیرۆر » دادەنرێ. من پێم وایە، دەبێ، هەمو خەڵک بەرانبەر « ئەمێریکا » بوەستێ. دژی ئەو قسەیەی « جۆرج بوش » بوەستێ، کە گوتوویەتی: ئەوەی لەگەڵمان نەبێ، ئێمە، لە سەنگەری بەرانبەردا دەیانبینینەوە. ئەوەی لە بەرەی ئێمەدا نەبێ، لەگەڵ ئێمەدا چەک هەڵ نەگرێ، لەگەڵ ئەو کەسانەدا بێ، کە ئەو پێیان دەڵێ « تیرۆریست » و ئەو بە دوژمنی خۆی دادەنێ، ئا ئەوە خـــۆی لە خـــۆیدا، بە گـــەورەترین جـــۆری « تیـــرۆر » دەژمێررێ و گەورەترین زلهێزیی ئەم جیهانەش دەیکا.
بە ڕاستیی، ئەم پیاوە، هەمان ڕامیاریی « فیرعەون » دووبارەدەکاتەوە، چونکە دەیگوت: « ما اریکم الا ما اری و ما اهدیکم الا سبیل الرشاد.)
کەواتە: تۆ هەر کەسێ، لەگەڵتدا نەبوو، بە دوژمنی خۆتی بزانی، هەر خۆشت بە ڕاست و ڕەوا بزانی، بڵێی: ڕەوا هەر ئەوەیە، من دەیڵێم و بەرانبەرەکەشم بە تەواویی ناڕەوایە. ڕەوا، تەنیا هەر لە سەر من تاپۆ کراوە، « تیـرۆر » ئا لێرەوە سەرچاوەدەگرێ. توندوتیژیی لێرەوە دەسپێدەکا. جا، هەر کەسێ وا بکا، پێویستە، هەموومان دژی بوەستین. چونکە، بە ڕاستیی، ئەو کارە بۆ کۆمەڵگەی مرۆ، شتێکی پڕ زیانە. جا، گەر « موسوڵمان، گاوور، تاک، پارت یا دەوڵەت » بیکا، شتێکە زیانی هەیە. هەر کەسێکیش وا بکا، سەری لەوەوە دەردەچێ: خەڵک یا دەبێ، دیل بێ و خۆی بەدەسەوەبدا، یا دەبێ، لەنێوبچێ. واتە: ڕێی سێیەمیان بۆ

خەڵک نەهێشتۆتەوە. یا دەبێ، لەنێوچوون، دیلبوون، خۆبەدەستەوەدان و بوونە پاشکۆ هەڵبژێرن. ئەوەش، گەورەترین سووکایەتیی و هیچوپووچیی نەبێ، بە سەر کۆمەڵگەی مرۆیدا دێنێ، هیچی دیکە نییە! بە سەر هەر مرۆڤێ بێ، بە سەر هەر کۆمەڵێکیش بێ، هیچ لە باسەکە ناگۆڕێ!

پ38: کەواتە: ڕووداوەکانی « 11 .09 .2001 » لە « ئەمێریکا » و ئەو هێرشەی « ڕێکخراوی ئەلقاعیدە » کردی، چۆنی هەڵدەسەنگێنی؟
و38 : ئێمە، ئاوای تەماشادەکەین و دەڵێین: لە نێو پێناسەی « تیرۆر »دا، جێی نابێتەوە. چونکە، « تیرۆر » ئەوەیە: خەڵک بکوژی. لەبەرئەوەی، بیرەکەی تۆ پەسەند ناکا. ئەوە، ئێمە لە قاڵبی جەنگدا دایدەنێین.
گەر وەک خۆی تەماشایکەی، بێ ئەوەی، تەماشای ڕابوردووی بکەی. واتە: وەک ئەڵقەیەک، بە تەنیا تەماشایکەی، نەک، وەک ئەڵقەیەک لە زنجیرەیەک، کە کۆمەڵێ هۆکار بوونە هۆی ئەوەی، ئەو ڕووداوە پەیدابێ. ئەوا ئێمە، بە شتێکی هەڵەی دەزانین. بە شتێکی نارەوای دەزانین. هەم ڕفاندنی فڕۆکەکە و هەم تەقاندنەوەی فڕۆکەکە، پاشان خۆکێشان بەو دوو بینایەدا، کە سێ هەزار کەسیان تێدا کوژرا، لە « شەریعەت »دا جێی نابێتەوە. چونکە، خەڵکێکی بێ تاوان کوژراون، ئاگایان لە هیچ نەبووە. جا، چ ئەوانەی لە نێو فڕۆکەکەدا بوون، چ ئەوانەی لە نێو بیناکاندا کاریانکردووە، ئاگایان لە هیچ نەبووە.
بەڵام، گەر هەر ئەو کێشەیە، وەک ئەڵقەیەک لە زنجیرەیەک تەماشاکەین، ڕێکخراوی « قاعیدە » دەڵێ چی؟ دیارە، من لێرەدا نامەوێ، پاساو بۆ ئەو کارەی ئەوان بێنمەوە. بەڵام، من دەڵێم: شتەکان دەبێ، وەک خۆیان تەماشاکەین. کوردەواریی دەڵێن: « ئەوەی دڕک بچێنێ، دڕکیش دەدورێتەوە. » ڕێکخراوی « قاعیدە » دەڵێن: « ئەمێریکا »، دوورگەی عەرەبیی داگیرکردووە، پشتی « جوو »ی گرتووە و « فلەستینیی »یەکان دەکوژێ. خێر و بێری وولاتانی « کەنداو » تاڵاندەکا، دەیەوێ، دەس بە سەر جیهاندا بگرێ. لە زۆربەی وولاتانی جیهاندا، بنکەی سەربازیی داناوە. « ئەمێریکا »، وولاتی ئێمەی داگیرکردووە، دەبێ، وولاتەکەمان بەجێبێڵێ. لەبەرئەوە دەڵێن: ئەوەی ئێمە کردار نییە،
ــ ئەدی چییە؟ کاردانەوەیە!

بەڵێ. کـاردانەوەیە! با « ئەمـێـریکا »، واز لە « زۆرداریی، سـتـەم، خۆسەپاندن، کوێخایەتیی و پاوەنخوازیی » بێنێ، تا ئێـمەش، کاری وا نەکەین. گەر بەو شێوەیە، تەماشای گرفتەکە بکەین، ئەوا لە « شەرع »دا جێیدەبێتەوە.

بۆ زانیارییت، گەر کەسێ، گەلی تۆی جینۆساید و قڕکرد، ئایا، تۆش بۆت هەیە، خەڵکی خەتابار و بێ خەتا، چەکدار و بێ چەکی ئەو بکوژی؟

بێ گـومـان، زانایان لێـرەدا، دوو بۆچوونیـان هەیە: هـێندێکیـان دەڵێن: نەخێر، بۆت نییە. چونکە، ئەوە لە « شەرع »دا قەدەغەکراوە.

بێ گـومـان، بە دڵنیـاییـیـەوە دەڵێم: لە باری ئاسـاییـدا، خـەڵکی بێ دەسەوسان بکوژی، لە « شـەرع »دا قەدەغەکراوە. واتە: پەیامبەر «د.خ.» فرمانی بە سەرکردەی لەشکرەکانی خۆی کردووە و گوتوویەتی: نابـێ، « ژن، منداڵ، پیر، پەککەوتە، ڕەبەن، کرێکار، جووتیار، خـەڵکی دیکەی شـەڕنەکـەر » بکوژن. ئەوەش هەمـووی، فـەرموودەی خـۆی لە سـەرە و بە کردەوەش پیادەکراوە.

بەڵام، زانایان دەڵێن: گـەر دوژمنەکـەت وابوو، تەڕ و وشکی پێکەوە سـووتاند، شـەڕکەر و ناشـەڕکـەری پێکەوە کـوشت، ژن و منداڵی پێکەوە قـەلاچۆکـرد، ئایا، تـۆش بۆت هەیە، بە هەمـان شـێـوەی ئەو، خـەڵکی لێ بکوژی، بۆ ئەوەی، دەس لە ستەم و زۆرداریی هەڵگرێ؟

هێندێ لە زانایان هەر دەڵێن: نەخێر. بۆت نییە. چونکە، ئامانجەکـەت « شەرعیی »یە، دەبێ، ئامرازەکەشت هەر « شەرعیی » بێ.

هـێندێکی دیکە لە زانایـان دەڵێن: بەڵێ. چونکە، خـوای پەروەردگـار فەرموویەتی: (فمن اعتدى عليكم فاعتدوا عليه بمثل ما اعتدى عليكم.) کەسێ دەسدرێژییکردنە سـەر، چۆن دەسدرێژییدەکا، ئێوەش، هەر بەو شێـوەیە، دەسدرێژیی بکەنە سەر. گەر ئەو مـاڵی ڕوخاندی، تۆش مـاڵی بڕوخێنە. گەر ئەو منداڵی کـوشتی، تۆش منداڵی بکوژە. لەبەرئەوەی، دەس بە گەورەکەی ناگا. من ئەو ڕایەی دووەمم پێ ڕاستترە. ڕەنگە زۆربەشبن.

ــ واتە: « العين بالعين و السن بالسن »

ئا. جـا، بەو شێـوەیە دەبێ، تەمـاشـابکرێ. گەر هـەر وەک خودی خۆی، ڕووداوەکە تەماشاکەی، لە « شەریعەت »ی ئیسلامدا جێی نابێتەوە. بەڵام، کـاتێ تەمـاشـای ڕابردووی دەکـەین، بۆچی، ئەو کـارەسـاتە ڕوویداوە،

ڕابردووەکەی دەخوێنینەوە، کابرا دەڵێ: کاکە! من گەلەکەم زەبوونکراوە، ژێردەسکراوە، ئەوەتە، من موسوڵمانی « فلەستینیی »م دەکوژرێ، خێر وبێرم دەبرێ، « ئەمێریکا » دەیەوێ، هیچم بۆ نەهێڵێتەوە، گەر وای لێ نەکەم، بە هۆش خۆی نایەتەوە، کە زۆردارە، دیکتاتۆرە و ژیانی هەموو گەلانی جیهانی، خستۆتە مەترسییەوە.

ــ باشــە، تۆ پێت وا نییە، ئەوەی « ئەمێریکا »، لە نێوچەی « خۆرهەڵاتی نێوەڕاست » و وڵاتە ئیسلامییەکاندا دەیکا، بە تەنیا هەر، ئەو تاوانبار نییە. بەڵکوو، دەسەڵاتدارانی وڵاتەکان خۆشیان تاوانبارن. چونکە، گەلەکانی خۆیانیان وا کەساسکردووە، گەر ئەو دەسەڵاتدارانە بگۆڕرێن، بەوانەی ئیسلامییەکان دەیانەوێ، بەوانەی ناسیۆنالیستەکان دەیانەوێ، بەوانەی کۆمۆنیستەکان دەیانەوێ، لە دەسەڵاتی « ئەمێریکا »وە دوورین و ئەویش دەسەڵاتی لە نێوچەکەدا نامێنێ؟

کاک دوکتۆر! پەندێکی کوردیی هەیە، دەڵێ: « دز و خاوەن ماڵ یەککگرن، گا بە کلاوڕۆژنەدا سەردەخەن. » من پێم وایە، هەم دەسدرێژیی دەرەکیی، هەم دیکتاتۆری نێوەکیی، واتە: دوژمنی دەرەوە و سەرکووتکەرانی نێوەوە، هەر دووکیان گەلەکانیان کەساسکردووە. بەڵام، ڕاست دەفەرمووی، ئەوەی زەمینەی بۆ دەسدرێژیی دەرەکیی، بۆ دەستێوەردانی دەرەوە خۆش کردووە، بە ڕاستیی، ئەو سەرکووتکردن و دیکتاتۆرییەی ناوەوەیە. کاتێ، گەلەکە، هیچیان لەگەڵ ئەو سیستێمە فرمانڕەوایانەدا نین، لەگەڵ ئەو دیکتاتۆرانەدا نین، کە فرمانڕەوایی ئەو گەلانە دەکەن، کاتێ گەلیان لەگەڵ نییە، دەبێ، پاڵپشتێکی دیکەیان هەبێ. پاڵپشتەکەش دەبێ، « ئەمێریکا » بێ. کاتی خۆی « یەکێتی سۆڤێت » بوو، یا دەبێ، « چین » بێ. واتە: دەبێ، بە شوێنێکەوە وابەستەبێ. چونکە، فرمانڕەوا دیکتاتۆرەکانی ئەو وڵاتانە، « بنکەیەکی میللیی »یان نییە، گەلەکەی خۆیان بە دوژمن دەزانن. لە گەلەکەی خۆیان دڵنیا نین. دەبێ، پاڵ بە شوێنێکی دیکەوە بدەن. جا هەر کاتێ، پاڵیان بە شوێنێکی دیکەشەوە دا، ویستیان نامێنێ!

ــ کــەواتە: بۆ لە وێوە دەس پێ ناکەن؟ ئەو فرۆکەیەی هەڵیدەسێنن، دوو بینای گەورە، لە « ئەمێریکا » دەڕووخێنن، بۆ ماڵی دەسەڵاتدارەکانی پێ وێران ناکەن؟!!

ئەوەش بۆچوونێکە. واتە: هێندێ لە ئیسلامییەکان،

ـ من نموونەشت بۆ دێنمەوە: شۆڕشی ئیسلامیی گــــەلانی « ئێران »، چۆن کرا؟ کێ کردی؟ بێ گومان، لە نێوخۆدا کرا. خۆ شۆڕشگێڕەکان، پەلاماری « ئەمێریکا »یان نەدا؟!!
بەڵێ، ڕاستە. هێندێ لە ئیسلامییەکان، ڕایان وایە و دەڵێن: دەبێ، لە نێـــوەوە بکرێ. هێندێکی دیکەش ڕایان وایە و دەڵێن: ئاخـــر، ئەو فرمانڕەوایانە، هیچیان بە دەس نییە، دەسەپاچەن. ئێمە، با کارێکی وا بکەین، « ئەمێریکا » چی دیکە، گوشار لە سەر ئەو فرمانڕەوایانە دا نەنێ، تا ئەوانیش، گوشار لە سەر گەلەکانیان دا نەنێن.
ئێدی دەتوانرێ، لەو بوارەدا، دەمەتەقێیەکی زۆر بکرێ. ئایا، ئەوە بکرێ، یا ئەوی دیکەیان بکرێ، باشترە؟ چونکە، گەلەکە خۆی گیریخواردووە، هێندێکی لەو باوەڕەدان و دەڵێن: گـەر « ئەمێریکا » وا لێ بکەین، بە دەردی خۆیەوە خەریکبێ و بناڵێنێ، یا ئێشی پێ بگا، هۆشێ بە بەر خۆیدا بێنێتەوە، چی دیکە، گوشار لەو فرمانڕەوا و دیکتاتۆرە کارتۆنانەی دایناون، نەکا، کە لە سەر سنگی گەلەکانیان، وەک « کابووس »، چۆکیان داداوە!

پ39 : ئەدی، ئەو ڕووداوەی، نێوان « جوند ئەلئیسلام و یەکێتیی »، لە گوندی « خێڵی حەمە » چۆن بوو؟ لە چ قاڵبێکدا جێیدەبێتەوە؟
و39 : من، هەر وا تەماشایدەکەم. شەڕبووە، « جوند ئەلئیسلام »، هەلیان بۆ هەڵکەوتووە، ژمارەیەکی زیاتریان، لە « یەکێتیی » کوشتووە. لە شەڕێکی دیکە و لە چیای « شنروێ »، « یەکێتیی » دەرفەتی لەوان بینیوە، ژمارەیەکی پتری، لە « جوند ئەلئیسلام » کوشتووە. بەڵام، ئەوەی جێی تێبینیبێ، ئەوەیە: « یەکێتیی » دەڵێ: کوژراوەکانی ئێمە، دەسیان بەسراوە و بە دیلیی کوژراون.
هەروەها، ئەوەی جێی تێبینییبێ، ئەوەیە: « جوند ئەلئیسلام » نەدەبوو، دوژمنایەتییەکەیان، لەگەڵ « یەکێتیی »دا، بەو ئەندازەیە بگەیاندایە و دیلەکانیان بکوژن. ناشڵێم، لە « شەریعەت »ی ئیسلامدا، هیچ دەرفەتی تێدا نییە، دیل بکوژرێ. بەڵام، کاتێ تێی دایە، لایەنی بەرانبەریش، دیلی تۆ بکوژێ. چونکە، لە « قورئان »دا، تەنیا باسی ئازادکردنی دیلی تێدایە و دەفەرموێ: (فاما منن بعد و اما فیدا.)

دوای ئەوەی، شەڕ کۆتاییدێ، دیلەکان یا بە منەت، واتە: منەتیان بە سەردا بکەن و چاکەیان لەگەڵدا بکەن، بە خۆڕایی ئازادیانکەن. یا، بەرانبەر بە شتێ ئازادیانکەن. تەنیا ئەو دوو شێوەیە هەیە. واتە: مەگەر دوژمن، دیلەکانی تۆ بکوژێ، تۆش وەک چاوشکاندنی ئەو، دیلەکانی ئەو بکوژیتەوە. جا، کە « یەکێتیی »، شتەکەی بەو شێوەیە قووڵ نەکردبۆوە، برایانی « جوند ئەلئیسلام » نەدەبوو، وایان قووڵکردایەتەوە و دیلەکانیان بکوژن.
کاتی خۆی، لە بەرەی « پشدەر » بووین. ئێمە، هێزەکانی « یەکێتیی »مان شکاند. « قەلادزێ »مان گرت. « یەکێتیی » ژمارەیەکیان لێ کوژرا. ئێمەش دوو بریندارمان هەبوو. دوایی، بە دژەهێرش، ئێمەش خەڵکمان لێ شەهیدکرا. لەو شەڕەشدا، ئێمە « 15 - 20 » دیلمان، لە چەکدارەکانی « یەکێتیی » گرت. چەن ڕۆژێ، لای خۆمان هێشتمانەوە.
با شتێکت بۆ بگێڕمەوە: ئێستەش، وەک بیرەوەرییەک، هەر لە یادمە و زۆر ڕایچڵەکاندووم. یەکێ لە دیلەکان هات، دەشەلی، خەڵکی شاری « سولەیمانیی » بوو. بەرگی سەربازییشی لەبەردابوو. گوتم: چیتە؟ دەسی برد، پێنج سەد دیناری، لە گیرفانی دەرهێنا. پارەکەشی خوێناویی بوو، کونکونیش بووبوون. گوتم: ئەوە چییە؟
گوتی: وەڵڵایی مامۆستا! بۆ ئەو پێنج سەد دینارە، بووم بە « یەکێتیی ». وەڵڵایی، ئەو پارەیەشم بۆ ئەوەبوو، گوێنییە ئاردی پێ بکڕم. ئەویش، خوا ئاگادارە، یەک کیلۆ ئاردمان لە ماڵدا نەبووە! کاتێ، ئەو پارەیەشیان دامێ، گوتم: کاکە! با بچم، ئاردەکە بۆ ماڵەوە بکڕم، پاشان، دێم بۆ شەڕ. چونکە، لە ماڵەوە ئاردمان نییە. بەڵام، نەیانهێشت، بچم، ئاردەکە بکڕم، یا پێنج سەد دینارەکە بۆ ماڵەوە بەرم و یەکسەر هێناویانم.
گوتم: پێنج سەد دیناری بدەنێ.
بێ گومان، ئەو « 15 - 20 » دیلە، ماوەی « 15 - 20 » ڕۆژێ، یا کەمتر، یا زیاتر، باشم لە بیر نەماوە، لامان مانەوە. مامۆستام بۆ دیارییکردن، بۆ خۆشم، چەن جارێ، ئامۆژگارییمکردن. کاک دوکتۆر!
— بەڵێ.
دوایی برادەرانی « INC » هاتن، بەرماندان. ئێمەش، دوو سێ کەسمان لای « یەکێتیی » بوو، ئەوانیش بەریاندان. ئەوانەی ئێمە بەرماندان، کاتێ

گەڕابوونەوە، لە کۆمیتەی « ڕانیێ »، نوێژی شێوان بووبوو، یەکسەر، نوێژی بەکۆمەڵیان دابەستبوو. کۆمەڵەکەی « یەکێتیی » گوتبوویان: ئەوە چییە؟
ئەوانیش گوتبوویان: نوێژدەکەین.
گوتبوویان: چۆن؟ وەڵڵا کاکە! تازە کەڵکی ئەومیان پێوە نەماوە، ئەمانە، بوون بە « ئیسلامیی ».
بڕوات ببێ، جار و بار، لە مزگەوتی « جیهاد » نوێژدەکەم، هێندێکیان لەوێ دەبینمەوە، دێن، دەڵێن: مامۆستا نامانناسیتەوە؟
دەڵێم: نەوەڵڵا.
یەکێکیان گوتی: وەڵڵا، مامۆستا! من یەکێ لە دیلەکانی « سالارە » بووم، کە بەرتانداین.
لێم پرسین: ئێستە چۆنن؟
گوتیان: وەڵڵا، ئێستە ئەوا لەگەڵ ئێوەین. یا بۆ نموونە: موسوڵمانین.
جا، من پێم وابێ، ئەوە هەڵوێستێکی ڕاست و « شەرعیی »یە. چونکە، خەڵکێ کە لەگەڵ « پارتیی و یەکێتیی » دایە، تۆ نابێ، وا بزانی، ئەوانە دژی ئیسلامن و دژی تۆن. بەڵکوو، ناچارکراون. کابرا، ژیانی پێوەی بەسراوەتەوە. هاوولاتییەکە، هاوزمانێکتە، ئینجا، ئێمە لەو ڕووەوە، تێبینییمان هەیە. ئەگینا، شەڕبووە، کە شەڕیش بوو، ئیدی، تۆ دەکوژی و ئەویش دەکوژێ.
ـــ ڕاستە. هەر چەندە، من زۆر ئاگادار نیم. ئایا، بە دیلیی کوژراون، یا لە شەڕدا پێکراون. بەلام، هێندە دەزانم، لە سەر شووشەی تێلێڤیزیۆن دیومە و لە ئینتەرنێتیشدا تێیدا بوو، سەربڕابوون.
وەڵلایی، بۆ سەربڕینەکە، پتر پڕوپاگەندەبوو. پێم وایە، نازانم، گەر یەکێ سەربڕابێ. چونکە، بە ڕاستیی، ئێمە نەمانبینی. تا ئێستەش، من لێم کۆڵیوەتەوە، ئەوان هەر یەکێکیان پیشاندا و گوتیان: ملی بڕاوە. بەلام، خۆی کوشتن، هەر کوشتنە. بەڵێ، سووکایەتییکردن بە جەستەی خەڵک، ئەتتکردن و ناشیرینکردنی لە « شەرع »دا قەدەغەیە. (و لا تغدروا و لا تمثلوا.) ئەوە دەقی فەرموودەی پەیامبەرە «د.خ.» واتە: پەیمان مەشکێنن، ئەتکی تەرمی خەڵکیش مەکەن! تەنانەت، « شەرع »یش قەدەغەیکردووە، هەر کەسێ هەبێ، بە پارە و ئەو شتانە، تەرمەکانیان بدرێتەوە.

گریمان، گەر واشبێ، سەریانبڕیبن، بێ گومان، وەک ئەتتکردن، ئەوە شتێکی خراپە. بەڵام، شتی زۆر لەوە خراپتر کراوە. سەری خەڵک، بە بلۆک پانکراوەتەوە. بە خوا، سەری پێشمەرگەی ئێمەیان، بە بلۆک پان و پلیش کردۆتەوە. بۆ نموونە: برادەرانی « پارتیی و یەکێتیی »، چییان بە یەکدی نەکرد؟ بە « 50 - 60 » دیل بە یەکیانەوە بەستوون و کوشتوویانن. نازانم، بە خوێنەکەیان، درووشمی یەکدیان پێ کوژاندوونەتەوە. زۆر بەزموڕەزمی دیکەی سەیریان، بە یەکدی کردووە. جارێ لەگەڵ « مام جەلال »دا بووم، پێم گوت: « مام جەلال » ! باش نییە، ئێوە ئەو گرفتەی « خێڵی حەمە و جوند ئەلئیسلام »، هێندە زەقدەکەنەوە.
گوتی: بۆ؟
گوتم: چونکە یەکەم ـ شتی زۆر لەوە خراپتر کراوە. دووەم ـ ئێوە ڕەنگە، وەک پارت قازنجێکی لێ بکەن. بەڵام دەزانی، وەک گەل، زیانی لێ دەکەین. بە تایبەتیی، ئێوە کەناڵی ئاسمانییشتان هەیە. خەڵک لە دەرەوە دەڵێن: ئەها، ئەو گەلە یەکدی سەردەبڕن! ئەها، ئەو گەلە یەکدی قەلاچۆ دەکەن! ئەوە، بە کەڵکی هیچ شتێ نایە. گوتم: گەلەکەمان ناوی دەزڕێ. بڕوابکە، خەڵک لە دەرەوە، « جوند ئەلئیسلام و یەکێتیی » و ئەو خەڵکە، لە یەکدی جیا ناکەنەوە، هەر دەڵێن: گەلی کوردە و لە گیانی یەکدی بەربوون. بۆیە، گەلێ زیانی لێ دەبینین. گوتم: ئەوە مەکەن.
ـــ لەو ڕۆژانەدا، لەو قاڵبە دەرچووبوو. کاتێ « پارتیی و یەکێتیی » جەنگی نێوخۆیان دەکرد. « ئەورووپایی »یەکان دەیانگوت: کورد، کورد دەکوژێ. بەڵام، لە ڕاستییدا، ئەوەی من لە « ئەورووپا » خوێندوومەتەوە و بیستوومە، « جوند ئەلئیسلام » بە « تیرۆریست » ناسرابوون و بە دەسکردی ڕێکخراوی « قاعیدە » ناودەبران. لە زۆربەی ڕۆژنامەکانیشدا، باسی ئەوە کراوە، چلوسێ کەس بوو، یا، نازانم، چەن کەسی دیکەشیان سەربڕیوە. لە « ئینتەرنێت »دا، گەر ئەو لاپەڕەیە بکەیتەوە، ئێستەش، ئەو سەربڕاوانە لا نەبراون. وا بزانم، وێنەی سیونۆ کەسیان بوو. جا، لەو قاڵبە دەرچوو بوو. بۆ؟ چونکە، هەلەکە لە باربوو.
برایانی خۆمان، کاتێ تەرمەکانیان بۆ « یەکێتیی » بردبۆوە، گوتیان: خوا ئاگای لێ هەیە، کەسمان نەدیوە، سەربڕابێ، تەنیا یەکێ نەبێ.
ـــ مەبەستم ئەوە نییە، سەریان لە ملیان بوبێتەوە. بەڵکوو، سەربڕابوون.

بۆ نموونە، گوتیان: یەکێکیان، شتێ بە ملیدا هاتبوو. جا نازانین، ڕیـزی « کڵاشینکۆف » بووە، لێی دراوە! ئایا، خەنجەر بووە؟ هەر شتێکی دیکە بووە. بەڵام، من پێم وایە، مردن هەر مردنە، چ سەریببڕی و پانیکەیتەوە، چ بیستووتێنی، هەر مردنە. واتە: ئەتککردنیش هەر ئەتتکردنە.

ـ مەبەستم ئەوەبوو، لەو قاڵبەدا جێی نەبۆوە، گوایە: کورد کورد دەکوژێ. بەڵکوو، لەو قاڵبەدا جێی بۆوە، کە « تیرۆر »، هەر « تیرۆر » و بە بەشێ لە « تیرۆر »ی جیهانیی دادەنرێ. « ماسمیدیا »کان وایان باسکردبوو.

بەڵێ دەزانم. ئەوە ڕاگەیاندن وا باسیکردووە.

ـ ئاخر، منیش باسی ئەوەت بۆ دەکەم.

ئەگینا، کاک دوکتۆر! کە شەڕێ دەبێ، یەکێ دەکوژرێ، جا بە دیلیی بێ، یا بە هەر شێوەیەکی دیکە بێ، گەر ئەوە « تیرۆر »بێ، ئەوەی « P.K.K. و یەکێتیی، P.K.K. و پارتیی، یەکێتیی و پارتیی »ش دەبێ، هەموویان هەر « تیرۆر » بووبن. چونکە، دیلی یەکدیان کوشتووە، خەڵکی یەکدیان، بۆ نموونە ئەوە کردووە. گەر ئەوانە « تیرۆر » بن، ئەوانی دیکەش « تیرۆر »ن. گـەر ئەوانەی پێش ئەو، « تیـرۆر » نەبووبن، ئەمـەش نابێ، ئەو بێ. خـۆ نابێ، گەر ئیسلامیی شەڕێکیکرد و یەکێکی کوشت، ئەوە بە « تیرۆر » دانرێ. ئەی گەر برادەرێکی « سیکولار، دیمۆکرات، سۆسیال دیمۆکرات یا مارکسیی » کردی، نابێ، ئەوە « تیرۆر » بێ، چونکە، ئیسلامیی نییە؟ ئەوە شتێکی ڕەوا نییە.

پ40 : چۆن لە گۆڕهەڵکەندنی شێخانی « نەقشبەندیی » دەڕوانی؟

و40 : ئەوە، لە خودی خۆیدا، شتێکی نا« شـەرعیی » و بێ پاساوە. ئێمە، لە کـاتی خـۆیدا، هـەڵوێسـتـمـان هـەبوو، بڵاڤـۆکـمـان لە سـەر دەرکـرد، گوتارمان لە سەر دا و لە ڕۆژنامەشدا، هەڵوێستی خۆمان دەربڕی. وەک گـوتم: هەم لە ڕووی « شـەرعیی »یەوە هەڵەیە. چونکە، وەک چۆن دەبێ، مرۆ بە زیندوویی، ڕێزی لێ بگیرێ، بە مـردووییش دەبێ، ڕێز لە خۆی و گۆڕەکەشی بگیرێ. لە « صحیحی موسلیم »دا هاتووە، ڕۆژێ پەیامبەر لە شوێنێ وەستابوو. تەرمێکیان هێنا، لە بەری هەستا. هاوەڵەکانی گوتیان: ئەی پەیامبەری خوا! (انه یهودی.) واتە: ئەوە تەرمی « جوو » بوو. فەرمووی: ( او لیست نفسا؟) واتە: ئایا، مرۆڤ نییە؟

مرۆڤ بەڕێزە، (لقد كرمنا بني ادم.) بە زیندوویی و بە مردوویش، هەر بەڕێزە. دەبێ، ڕێز لە ماڵەکەی و لە گۆڕەکەشی بگیرێ. لە فەرموودەدا هاتووە و دەڵێ: لە سەر گۆڕ دامەنیشن، لە سەر گۆڕ ڕامەوەستن. نابێ، ئێسکی مردوو بشکێنن. چونکە، ئەوە وەک ئەوە وایە، بە زیندوویی ئێسکەکەیت شکاندبێ! لەبەرئەوە، ئەو گۆڕهەڵکەندنە، بێ گومان، شتێکی نا« شەرعیی » و هەڵەبوو، ئەو برایانەش، بە ڕاستیی، پێی ناشیرین بوون.

پ**41** : دەربارەی جەنگی نێوخۆی نێوان « بزووتنەوەی ئیسلامیی و یەکێتیی »، وەک مێژوویەک، چیمان بۆ دەگێڕیتەوە؟ کێ دەسپێشخەربوو؟ خەتای کێ بوو؟

و**41** : وەڵلایی، من هێندەی بە چاکی دەزانم، ئەوە دەڵێم. چونکە، مرۆ دەبێ، قسەیەبکا، قازانجی تێدابێ. واتە: زۆر ڕەوا هەیە، بەڵام، ڕەنگە گوتنەکەی زیانی هەبێ، هێندەی قازانجی هەبێ. دەڵێم: « یەکێتیی » دەیتوانی، ئەو شەڕە لەگەڵ « بزووتنەوەی ئیسلامیی » نەکا. ئێمەش دەمانتوانی، خۆمانی لێ لادەین. بەڵام، نەزانیی، یا ڕکوکینە بەرانبەر بە یەکدی، یا هەر هۆکارێکی دیکەی دەرەکیی یا ناوەکیی بووبێ، لە هەر دوو لاوە بوو. ئەو کاتەش، ساڵی « 1993 »، کە شەڕەکە لەگەڵ « یەکێتیی » بەرپابوو، گوتم: زۆرم پێ هەڵەبوو. سەرەتای شەڕەکە، لە « کفریی » دەسپێکرد. بێ گومان، برادەرانی « یەکێتیی »ش دەسیانپێکرد.

ــ وەک بیستم، گوتیان: لە سەر جووچکەقازێ بوو!

بڕوابکە، نازانم، سەرەتاکەی بە وردیی چۆن بووە. بەڵام، گرنگ ئەوەیە، برادەرانی « یەکێتیی » لە بازگە، چوار کەسیان لە ئێمە شەهیدکرد. تەرمەکانیان هێنایەوە. من قایل نەبووم، ئەو تەرمانە لە « ڕانێ »، بە خۆپیشاندان بە نێو بازاڕدا بگێڕن. چونکە گوتم:

1. ناشەرعییە.
2. لاساییکردنەوەی ڕۆژاوایە.
3. وەک بڵێی، لاڵانەوە و پاڕانەوەیەک پیشاندەدا، لەگەڵ سەروەریی ئیسلام و موسوڵمانان‌دا ناگونجێ.
4. بەدەم « فیتنە »وە چوونە. چونکە، ئەو کاتە « یەکێتیی و پارتیی » بۆ یەکدی، دەسیان لە سەر پەلەپیتکەی تفەنگ بوو.

گوتم: کارێکی خراپە. لەبەرئەوە، من بۆ خۆپیشاندانەکە نەچووم، پێشم هەڵەبوو.
بەلام گوتیان: تازە، مامۆستا مەلا « عوسمان »، لە سەر تێلێفیزیۆن رایگەیاندووە و « فتوا »ی داوە، نابێ، قسەی ئەو بشکێنرێ. زۆربەی برایان رایان نەبوو. بەلام، هەرچی چۆنێبێ، چوون. پێشم وابوو، هەر یەکێ لە برادەرانی « پارتیی »، یا دەستێکی دیکەی پیس بووە، تەقەی لە کۆمیتەی « یەکێتیی » کردبوو. ئەوانیش وایانزانیبوو، برادەرانی ئێمە تەقەیانکردووە. لەبەرئەوە، تەقەیانکردبۆوە. خەڵکەکەی ئێمەش، کۆمیتەیان گرت و ئەنجامەکەشی بەوە گەیشت.
من پێم وایە، « یەکێتیی » دەیتوانی، خۆی لەو شەرە لادا. چونکە، پاشان ئێمە، لە « بێتواتە »، لە مالی « ئەنوەر بەگ »، لەگەڵ « یەکێتیی » دانیشتین و بە ئەنجامیش گەیشتین. بەلام، وا پێدەچوو، برادەرانی « یەکێتیی »، تازە بڕیاری شەڕیان دابێ. بە دڵنیاییەوە دەڵێم: ئەوانیش زیانیان لێ کرد و ئێمەش زیانمان لێ بینی. واتە: وەک دەڵێن: چەپڵە بە دەستێ لێ نادرێ! بەلام، گەر هێندێ برادەری ئێمە، بە نەزانیی، یا پێشمەرگەیەکی ئێمە شتێ بکا، گەر بڕیاری شەڕ، لە لایەنی بەرانبەرەوە لە ئارادا نەبێ، دەکرێ، بە شێوەیەکی دیکە چارەسەرکرێ. یا گەر خەڵکێکیش لە ئەوان، بۆسەش بۆ ئێمە دانێن، گەر ئەوان بڕیاری شەڕیان نەدابێ، ویست و ئارەزووی شەڕیان نەبووبێ، هەرچی چۆنێبێ، هەر دەگونجێ، چارەسەرکرێ. بەلام، ئەو کاتە وا پێدەچوو، هەڵەکە لە هەر دوو لاوە بووبێ. واتە: بە شێوەیەکی زۆر دادپەروەرانە قسەدەکەم و دەڵێم: لە هەر دوو لامانەوە، ئارەزووی شەڕ هەبوو. جۆرێ لە پێ نەزانیی بوو، جۆرێ لە گوێ پێ نەدان و ئەوانە بوو.
ــ بەلام، کێ دەسپێکرد؟
وەڵڵا، « یەکێتیی » دەسپێکرد. چونکە، ئەوان بۆسەکەیان بۆ برادەرانی ئێمە دانا. بەلام، دوای ئەوەی، تەرمەکانیان هێنایەوە، بڕیاردرا، خۆپیشاندان لە « رانیێ » بکرێ، وەک گوتم: تەقە لە کۆمیتە کرا، کۆمیتەش تەقەیانکردەوە. خەڵکێکی زۆری ئێمە لە سەر جادەبوو. کاتێ، شەڕەکەش دامەزرا، برادەرانی ئێمە، پەلاماری کۆمیتەیان دا و چەن کەسێکیان لێ کوشتن.

پ42 : ئایا، ئایینی ئیسلام، چۆن لە مافی چارەنووسی گەلانی بندەس بە گشتیی و نەتەوەی کورد بە تایبەتیی دەڕوانێ و چی پێیە؟

و42 : ئیسلام، ئەوەی پێیە، هیچ گەلێ نابێ، هیچ جۆرە « ئیمتیازات »ێکی بە سەر گەلێکی دیکەوە هەبێ. دیارە، باری ئایدیالّ، باری خوازراو، لە ئیسلامدا ئەوەیە، هەموو موسوڵمانان، یەک دەوڵەتیان هەبێ، یەک ئالاّ، لە سەر ئەو دەوڵەتە بشەکێتەوە. یەک گەورەیان هەبێ. جا، ناوی « جێنشین » بێ، یا ناوی « فرماندەی بڕواداران » بێ، یا ناوی « سوڵتان » بێ، یا ناوی « سەرۆک کۆمار » بێ، هیچ لە باسەکە ناگۆڕێ، گرنگ ئەوەیە، یەک برا گەورەیان هەبێ،

ـ بڵێین: وەک ئیمپراتۆریای کۆنی « عوسمانیی » وابێ!

بەڵێ. هەڵبەتە ئەو کاتە، پێی ناگوترێ، « ئیمپراتۆر »، بەڵکوو « جێنشین » یا « سوڵتان »ی پێ دەگوترێ. چونکە، هێندێ نموونەی فرمانڕەوایی ئیسلامیی هەیە، بە ڕاستیی، پتر دابونەریتی ئەو گەلەی پەیداکردووە. ئەگینا، لە ئیسلامدا وا نییە. واتە: هێندێ شت هەیە، ڕەنگە، بەڕێزت بزانی، کاتێ دەگوترێ، دەسەلاّتی « عەلەویی، عەبباسیی یا عوسمانیی »، هێندێ شت بە مێشکی مرۆدا بێ و پێی وابێ، ئیسلام وای گوتووە. بەلاّم، لە ڕاستییدا، جگە لە جێنشین « عومەری کوڕی عەبدولعەزیز »، لە سەردەمی « ئەمەویی »یەکاندا، بە شێوەیەکی « شەرعیی » هەڵبژێراوە، هەموو « جێنشین و سوڵتان »ەکانی دیکەی « ئەمەویی، عەبباسیی یا عوسمانیی » دانراون. من پێم شک نایە، بە « شوورا » بووبێ و خەڵک هەڵیبژاردبن! دیارە، کەوا دەڵێم: مەبەستم ئەوە نییە، هەموویان هەر پیاوی خراپبووبن. چونکە، هی وایان هەبووە، زۆر ڕاژەی ئیسلامی کردووە. بەلاّم، گرنگ ئەوەیە، هیچیان بە شێوەیەکی « شەرعیی » و ڕەوا، دەسەلاّتیان وەر نەگرتووە.

سەبارەت بە ئەوەی، ئیسلام چی پێیە؟ ئیسلام دەڵێ: دەبێ، یەک دەوڵەت هەبێ، هەموو گەلەکان تێیدا یەکسانبن. واتە: گەر « عەرەب » بۆی هەبێ، لە نێویاندا « جێنشین » هەڵبژێرێ، « کورد »یش بۆی هەیە، « توورک »یش بۆی هەیە. یا، گەر « عەرەب » بۆی هەبێ، لە نێو خۆیاندا، وەک سیستێمێ، بە یەک « ویلایەت » یا چەن « ویلایەت »ێ، وولاّتی خۆیان ڕێکخەن، باری جوگرافیا و دێمۆگرافیا ڕەچاوکەن، ئەوا، « کورد، فارس،

توورک ... »یش بۆیان هەیە. چونکە، خوای پەروەردگار کاتێ فەرموویەتی: (و جعلناکم شعوبا و قبائل لتعارفوا.) ئەو « جەعله »، بۆ هەموو گەلەکانە. « عەرەب، کورد، توورک، فارس، بەلووژ و ئەفگان ... »، هەموویان هەر وەک یەک گەلن. خوای گەورە، هەموویانی« جەعلاندوون »، هەموویانی وەک یەک و وەک گەل درووستکردوون. گەلیش ئەوەیە: نیشتمانێکی تایبەتیی هەبێ، زمانێکی دیاریکراوی هەبێ، مێژوویەکی هاوبەشی هەبێ، کەلتوورێکیان هەبێ. واتە: دەبێ، وەک یەک مافیان هەبێ. بۆ نموونە: ئێستە، « عەرەب » بیستوودوو دەوڵەتیان هەیە، چۆن ئەوان بۆیان هەیە، ئەو هەموو دەوڵەتە دامەزرێنن، نەتەوەی « کورد »یش بۆی هەیە، گەر بۆی بگونجێ، هێندەی بۆی بکرێ، دەوڵەتی هەبێ، دەوڵەتی سەربەخۆی خۆی دامەزرێنێ. جا، ئەو دەوڵەتانە، یا « فیدراڵیی » بن، یا هەر چی جۆرێکی دیکە بن، لەو شێوانەی باون. بەو شێوەیە، مافی چارەنووسی گەلان، لە ئیسلامدا دیارییدەکرێ. مافەکە ئەوەیە، هەموو گەلێ، مافی خۆی، بە دەسی خۆی بێ، لە سەر وولاتی خۆی، بە ئازاڕیی بژی. واتە: لە « شەریعەت »ی ئیسلامییدا، کێشەیەک هەیە، کاک دوکتۆر!
ــ بەڵێ فەرموو.
درووست نییە، « زەکات »ی نێوچەیەک، بۆ نێوچەیەکی دیکە بچێ، تا هەژاری ئەو نێوچەیە، پێویستیان پێی هەبێ. لە کاتێکدا، لە هەموو بەشەکانی « کوردستان »، چەن خێر و بێر، چەن بیرە نەوت، چەن کانزای میتاڵیی هەن. ئاخر، خێر و بێری زۆر تێدایە، ئەوەی دەرهێنراوە و ئەوەی دەریش نەهێنراوە. کەچیی، تەماشادەکەین، کورد سواڵی پێ دەشێ!
بەپێی « شەریعەت »ی ئیسلام بێ، گەر یەک دەوڵەتی ئیسلامییش هەبێ، دەبێ، ئەو گەلە کوردەی، لەو نیشتمانەدا دەژی، تا خۆی، پێویستی بەو سەروەت و سامانە بێ، بۆ شوێنێکی دیکە نەچێ! گەر « زەکات »، خێر و بێر، دەسکەوتی لە خۆی زیادبوو، ئەو کاتە، ئینجا، بۆ نەدار و هەژارەکانی، شوێنەکانی دیکەی جیهان بچێ. « شەریعەت »ی ئیسلامیی، بەو شێوەیە، لە مافی گەلان دەڕوانێ. واتە: لە باری ئێستەدا، ئەوەی بۆ کورد دەگونجێ و چەندی بۆ دەکرێ، لە بەشە « کوردستان »ی سەر بە « عێراق »دا، « شەرع » ڕێیدەواە، داوای مافەکانی خۆی بکا، لە « ئێران »، چەندی بۆ دەگونجێ، چەن هەلی بۆ هەڵدەکەوێ، داوای ماف بکا.

ــ من، وا تێگەیشتم، گــــەر دەوڵەتێکی ئیسلامیی هەبێ، « جێنشین » یا « سوڵتان »ێکی هەبێ، هەموو گەلە موسوڵمانەکان، لە ژێر باڵی خۆیدا کۆکاتەوە، بە دادپەروەریی و یەکسانیی بژین، « کوردستان » وەک وولات، « میر » یا « والی »یەکی کوردی خۆی هەبێ، وەک سەردەمی زوو هەبووە، لەو کاتەدا، ئایینی ئیسلام، دژی دەوڵەتی ناسیۆنال دەوەستێ، دان بە مافی سەربەخۆیی تەواودا نانێ. ئایا، ئەمە ڕاستە؟ واتە: نایەوێ، گەلێکی موسوڵمان، لە دەوڵەتە ئیسلامییە فراوانە نێوەندییەکە جیابێتەوە و دەوڵەتێکی سەربەخۆ دامەزرێنێ!

لەو کاتەدا، بوونی دەوڵەتی سەربەخۆ، پاساوی نامێنێ.

ــ بەڵێ.

ئێستە، با بڵێین: « وولاتە یەککگرتووەکانی ئەمێریکا »، دەوڵەتێکی نێوەندییان هەیە، وەک خۆیان دەڵێن، دادگەریی، یەکسانیی، خێر و خۆشیی، بۆ هەموویان ڕەچاوکراوە. لەبەرئەوە، هیچ وولاتێ لەو وولاتانە، بە پێویستی نازانێ، داوای جیابوونەوە بکا!

ــ « ئەمێریکا »، بارێکی تایبەتیی هەیە و جیاوازە!

مەبەستم.

ــ چونکە، وولاتی کۆچبارانە، نەتەوەی تێدا نییە!

بەڵێ. مەبەستم ئەوەیە، لە سایەی دەوڵەتێکی ئیسلامییدا، بێ گومان، پێویستە، زۆرداریی لە هیچ گەلێ نەکرێ. کاتێ، زۆرداریی لێ کرا، دەبێ، بە هۆیەکی « شەرعیی »، ئەو ستەمە لابرێ، کە لا نەچوو، بێ گومان، وەک دەڵێ: ( للضرورات احکامها.)

ــ وایە.

گەلێ بزانێ، لە سایەی ئەو دەوڵەتە نێوەندیی و یەککگرتووەدا، تووشی زۆرلێکردن و ستەم دەبێ، ئەو کاتە، باری سرووشتیی، بڕیاری سرووشتیی بە سەردا دەچەسپێ. چونکە، باری نائاسیی خۆی هەیە. بۆ ئەوەی، ئەو زۆرلێکردنە لاچێ، گەر بە هۆکاری « شەرعیی » لاچوو، ئەوا باشە و هۆی ئاسایی بەکاردێنرێ. خۆ، گەر بە هۆکاری « شەرعیی »ش لا نەچوو، ئەوا، « شەرع » ڕێی بەو گەلە داوە، پەنا بۆ بەر ڕێ و هۆکاری نائاسایی بەرێ. چونکە، لە ئیسلامدا، زۆرداریی نابێ، ببێ. لە مێرووەک، لە مرۆیەکەوە بیگرە، تا بە گەلێ دەگا، نابێ، زۆرداریی هەبێ.

واتە: گەر هەر گەلیّ زانی، لە سایەی ئەو دەوڵەتەدا، هەر دووچاری چەوساندنەوە، زۆرداریی و ستەم دەبیّ، دەبیّ، ڕەتیکاتەوە. بۆ نموونە: کاتیّ خۆی، میرنشینەکان، لە سایەی دەوڵەتی « عوسمانیی »دا، هیچ شتیکی نارەوایان نەکردبوو، بەڵکوو ویستوویانە، دەسەڵاتی خۆیان، بە دەس خۆیانەوە بیّ، سەربەخۆبن، سیبەری خۆیان هەبیّ و سیبەریان لیّ بکا. بۆ؟ چونکە، دەوڵەتەکە تام و بۆیەکی « توورکیی » لیهاتووە. ئینجا، لە ئەوە گەڕیّ، « توورک » گەلانی دیکەی چەوساندۆتەوە، بە کەم تەماشای کردوون و بایەخی پیّ نەداون. لە بارێکی وادا، بۆ نموونە: وەک « محەمەد ئەمین زەکیی بەگ »، لە سەرەتای پەرتووکی « کورد و کوردستان »دا نووسیویتی: ( تا توورکە عوسمانییەکان، باسی ئەوەیان نەکردبوو، عەرەبەکان باسی ئەوەیان نەکردبوو، هەستمدەکرد، یەکێکم لەو گەلانەی، لە دەوڵەتی عوسمانییدا دەژین. بەڵام، کاتیّ ئەوان، باسی ئەوەیان کرد، منیش ئەو هەستەم جولا.) چونکە، کە زۆرداریی هەبوو، خەڵک، بیر لە ڕەوشی ژیانی خۆی دەکاتەوە. بەڵام، کاتیّ برایەتیی هەبوو، دەڵێن: ئێمە پێکەوە یەکماڵین!

ــ هێندەی سەرنجمداوە، لە هەموو سەرانسەری جیهانی ئیسلامدا، یەک پارتی ئیسلامیی نییە، دان بە مافی کورددا بنیّ. چونکە، ئەوە بە جیاوازییخوازیی دەزانن، « عێراق » بە وولاتێکی ئیسلامیی دادەنێن، گەر بەشێکی لیّ جیابێتەوە، ئەوان، وەک « ئیسرایل »ی دووەم لێی دەڕوانن! کاک دوکتۆر!

ــ بەڵێ. من مەبەستم پارتە « کوردستانییە ئیسلامیی »یەکان نییە.

بەڵیّ، دەزانم. بیّ گومان، جاریّ، من لە دەرەوە بووم، سەردانی وولاتانی « سعوودیە، پاکستان، یەمەن، سووریا، لوبنان » و هێندیّ وولاتانی دیکەی عەرەبیی و ئیسلامییم کرد و گەڕام. لەو بارەیەوە، زۆر وتووێژ و دەمەتەقێم، لەگەڵ ئەو برا ئیسلامییانەدا کرد. هەیانە، لە ڕەوشی ئێمە نازانن. هەیانە، ڕاگەیاندنی ڕژێمی « بەعس » چەواشەیکردوون. هەشیانە، ناوی خراپی خۆمان، کاریتێکردوون. بە تایبەتیی، کاتی خۆی، تەوژمی « ئیسلامیی » لە نێو کورددا، وەک پێویست دیار نەبووە. وایان زانیوە، گەلی کورد، هەمووی لە « مارکسیی، کۆمۆنیست و چەپ »دا خۆی دەبینێتەوە. بەڵام، گریمان هیچ کام لەو هۆکارانەش نەبیّ، هەر کەسیّ،

نەک هەر بەرانبەر بە گەلێ، هەڵوێستی وابێ، کە مافی نییە، لە خاک و ولاتی خۆیدا ئازادبێ، هەر کەسێ وا بیربکاتەوە، گەر تاکەکەسێ بۆی نەبێ، لە ماڵی خۆیدا سەربەستبێ، هەڵبەتە، وەک دەڵێ: ماڵی قەڵب، سەر و کوێلاکی خاوەنەکەی دەگرێتەوە! ئەوە ڕای تایبەتیی خۆیەتی.

من زۆر جار، بەو برا عەرەبانەم گوتووە: ئەوەی ئێوە، بە کوڵ و بە دڵ، داکۆکیی لێ دەکەن، ئەو سنوورە دەسکردانەی لاتان پیرۆزە، ئەوە، ئێوە داکۆکیی لە ڕێککەوتننامەی « سایکس ـ پیکۆ » دەکەن.

ــ جا، هەر واشە!

بەڵێ. هەر ئەو پەیمانە شوومەی « سایکس ـ پیکۆ » بوو، جیهانی ئیسلامییشی پارچەپارچەکرد. نیشتمانی ئێمەشی لەتوپەتکرد. وەک گۆشتی خێر بەشرایەوە. گوتوومە: ئێوە داکۆکیی لە نەخشەی « ئینگلیز » و « فرەنسە » دەکەن. ئینجا، ئەو وولاتانەی ئێستە، فرمانڕەواییان تێدا دەکرێ، وەنەبێ، « شەریعەت »ی ئیسلامیی، فرمانڕەوایی تێدا بکا. هەر بۆ نموونە: پارتی « بەعس »، وەنەبێ، دەوڵەتێکی ئیسلامیی دامەزراندبێ!

ــ بەڵێ.

« پارتی بەعسی عەرەبی سۆسیالیست »، واتە: سیستێمێکی زۆر نەزان و « تاغووطیی » سەپاندووە. جگە لە سەرکووتکردن و زۆرداریییەکەشی، هەر لە ڕووی تیۆرییشەوە، فرمانڕەواییەکی ئیسلامیی نییە. ئینجا، هەر بنچینەی نەخشەکێشان و وولات دابەشکردنەکە، لە ڕاستییدا، هیچ پێوەندییەکی بە سەر ئیسلامەوە نەبووە و نییە.

ــ نەخێر. هەر چەندە، یەکەمین دابەشکردنی « کوردستان »، لە نێوان هەر دوو ئیمپراتۆریای « عوسمانیی » و « سەفەویی »دا بوو. ئەو دوو دەوڵەتە، دوو دەوڵەتی ئیسلامیی بوون. یەکەمیان لەبەر ڕۆشنایی ئایینزای « سوونیی » و دووەمیشیان لە بەر ڕۆشنایی ئایینزای « شیعە »دا دامەزرابوون. دوای جەنگی « چالدێران » و ڕێککەوتننامەی « زەهاو »یش، ساڵی « 1639 »، بۆ یەکەمین جار لە مێژوودا، « کوردستان » دابەشکرا و بەپێی ئەو ڕێککەوتننامەیە، « کوردستان »یان لە نێوان خۆیاندا دوولەتکرد. بەڵام، دووەمین دابەشکردنی « کوردستان »، پێوەندیی بە دەوڵەتە ئیسلامییەکانەوە نییە. ئەوەش، دوای یەکەمین جەنگی جیهان ڕوویدا و بەپێی ڕێککەوتننامەی « سایکس ـ پیکۆ » بوو.

یەکەمین جار، « کوردستان »، دوای جەنگی « چاڵدێران ـ 1514ز. » دابەشکرا. ئەو دابەشکردنە، وەک بڵێین، دابەشکردنی باری سەپاوبوو. ئەوەش، لە بەر ڕۆشنایی ئەوەدابوو، دەوڵەتی « سەفەویی »، لە سەر ئایینزای « شیعەگەریی » و ئەوی دیکەشیان، لە سەر بنچینەی ئایینزای « سوونە » دامەزرابوون. جا وەنەبێ، نە دەوڵەتی « عوسمانیی » ئەو کاتە، نە دەوڵەتی « سەفەویی »، ئەو ڕەوایەتییەیان هەبووبێ. هەر چەندە، دەوڵەتی « عوسمانیی »، لە ڕاستە شەقامی ئیسلام لای نەدابوو، خەڵکانێ بوون، لە سەر ڕێبازی « سوونە و جەماعەت » بوون. بەڵام، دەوڵەتی « سەفەویی »، بە ڕاستیی، وەک کوێرەڕێیەک پیشاندەی، وا دێتە پێش چاو، وەک لاڕێیەک، وەک کۆمەڵێ کە جیادەبنەوە. بەڵام، هیچ کامێکیان، پرسیان بە زانایانی ئیسلام نەکردووە و نەیانگوتووە: ئەرێ براینە! ئەو وڵاتە دابەشکەین، یا دابەشی نەکەین. بەڵام، ڕێککەوتننامەی « سایکس ـ پیکۆ »، وەک شێوەیەکی فەرمیی وابوو. چونکە تا ئەو کاتە، خەڵک هەر تێکەڵاوبوون، تیرە و هۆزەکانی « توورکیا، ئێران، عێراق و سووریا »، پێوەندیی و ژن و ژنخوازییان لە نێواندا هەر هەبووە.

ــــ بەڵێ. ئەو پێوەندیی و تێکەڵاویی ژن و ژنخوازییە، هەر لە کۆنەوە هەبووە و ئێستەش هەر هەیە.

پ43 : ساڵی « 1988 »، کارەساتی کیمیابارانی شارۆچکەی « هەڵەبجە » ڕوویدا. ئایا، ئەو کاتە، چ پارتێکی ئیسلامیی، لە گۆڕەپانەکەدا بوو، جا، تەنیا وەک هێزێ بووبێ، هێشتا، خۆی ڕێک نەخستبێ، یا، وەک ئەوەی ڕێکخستنیشی هەبووبێ؟!!

و43 : ئەو کاتە، تەنیا « بزووتنەوەی ئیسلامیی » هەبوو.

ــ ڕۆڵیان لە کارەساتەکەدا چی بوو؟

« برایانی موسوڵمان »یش هەبوون. بەڵام، هێشتا خۆیان ڕا نەگەیاندبوو. بە هەر دوو باڵەکەیانەوە، هێڵی یەک و دوو، ڕێکخستنێکی نهێنییان هەبوو. بەڵام، ئەوی وردەوردە، لە گۆڕەپانەکدا دەنگی هەبوو، تەنیا هەر، « بزووتنەوەی ئیسلامیی » بوو.

ــ لە « هەڵەبجە » ڕۆڵیان چی بوو؟

وەڵڵا، خۆت دەیزانی، ڕۆڵیان چی بووبێ! کیمیاباران ڕێی لێ ناگیرێ.

ــ مەبەستم ئــەوەیە، پێش ئەوەی کیمیاباران بکرێ، ئایا، لە ڕزگارکردنی « هەڵەبجە »دا ڕۆڵیـان چی بوو؟ دەڵێن: ئەوانیش، وەک هێزەکانــی دیکەی « پارتیی، یەکێتیی و سۆسیالیست »، بەشدارییانکردووە، ئایا وایە؟

وەڵڵا، « بزووتنەوەی ئیسـلامیـی »شی تێدا بەشداربوو. بە ڕاسـتیی، بە وردیی نازانم. بەڵام، ئەویش بەشداربووە. واتە: لە ڕزگاربوون، پاشان، بە دەنگەوەچوونی خەڵکەکە و تەرم شاردنەوەشدا، بەشدارییکردووە. دیارە، خۆتان ئاگادارن، کۆماری ئیسـلامیی « ئێران »یش، ڕۆڵێکی کاریگەریان هەبووە. بە تایبەتیی، لە ڕووی ڕاگەیاندنەوە، کارەساتەکەیان بە گەلانی جیهان ناساند.

پ**44** : لە « 1994 .05 .01 »دا، فتیلەی جەنگی نێوخۆ، لە نێوان « پارتیی و یەکێتیی »دا هەڵگیرسا. ئێـوە، وەک هێزێکی چەکدار، وەک پارتێکی ئیسلامیی ڕامیاریی، ئەو کاتە لە کوێ بوون؟ ڕۆڵتان چی بوو؟

و**44** : ئێمە، ئەو کاتە، لەگەڵ « یەکێتیی »دا، لە جەنگدا بووین. یا، خۆمان بۆ جەنگ ئامادەدەکرد، لە بەرانبەر یەکدیدا وەستابووین.

ــ ساڵی « 1994 »؟

ئەو کاتە، ئێمـە، لە بەرەی « پشدەر » بووین. ئا، ئەوا بیرمکەوتەوە. کاک دوکتۆر! من لە « سـالارە »، لە کوێستـانی « کێلێ » بووم. بە زاراوەی خۆمان، ئەو کاتە، « هێرۆ »مان ئازادکردبوو. « هەڵشۆ »شمان هەر ئازاد کردبوو. چەن گوندێکمان، لە دەس « یەکێتیی » دەرهێنابوو. واتە: بەرەی « پشدەر »مان، لەوێ کردبۆوە. لێرە، بەرەی « شارەزوور »مان هەبوو. من لە « سالارە » بووم. « عەلی حەسۆ میرخان »، لە « قەڵادزێ » بوو، وەڵامی بۆ ناردم و گوتبووی: ئێمە لێرەوە، لەگەڵ « یەکێتیی »دا خەریکین، تووشی شەڕ دەبین. تەگبیرێکمان بۆ بکەن.

ئێمەش گوتمان: تەگبیری چیتان بۆ بکەین؟ ئێمە، وا لێرە دانیشتووین. لە ئەوێوە دووربووین. ئیدی، ئێمـــە فـریای ئەوە نەکـــەوتین، وەڵامـی بۆ بنێرینەوە، دوای ئەوە، یەکسەر جەنگەکە دامەزرا. « عەلی حەسۆ » و کۆمەڵەکەی کوژران. خەڵکێکیش لە « یەکێتیی » کوژران. ئیدی، شەڕەکە لە ئەوەوە دامەزرا و گەرمبوو. ئێمەش، ئەو کاتە، لەگەڵ « یەکێتیی »دا، لە جەنگدا بووین.

ـــ له جەنگدا بوون. واته: وەک من تێگەیشتم، لەگەڵ « پارتیی »دا بوون و دژی « یەکێتیی »، سووکە یارمەتییەکی یەکدیتان داوە. وایە؟
هەڵبەتە، له یەکەمین جەنگی نێوخۆدا، بەپێی هێندێ هەواڵ و زانیاریی، له هێندێ شـوێندا، برادەرانی « پارتیی »، دژی خـەڵکی ئێـمـە، لەگـەڵ برادەرانی « یەکـێـتـیی »دا، هاوکـارییـیـانکردبوو. بەڵام، بێ گـومـان، برادەرانی « پارتیی »ش، بۆ ڕزگارکردن و دەربازکردنی، هێندێ خەڵکی ئێمە، هاوکارییانکردبوو. وەک چۆن، دوایی ئەوانیش لێیانقەوما، ئێمەش، زۆر هاوکارییمانکردن. هەروەها، وەک « یەکێتیی »، چۆن لێیانقەوما، له ڕێی بەندە و برایانمانەوە، هاوکارییمانکردن. چونکە، به ڕاستیی، ئێمە پێمـان خـۆش نەبوو، کـابرا، لێی دەقـەومێ، پەنـات بۆ دێنێ، دەرفـەتی لێ ببینی، هەمیشە، ئەوەمان به پێچەوانەی جوامێرییمانەوە زانیوە.
دوای ئەوەی، « پارتیی »ش شـەڕی دەسـپێکرد، به ڕاسـتیی، ئەو کـاتە، ئێمـە پێمـان خـۆشبـوو، « پارتیی » لەگـەڵ « یەکـێـتیی »، له جـەنگەکەوە تێوەگـلا! بۆ؟ چونکە، دیارە، ئێـمـە به تەنیا، دەرەقـەتی « یەکێتـیی »مـان نەدەدا. واتـه: پێـمـان خـۆشـبـوو، « پارتیی » شـەڕیکا و وەک بڵـێی، پارسەنگێکمان بۆ ڕاگرێ!
بەڵام، له بەرەی « پشدەر و شارەزوور »، ئێمـە یارمـەتیی « پارتیی »مـان داوە. برادەرانی « پارتیی » لاوازبوون. دیارە، له شوێنی دیکە، « پارتیی » دەسـەڵاتیـان هەبووە. ئەگینا، لەو شـوێنانەی ئێمـە، هـاوکارییمـانکردوون، ئەوان وەک بڵێی، میوانی ئێمە بوون.

پ45 : دیارە، ئەوڕۆ « پارتیی و یەکـێـتـیی »، پـەرلەمـانێکی هـاوبەشـیـان هەیە. دە سـاڵ لەمـەوبـەر، واتە: سـاڵی « 1992 » دامــەزراوە. هـەر دوای ئەوەش، سیسـتـێمی « فـیدراڵیی »یان، بۆ گەلی « باشووری کوردستـان » ڕاگەیاند. ئێوە، ڕاتان بەرانبەر بەو « فیدارڵیی »یە چییە؟
و45 : ئێمە، سەبارەت بەو ئاشتبوونەوە و دانیشتنە،
ــ بەرانبەر به مافەکە وەک « فیدراڵیی »، نەک دانیشتنەکە!
وەڵڵا، ئێمە پێمان وایە، له هـەلومەرجی ئێسـتـەی « کوردستانی عێراق »دا، ئەوە لانی کەمی، مافی ڕەوای ئەو گەلەی ئێمەیە، که لەو هـەرێمەی خۆیدا، فرمانڕەوایی خۆی، به دەسـی خۆی بێ.

دیارە، گەر برادەرانی « پارتیی و یەکێتیی »، باوەڕیان وابێ، باسی سەربەخۆیی بکەین، بۆمان سەر ناگرێ، هەر هیچ نەبێ، دەبێ، کاتێ باسی « کوردستان »مان کرد، باسی میریی نێوەندییشی لەگەڵ بکەین. بۆ ئەوەی، پێمان نەڵێن، ئەوانە جیاوازیخوازییدەکەن و چی و چی دیکە! هەرچی چۆنێبێ، من پێم وایە، ئەوە لایەنێکی کەمی ئەو مافەیە، کە دەمانکەوێ.

پ46 : کاتی هەڵبژاردن، « بزووتنەوەی ئیسلامیی »، بەشداریی لە هەڵبژاردنەکەدا کرد. لە دوای دەنگەکانی « پارتیی و یەکێتیی »، دەنگێکی زۆری هێنا. وا بزانم، لەگەڵ « یەککگرتوو »دا بوون. ئێوە دەتانتوانی، لە پەرلەماندا بەشداربن؟

و46 : مەرجێکیان دانابوو، هەر لایەنێ لە « 7٪ » کەمتر بێنێ، ناتوانێ، بەشداربێ. ئێمە لە « 5٪ »مان هێنا.

ــ نەتاندەتوانی، لە دەسەڵاتی میرییدا بەشدارییبکەن؟

بەشدارییمانکرد.

ــ بە چی؟

بە دوو شالیار.

ــ بەڵام، لە پەرلەماندا نەبوون.

خۆیان نەیانهێشت، لە پەرلەماندا بین. لە میرییەکەشدا، کاتێ ماوەیان داین، لە کابینەی میرییەکەی ئەو کاتە پێکەوە بوون، بە دوو شالیار بەشداربووین.

ــ واتە: یەکەمین کابینەی میریی.

بەڵێ. دواییش، لە دەسەڵاتەکەی « یەکێتیی »یشدا، هەر بە دوو شالیار بەشداربووین.

ــ باشە، ئەو کاتەی ئێوە، دوو شالیارتان هەبوو، دواتر، جەنگی نێوخۆ درووستبوو، دەسەڵاتەکەش، بە سەر دوو بەڕێوەبەرێتییەکەی « هەولێر » و « سولەیمانیی »دا دابەشبوو. ئایا، لە هەر دوو لا شالیارتان هەبوو؟

ئێمە، لەگەڵ « پارتیی »، لە یەکەمین قۆناغدا، ئەو کاتەی پێکەوە بووین، بە ئەنجام نەگەیشتین. چونکە، لە سەر ئەندازەی چۆنێتی بەشدارییکردنمان، ڕێک نەکەوتین. دوایی، کاتێ « پارتیی » توانی، « یەکێتیی » لە « هەولێر »

دەرکـا، تانکی هێنا و ئەوانە، خـۆتان دەیزانن، « 08/31 » چـی ڕوویـدا؟ بوون بە دوو بەڕێوەبەرایەتیی. ئەو کاتە، ئێمـە وەک تەوژمێ بووین. لە زۆر ڕەوشی ئەوسـای « بزووتنـەوە » ناڕازییـبووین. « مـام جـەلال »، داوای لە ئێمـە کرد و گوتی: فلان کەس، گەر ئێوە بەشدارییبکەن، پێنج شـالیارتان دەدەینێ.

ـــ ئەمە لە میریی « سولەیمانیی »دا بوو؟

بەڵێ. مـیریی « سـولەیمانیی »، هێشتا دا نەمـەزرابوو. گوتم: وەڵڵا « مـام جـەلال »، ئێمـە پێمـان باش نییە، بە ڕاستیی، لەو لەتە بەڕێوەبەرێتییەدا بەشداربین. ئێمە، پێمان خۆشبوو، بە یەکەوە بن. کاتێ، پێکیشەوەبوون، ئەوەبوو، بە ئەنجام نەگەیشتین. ئێستەش، پێمان باش نییە، ئێمە بەشدار بین. ئەو کاتە، من سەرپەرشتیی ئەو تەوژمەم دەکرد.

ـــ بەڵێ.

ئەوەبوو، ئەو جەنگە ملی گرتین. بڵێین: ئەو بارەی « پارتیی و یەکێتیی »، بەو شێوەیە بوو. « یەکێتیی » دەرکرا، دوایی گەڕایەوە.

پێش ئـەوەی، « یەکـێـتـیی » بگەڕێتـەوە، مـامـۆسـتـا مـەلا « عـەلی »، بە هەڵەداوان چوو بۆ « هەولێر ». ئەو کاتە، ئێمـە، بەندە و ئەوانەی، ڕامان لە سـەری نـەبوو. بێ گـومـان، ئێـمـە ناڕازییـبووین، بەشـدارییـبکەین. بە تایبـەتیی، « پارتیی » تازە تانکی ڕژێمی هێنابوو، بە پاڵپـشـتـی ئەوان توانـی، « یەکـێـتـیی » دەرکـا. پەرلەمـان دوولەتبـووبوو، مـیـریی هـەرێم دووکـەرتبـووبوو، گـوتمان: شـتـێکی خـراپە و ئێـمـە بەشـداریی ناکـەین. چونکە، ئەوە دەگەیەنێ، دان بەو بارەدا بنێین، ڕەواییپێبدەین. لەبەرئەوە، ئێمـە ناڕازییبووین و بلاڤۆکێکیشمان دەرکرد. بەڵام، ئەوەبوو، بەشداریی کـرا. لەبەرئەوە، کـاتێ پێکەوەبووین و لـە پارتێکدا بووین، بە دوو شـالیـار بەشدارییمـانکرد. کاک « مـوحەممەد بازیانیی »، شالیاری کشتوکاڵ بوو، کاک مەلا « عەبدولغەنیی »یش، بڵێین. شالیاری بێ شالیارگە بوو.

ـــ شالیاری هەرێم.

دوای ئەوە، لەگەڵ « یەکێتیی » شـەڕمان بوو. ئەو کاتە، ساڵی « 1997 » بوو. بە دڵنیایییەوە دەڵێم: دەسـپێشـخـەریی لە برادەرانی « یەکێتیی »یەوە بوو. کاتێ، جـەنگەکە درووسـتبـوو، « ئێران » نێوبژییکردین و جـەنگەکە ڕاگیرا.

بێ گومان، مامۆستا مەلا « عەلی »، سەرکردایەتیی ئەو کاتە بوو. ئەو کاتەش، من هەر ڕام نەبوو، بەشداریبکەین. بەڵام، لە « تاران » ناوبژییان کردبوو، من لەوێ نەبووم. ڕێککەوتبوون، ئیمزایانکردبوو، بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکیی، بە دوو شالیار بە شداریی لە کابینەی

— « سولەیمانیی »

« یەکێتیی »دا بکەن. ئەو جارەش، ئێمە هەر قایل نەبووین و گوتمان: باشە، شەڕ ناکەین و ڕێکدەکەوینەوە. بەڵام، بۆ بەشداربین؟ چاکتر وایە، بەشدار نەبین. بە تایبەتیی، دوای شەڕ، یەکسەر بچی، لە میرییدا بەشدار بی، شتێکی سەیر دەکا! بەڵام، گرنگ ئەوەبوو، ئەو کاتە، هەموومان هەر « بزووتنەوە » بووین.

ئەوەی « پارتیی »ش، هەر لە سەرمان کەوت. چونکە، ڕامان نەبوو، ئەوەی « یەکێتیی »ش، هەر لە سەرمان کەوتبوو. بۆیە، لە هەر دووکیان بەشدار بووین. بەڵام، ئەوەبوو، یەکەمین بەشداریی، پێش « 1996 »، لەگەڵیان ڕێک نەکەوتین. ئێستەش هەر لە یادمە، کاک « مەسعوود » و ئەوان گوتیان: دەبێ، یەک شالیارتان هەبێ. ئێمە گوتمان: سێ شالیارمان دەوێ. لە سێ کەمترمان ناوێ. دوایی، بە دوو شالیاریش قایلبووین. بەڵام، ڕێک نەکەوتین، دواییش، لەو هەلومەرجەی دوای « 08/31 »دا، مامۆستا مەلا « عەلی » و ئەوان چوون، بەشدارییانکرد.

— ئێستە، ئەوان شالیاریان ماوە.

لای « پارتیی » نەخێر.

— ئەدی لای « یەکێتیی »؟

ئێمە، دوو شالیاری سەر بە « بزووتنەوە »مان هەبوو. شالیاری « داد » مامۆستا « عەبدولڕەحمان نەوڕەسیی ». شالیاری « ئەوقاف » کاک مەلا « موحەممەدی مەلا عومەر »، برازای مامۆستا مەلا « عوسمان » بوو.

ئێستە، کاک « عەبدولڕەحمان نەوڕەسیی » دەسیکێشاوەتەوە، کاتی تەواو بووە. کاک مەلا « موحەممەدی مەلا عومەر »یش، وەک ئێمە ئاگادارین، هەر لە شوێنی خۆی ماوە.

جگە لەوانەش، جێگرێکی شالیار هەیە، کاک « جەمال ئەشرف »، ئەندامی « شووڕای کۆمەڵی ئیسلامیی »ە و جێگری شالیارگەی « نێوخۆ »یە. بەڵام، ئێمە لەگەڵ « یەکێتیی »، بە ئەنجام نەگەیشتین، تا، لە سەر ئاستی

شالیار بەشدارییبکەین. ئێمە گوتمان: دوو شالیارگەمان بدەنێ. یا، بە لانی کەمەوە، شالیارگەیەکمان بدەنێ، خۆمان هەمووی بەڕێوەدەبەین، بە شالیار، جێگری شالیار، بەڕێوەبەری گشتیی و هەموو ئەوانی دیکەوە، هەر لە خۆمان بن. بۆ ئەوەی ئێمە، پەرێزمان دیاربێ، بزانین، ئاخۆ ئێمەش، چۆن خۆمان تاقیدەکەینەوە؟
هەڵبەتە، برادەرانی « یەکێتیی » قایل نەبوون. گوتیان: ئەوە میریی لە نێو مێرییدا دەگرێتەوە. ئەوەمان بۆ ناکرێ.
ئێمەش، لەبەرئەوەی، ئەزموونی تاڵمان هەیە، گەر شالیارێ، هیچی بە دەس نەبێ، بۆ بەشداربین؟ چونکە، کاتی خۆی، لای « پارتیی »، بە دوو شالیار بەشدارییکرا، شالیارەکانمان، سەرئەنجامیان باش نەبوو. لەوانەیە، وەک خۆیان، کەمێ قازانجیانکردبێ. بەڵام، هیچ قازانجێکیان، بە « بزووتنەوە » نەگەیاند و بۆ پارتەکەشمان باش نەبوو.
هەروەها، دوایی، لای « یەکێتیی »ش بەشدارییکرا، بە هەمان شێوەی پێشووبوو، پارت، هیچ کەڵکێکی ئەوتۆی لێ نەبینی. شالیارەکانمان، کاریان باش نەدەڕۆی. پەرچیان لە بەردەمدا قوتکرابۆوە. ئاستەنگیان بۆ دروستکرابوو. گوتمان: گەر شالیارگەکە، بە تەواویی، لە دەسی خۆماندا نەبێ، بە چاکی نازانین، بەشداریی تێدا بکەین. ئێستەش، لەو ڕێککەوتننامەیەی، لەگەڵ « یەکێتیی »دا هەمانە، خاڵێکی تێدا نووسراوە، دەڵێ: « کۆمەڵی ئیسلامیی » بۆی هەیە، بەپێی ڕێککەوتننامەی « تاران »، لە میرییدا بەشداربێ، هەر کاتێ ویستی، بەو ڕێژەیەی دەیکەوێ.

پ**47** : دوای ئەوەی، چوار ساڵ، هەر دوو لای شەڕکەر، لە پەرلەمان دابڕان، فراکسیۆنی « زەرد و سەوز »، بەپێی ڕێککەوتننامەی « واشنتن » ڕێککەوتن، پێکەوە کاربکەن. ئەوەبوو، ڕۆژی « 04 .10 .2002 »، جارێکی دیکە، پەرلەمانی « کوردستان » یەکیگرتەوە، ئەو دوو فراکسیۆنە، پێکەوە دانیشتنەوە. ئێوە، ڕاتان بەرانبەر ئەو دانیشتنە چییە؟
و**47** : بە ڕاستیی، ئێمە، ئەوە بە شتێکی باش و پێویست دەزانین. دەبوو، ئەو کارە، زووتر بکرایە. پێمان وایە، کات زۆر تێپەڕی، هەلی زۆر لە بەر دەسدابوو، بە دڵنیاییەوە دەڵێم: دەگونجا، ئەو هەنگاوانەی ئێستە دەنرێ، پێشتر بنرانایە. ئەوە سەبارەت بە دانیشتنەکە.

سەبارەت بەوەی ئێمە پێمان چۆنە؟ ئێمە پێمان وایە، ئەو تەبایی و پێکەوە کۆبوونەوەیەی ئەندامانی پەرلەمان، ئەو پێکەوە دانیشتنەی « مام جەلال » و کاک « مەسعوود » و دەس خستنە نێو دەسی یەکدییە، گەر لە باوەڕ و ویستی خۆیانەوە هەڵقووڵابێ، بە ڕاستیی، شتێکی زۆر باشە. بەڵام، گەر لە دەرەوە پێیان ڕاگەیەنرابێ، یا، گوشاریان لە سەر دانرابێ، یا، وەک مەرجێ بە سەریاندا سەپێنرابێ، کە دەبێ، وا بکەن، بە ڕاستیی، پێمان باش نییە. چونکە، پێمان وایە، هەر کاتێ، ئەو داواکاریی و گوشارە لاچوو، شتەکە، بۆ دۆخی جارانی خۆی دەگەڕێتەوە. هیواداریشین، ئەو پەرلەمان و ئاشتییە، ئەو دەسخستنە نێو دەسی یەکدییە، لە سەر حسێبی هیچ کەس و هیچ لایەنێکی دیکە نەبێ. تەنیا هەر، بۆ ڕاژەکردنی گەل بێ. نەک، بۆ بەدیهێنانی ئامانجێکی تەسکی پارتایەتیی بێ، خەڵکی دیکەش، لە پەراوێزدا دانێن، درێژخایەنبێ، تەنیا شتێکی ڕاگەیاندن نەبێ، بەڵکوو، هەوڵبدرێ، شتێبێ، لە باوەڕەوە هەڵقووڵابێ، کارێکی ڕامیاریی بێ، بەکاربێنرێ و کەڵکی لێ وەرگیرێ. بۆ ئەوەی، گرفتەکانی گەلەکەمان، چارەسەرکرێ، گرفتی « ڕامیاریی، ئابووریی، کۆمەڵایەتیی و بیر »، ئەو گرفتانەی هەیە، نەک تەنیا هەر، شتێکی وابێ، کێشەی پەرلەمان، شتێکی ڕووکەشیی و ڕواڵەتیی بێ، لە پشت پەرلەمانەوە، شتەکان سازکرێن و دوایی، بۆ ڕەواییپێدانێکی ڕووکەشیی، بۆ چەواشەکردنی خەڵک، لە نێو پەرلەماندا، دەنگدانێکی ڕواڵەتیی لە سەر بکەن.

پ48 : گەر لە ماوەی ئەم شەش مانگەدا، وەک دەڵێن: هەڵبژاردنی نوێ، بۆ پەرلەمان کرا، ئێوە وەک « کۆمەڵ » بەشداریی تێدا دەکەن؟

و48 : ئێمە، ئێستە ناتوانین، ئەو بڕیارەبدەین. چونکە، ئەو کاتە، ئێمە تەماشادەکەین، چی بە بەرژەوەندیی گەلەکەمان بزانین و لە چوارچێوەی « شەرع »دا جێیبێتەوە، وا دەکەین. بەڵام، ئێستە، جارێ بۆ ئەو بڕیارە، زووە، تا بزانین، ئاخۆ، ڕەوتی ڕووداوەکان چۆن دەبن، ئاخۆ، پەرلەمان تا کەی بەردەوامدەبێ؟ ئەم ئاشتیی و سەردانی یەکدیی کردنە، تا کوێ بڕ دەکا؟ چۆن دەبێ؟ چ بەرهەمێکی دەبێ؟ ئایا، بۆ ڕاژەکردنی گەلەکەمان دەبێ؟ چونکە، جارجار، هێندێ شت دەبیستین! بە ڕاستیی، ئێمە لە سەر هێندێ شت، تێبینیمان هەیە، لە زۆر شتیشدا، قسەی خۆمان قووت

دەدەینەوە، دان بە خۆماندا دەگرین، بەپێی لێکدانەوەی خۆمان بێ، لە پێناوی بەرژەوەندیی گشتییدا دەیکەین و دەڵێین: ڕەوشی گەلەکەمان ناسکە. ئەگینا، زۆر جار، بایەخمان پێ نادرێ، مافمان پێشێلدەکرێ. بە ڕاستیی، ئەوانە بە شتێکی خراپ دەزانین. بەڵام، دانمان بە خۆماندا گرتووە و بە گەشبینیشەوە، تەماشای ئەو بارە دەکەین. لە ڕاستییدا، من بەتەماشم، شتێ لەو بارەیەوە بڵاوکەمەوە.

وەک گوتم: ئەو دانیشتنانەی ئەندامانی پەرلەمان، شتێکی باشە. من بە هەنگاو و هەڵوێستێکی باشی دەزانم. بەڵام، لەبەرئەوەی، هێندەمان ئەزموونی تاڵ، لە هەموو ئەو برادەرانەی «پارتیی و یەکێتیی» دیوە، ئەو دوو لایەنە، هێندە پێکەوە دانیشتوون، پێکەوە تەوقەیانکردووە و ڕێککەوتننامەیان ئیمزاکردووە، هیچی لێ سەوز نەبووە، بۆیە، کەمێ بە نیگەرانییەوە، تەماشادەکەین. ئەگینا، هیواداریین، وەک گوتم: درێژخایەنبێ، قووڵبێ، پایەداربێ، لە ڕازەکردنی خەڵکدا بێ، نەک بۆ پشگوێخستن و لە ڕووداوانی خەڵکی دیکە بێ، هێندێ کۆنە حسابات پاکتاوکرێ. چونکە، جارجار، هێندێ شت دەبیستین!

ـ باشە، گەر هاتوو، هەڵبژاردنکرا، ئێوەش بەشدارییتانکرد. بەڵام، دەر نەچوون. یا، هەر لە بنەڕەتدا، بەشدارییتان نەکرد. ئەو دوو لایەنە پێکهاتنەوە، لە سەر ئەوە ڕێککەوتن، یەک پەرلەمانی یەکگرتوو پێکبێنن، یەک میریی یەکگرتووش دامەزرێنن، ئێوە، تا چەن، بە بڕیارەکانی ئەو پەرلەمان و میرییە «شەرعیی»یەوە پابەنددەبن؟

خۆی ئەو شتانە، هەموویان وەک گریمان وان. لەو کاتانەدا، گەر وابێ، بە ڕاستیی، هەڵبژاردنێکی دادگەرانە و ئازادانە بکرێ، پێمان وابێ، ڕاڤە لە ویست و ئارەزووی گەل دەکا، پێمان وابێ، زۆر بە چاکیی، جێی ئێمەشی تێدا دەبێتەوە، ڕەنگە، ئێمەش بەشداربین.

ـ دەڵێم: گەر بەشداربوون و دەر نەچوون، چی دەکەن؟

گەر وابوو، ڕامان لەو هەڵبژاردنە بوو، پێمان وابوو، هەڵبژاردنێکی ڕاست و چاکە، نەک وەک ئەوەی کاتی خۆی کرا. دواییش، هەر کام لە برادەرانی «پارتیی و یەکێتیی» بڵاڤۆکیان دەرکرد و گوتیان: فرتوفێڵ و گزیی تێدا بووە، ئێمەش، لە هەر دووکیان پتر پێمان وابوو، فرتوفێڵی زۆری تێدا بوو. گەر وابوو، بە کردەوە زانیمان، ئەنجامی ئەو هەڵبژاردنە، لە باوەڕی

ئەو گەلەوە هەڵقوولاوە، بە دڵنیایی، ئێمە، ڕێزمان بۆ ئەو باوەڕکردنە هەیە، کە لە ئەنجامی، ویستی گەلەکەی خۆمانەوە هەڵقوولابێ. با، لە ڕووی « شەرعیی »شەوە، تێبینییمان لە سەری هەبێ. بەلام، کاتێ کۆمەلانی خەڵک بڵێن: ئێمە، ئەوەمان دەوێ و فلان شتمان ناوێ، ئێمە، ڕێزمان بۆ هەوڵی ئەو خەڵک و گەلە، بۆ باوەڕی ئەو گەلە، بۆ ویست و ئارەزووی ئەو جەماوەرە هەیە. جا، گەر تێبینیی « شەرعیی »شمان، لە سەری هەبێ، بە دڵنیاییەوە دەبێ، بە هۆ و ئامرازی « شەرعیی »، باوەڕ و ویستی ئەو خەڵکە بگۆڕی، بۆ ئەو لایەنەی، تۆ بە ڕاست و ڕەوای دەزانی.

پ49 : هەڵوێست بەرانبەر «31 08 .1996» چییە؟ ئەو کارەی « پارتیی »، چۆن هەڵدەسەنگێنی؟
و49 : وەڵلا، ڕاستییەکەی، بە یەکێ لەو ڕووداوانەی تەماشادەکەین، لە مێژووی گەلەکەماندا، پەڵەیەکی ڕەشبوو. چونکە، ئەو ڕژێمەی، چەندین ساڵ بوو، گەلەکەمانی دەچەوساندەوە و جینۆسایدی دەکرد، « پارتیی » هاواری بۆ بەرێ، بێ و پشگیرییبکا، بۆ ئەوەی، حساب لەگەڵ خەڵکێکی دیکەدا پاکتاوکا، کە پێکەوە بەرەیان هەبووە، هاوسەنگەربوون، هاو میریی بوون. بە ڕاستیی، ئەوە مەینەتییەک و شتێکی خراپبوو. ئیدی ناشلێین: هەموو ئۆباڵەکەی، لە ئەستۆی برادەرانی « پارتیی » باردەکەین، کە هاواریان بۆ « بەعس » بردووە. چونکە، گەر برادەرانی « یەکێتیی »، برادەرانی « پارتیی »یان تەنگەتاو و ناچار نەکردایە، پەنا بۆ بەر کارێکی وا بەرن، ئەوە ڕووی نەدەدا. واتە: ئەوانیش، بەشی خۆیان، هەر خەتایان بووە. بەلام، پێم وایە، بۆ هیچ شتێ نەدەبوو، ئەو کارە بکەن!
ـ بە ڕای تۆ، ئەو کارە هەڵە بوو، یا ناپاکیی بوو؟
وەڵلا، من بە هەڵەی دەزانم. بەلام، من پێم وایە، « پارتیی »، بۆ هیچ شتێ نەدەبوو، ئەو کارە بکا، هەر چەندە، زۆر لەوە پتریش تەنگەتاوکرانایە. وەک ئێمە، زۆر جار، مافمان پێشێلکراوە، تەنگمان پێ هەڵچنراوە. بەلام، بە ڕاستیی، دانمان بە خۆماندا گرتووە و نەمان هێشتووە، تووشی هەڵەی وا بین و پەنا بۆ ئەو جۆرە کارانە بەرین. چونکە، پێمان وایە، هەم مێژووی گەلەکەمان لەکەداردەبێ، هەم خۆشمان ...

پ50 : دەربارەی کۆنگرەی هێزەکانی ئۆپۆزیسیۆنی « عێراق »، ئەوانەی لە دەوڵەتەکانی « ئەمێریکا و بریتانیا » کۆدەبنەوە و قسەدەکەن، هیچ پێوەندییەکتان لەگەڵیان هەیە؟ ئایا، گەر کۆنگرە گیرا، بەشداریی تێدا دەکەن؟

و50 : ئێمە، تا ئێستە، بریارمان نەداوە، بەشدارییبکەین یا نەکەین. چونکە، بەرچاومان ڕۆشن نییە. ئێمە، وەک شتێکی سەرەکیی، بە هیچ شێوەیە، باوەڕمان بەوە نییە، « ئەمێریکا » ڕێوشوێنمان بۆ دیارییکا. پێـــمـــان بڵێ: وا بکەن، بە ئەوێدا برۆن و بە ئەوێدا بچن! من، لە چاوپێکەوتنێکی کەناڵی « سەحەر »یشدا باسمکردووە. کاتێ لێیان پرسیم و گوتیان: هەڵوێستان چییە، گەر « ئەمێریکا » بێ و دژی ڕژێم بجەنگێ؟ گوتم: وەڵڵا، هەڵوێستمان چۆن دەبێ؟ « ئەمێریکا » میوانی ئێمە نییە، تا بڵێین: بەخێربێی! بە دوژمنی خۆشمانی نازانین، تا بڵێین: بۆ هاتووی؟ واتە: نە بەخێرهاتنی دەکەین، نە دەشڵێین: بۆ هاتووی؟ دیارە، گەر خاوەنی « کوردستان » بین، دەسەڵاتمان هەبێ، نایەڵین، کەس بێ پرسی ئێمە بێ. بەڵام، ئێمە خاوەنی « کوردستان » نین. ئەو برادەرانەی، خۆیان بە میریی دەزانن، ئەو پرسیارە ئاراستەی ئەوان دەبێتەوە.

سەبارەت بە « کۆنگرەی ئۆپۆزیسیۆنی عێراق »یش، بە ڕاستیی، بەر چاومان ڕۆشن نییە. لەبەرئەوە، هەر چەندە، ئاگادارکراوین و بانگیان کردووین،

ــ بانگراوین؟!

بەڵێ. بەڵام، تا ئێستە، بەوە نەگەیشتووین، بریارێکی تەواو بدەین، بەشداربین یا نەبین. چونکە، وەک گوتم: بەرچاومان ڕۆشن نییە، نازانین، ئەو کۆنگرەیە بۆ چییە؟ چۆنە؟ کێ سەرپەرشتییدەکا؟ دەیانەوێ، چی بکەن؟ گریمان، برایەکیشمان نارد، چونکە، شتێکی واش هەبوو، پتر وەک چاودێرێ دەچێ، تا بزانێ، دەنگوباس چییە؟ نەک بڕوا، لە ئەوێ، هەڵوێستی « کۆمەڵی ئیسلامیی » دەربڕێ!

پ51 : باشە، گەر « ئەمێریکا » لە « عێراق » بدا، هەڵوێستی ئێوە چۆن دەبێ؟ ناڵێم: بەشدارییدەکەن یا نایکەن؟ بەڵام، ئایا بێ دەنگدەبن؟ ئایا دژ دەوەستن؟ ئایا پێتان خۆشدەبێ؟

و51 : ئێمە، لاچوونی « بەعس »، بە ئاواتێکی لە مێژینەی گەلەکەمان دەزانین. پێمان وایە، بە شێوەیەکی گشتیی، ئاواتێکی لە مێژینەی گەلانی « عێراق »یشە. « کابووس »ێکە، لە سەر سنگی ئەو خەڵکە لادەچێ. ئەو خەڵکە، لە ڕەوشێکی خراپ و مەینەتبار ڕزگاریاندەبێ.
بەڵام، مەترسیی ئەوەشمان هەیە، لە کۆلکی برەوینەوە، بە سەر بەرازیدا بکەوین ! بە ڕاستیی، گەر دیکتاتۆرێ لاچێ، یەکێکی دیکەی لە جێ دانرێ، ئێمە، بە هیچ شێوەیە، ئەو گۆڕانکارییەمان پێ باش نییە. چونکە، دیکتاتۆرێ، وەک ماری ژنانکووشتووی لێ کراوە، لە پەلوپۆخراوە، ماوەی « 10 - 12 » ساڵێ دەبێ، دانی بەو بارە تاڵەی « کوردستان »دا ناوە، "بۆ ئەوان تاڵە، چونکە، گەر ئەو ماوەیەی « 31ی ئۆگەستی 1996 » لێ دەرکەین، هاتنەوە، ئیدی، « کوردستان »یان نەدیوە!" گەر ئەو ڕەوشە بەردەوامبێ، لەوە باشترە، دیکتاتۆرێکی دیکە دانێن. بە هەناسەبڕکێ و چاوبرسێتیی، بۆ « کوردستان » بگەڕێتەوە، ئاڵۆزیی بنێتەوە. لەبەرئەوە، نازانین، چی دەبێ؟ واتە: لاچوونی ڕژێمی « بەعس »، شتێکی زۆر باشە. بەڵام، مەترسییمان لە ئەوە هەیە، دوای ئەوەی، ڕژێمی « بەعس » لادەچێ، چی ڕوودەدا؟ ئایا، ڕەوشی « عێراق » چی لێدێ؟ « کوردستان » بەرەو کوێ دەڕوا؟ چونکە، ڕەوشی ئێستە، کە دڵمان پێی خۆشە، خەڵکیش هەمووی بە خۆشیی دادەنێ و بە دەروویەکی خێری دەزانێ، گەر ئەو بارەمان لێ تێکچێ، بە ڕاستیی دەڵێین: با ئەویش هەر لا نەچێ!

پ52 : لەم ماوەیەی پێشوودا، « پارتیی »، پرۆژەیەکی دەربارەی داهاتووی « کوردستانی فیدراڵ » و « عێراق » نووسیبوو. ئێستە، لە سەر ئەو پرۆژەیە، لەگەڵ « یەکێتیی »شدا، ڕێککەوتوون. لە هەر دوو ڕۆژنامەی « خەبات و ئەلئیتیحاد »یشدا بڵاوکرایەوە. ئایا، ئەو پرۆژەیەتان دیوە؟
و52 : ناردوویانە.
ــ واتە: دیوتانە؟
بەڵێ.
ــ هیچ تێبینییەکتان لە سەری هەیە؟
من دەبوو، تەماشامکردایە. بەڵام، بە ڕاستیی، دەرفەتم نەبوو، بە وردیی لێی بکۆڵمەوە. لەبەرئەوە، تێبینیی لە سەر نادەم.

پ53 : بابەتێکی نوێی دیکە ماوە، ئەویش: جۆری پێوەندییەکانە. ئایا، لەگەڵ ئەم پارتانەی خوارەوەدا، پێوەندییتان چۆنە؟ لە پێشدا، لە پارتــــە « کوردستانیی »یەکانەوە دەسپێدەکەین.
ــ یەکێتی نیشتمانیی کوردستان:
و53 : ڕێککەوتننامەمان لە نێواندا هەیە. لەبەرئەوە، پێوەندییمان باشە.
ــ جۆری ئەو ڕێککەوتننامەیە چییە؟
واتە: ڕێککەوتننامـــەی ئەوەمــــان پێکەوە هەیە، ڕێز لە یەکــدی بگرین، کارەکان بۆ یەکدی ئاسانکەین. ئینجا، گەر ڕژێم، پەلاماری ئەم بەشەی میریی هەرێم بدا، ئێمـە، دوای ڕاوێژکـردن و نەخشـەدانان، بەشداریی دەکەین.
ــ پارتی دێمۆکراتی کوردستان:
هەر چەندە، ئێمـە، وەک « کـۆمـەڵی ئیـسـلامـیی »، وەک پارتێکی تازە دامـــەزراو، چەن جـارێ، لە برادەرانی « پارتیی » چووینە پێــشـــەوە و دەسپێشخەرییمانکرد، تا، ناکۆکیی لە نێوانمـاندا*ڕوو نەدا و پێوەندییمان باشبێ. بەڵام، بە داخەوە، تا ئێستە، برادەرانی « پارتیی »، هەنگاوێکی باشی ئەوتۆیان نەناوە، کە ئێمە چاوەڕوانماندەکرد.
بۆ وێنە: تا ئێستە، ڕێیان نەداوە، ڕادیۆ و تێلێڤیزیۆنمان لە نێوچەکانی ژێر دەســـــەڵاتی ئەواندا هەبێ. لەگـــەڵ ئەوەشــــدا، هەمـــوو بنکە جەماوەرییەکانی « بزووتنەوە » و « بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامیی »، کە کاتی خۆی هەبوون، ئێستە، لەگەڵ « کۆمەڵی ئیسلامیی » دان. ئێمە، لە « زاخۆ » و « دهۆک »ەوە بیگرە، تا « هەولێر » و هەموو شوێنەکانی ژێر دەسەڵاتی برادەرانی « پارتیی »، خەڵکمان هەیە. ڕێکخستنێکی پتەو و بەهێـزمـان هەیە. جـەمـاوەرێکی باشـمـان هەیە. بەڵام بە داخـەوە، بە ڕاستیی، برادەرانی « پارتیی »، تا ئێستە، ئەو وەڵامە باشەیان نییە!
لەگەڵ ئەوەشدا، کـاک « مەسـعـوود »، جارێ نامـەیەکی ناردبوو، جـارێ بانگیکردین و چووین. جارێکیش، بێ بانگکردن سەرمـاندا. پاشان، دوو جاری دیکە، بانگیکردین. بەڵام، ئێمە گوتمان: لەبەرئەوەی ئێوە، چەن جار بەڵێنتـانداوە، مـۆڵەتی « کـۆمـەڵ » بدەن، بە ئاشکرا کـاربکا، ڕادیۆ و تێلێڤیزیۆن دانێن، هێندێ خەڵکی ئێمەشتـان گرتووە، هێندێ بارەگای ئێمەتان داگیرکردووە، بەڵێنتاندابوو، ئەو خەڵکە بەردەن، چارەسەرێ بۆ

ئەو گرفتانە بدۆزنەوە. بەڵام، لەبەرئەوەی، هیچی چارەسەر نەکراوە، بە پێویستی نازانین، بێین. چونکە، کاتێ براکانمان، لە گرتووخانەدا بن، بارەگاکانمان داگیرکرابن و دەنگمان خەفەکرابێ، بۆچی بێین؟!!
لەبەرئەوە، بە پێویستمان نەزانی، بچین. هەڵبەتە، ئەو ساردییەش، لە نێوانماندا نییە، وەک بڵێی، خواحافیزیمان لێ کردبن. چونکە، ئێمە مەڵبەندمان لە ئەوێ هەیە. بارەگای نێوچەشمان لە شارۆچکەی « سۆران» هەیە. هەروەها، لە نێوچەکانی « دهۆک، زاخۆ » و ئەو نێوانە، خەڵکیشمان هەیە. بەڵام، بارەگاکەیان پێ داخستوون.
ــ حیزبی زەحمەتکێشانی کوردستان:
پێوەندییەکی وامان نییە. بۆ نموونە: لەگەڵ کاک « قادر عەزیز »دا، یەکدی دەناسین. چەن جارێ، لە سەردەمی « بزووتنەوە »دا، یەکدیمان دیوە. بەڵام، دوای ئەوەی، « کۆمەڵی ئیسلامیی »مان ڕاگەیاند، چاوەڕێمان دەکرد، هەموو ئەو لایەنە ڕامیارییانە بێن، پیرۆزباییمان لێ بکەن، دەسخۆشانەمان لێ بکەن، سەرمانبدەن. برادەرانی « زەحمەتکێشان » نەهاتن. لەبەرئەوە، لە سەر ئاستی بەندە، سەردانیان نەکراوە. پێم وا نییە، برادەرانی دیکەش، سەردانیان کردبن.
ــ بزووتنەوەی دێمۆکراسیخوازانی کوردستان:
دیارە، لەگەڵ ئەوانیشدا، پێوەندییمان هەیە. لەگەڵ مامۆستا « بەهادین نووریی » و ئەواندا، یەکدی دەناسین. بەڵام، پێوەندییەکەمان، ڕەنگە لە سەر ئاستی مەڵبەند و ئەوانە بێ. واتە: هێندێ بۆنە هەبێ، برایانمان لەگەڵ ئەواندا، یەکدییان بینیبێ. بەڵام، لە سەر ئاستی بەندە و مامۆستا « بەهادین »، یەکدیمان نەدیوە.
ــ حیزبی سۆسیال دێمۆکراتی کوردستان:
لەگەڵ ئەواندا، پێوەندییمان باشە. کاک « موحەممەدی حاجی مەحموود »، چەن جارێ هاتووە. سەردانیکردووین، ڕاوێژ و بیروڕا گۆڕینەوەشمان پێکەوە هەیە. چونکە، وەک نێوچەی جوگرافییش بێ، لە یەکدییەوە نزیکین. نێوچەکانمان بە سەر یەکەوەن.
ــ پارتی کاری سەربەخۆیی کوردستان:
برادەرانی پارتی « کار »یش، یەک دوو جار هاتوون. ئێمەش، سەردانمان کردوون. بڵێین: شتێکی ئاساییمان لە نێواندا هەیە.

ـــ پارتی کۆمۆنیستی کوردستان:
لەگەڵ ئەواندا، بە هیچ شێوەیە، پێوەندییمان نییە.
ـــ پارتی پارێزگارانی کوردستان:
پێوەندییمان باشە. لەگەڵ کاک « عومەر ئاغای سوورچیی »، من پێوەندیی تایبەتییم هەیە. وەک پارتیش، ئەوان سەردانمان دەکەن.
ـــ پارتی کرێکارانی کوردستان ـــ .P.K.K:
لەگـەڵ برادەرانـی « .P.K.K »، پێوەندییەکی ئاساییمان هەیە و چەن جارێ، هەم ئەوان هاتوون و هەم ئێمەش لە ئاستی بەرزدا، نوێنەرمان سەردانی کردوون، هیچ گرفتێکیشمان نەبووە و نییە.*
ـــ پارتە « عێراقیی »یەکان:
پارتی کۆمۆنیستی عێراق:
هێندەی من ئاگاداربم، هیچ پێوەندییەکمان نییە.
ـــ پارتی کۆمۆنیستی کرێکارانی عێراق:
ئاگام لێ نییە، هیچ پێوەندییەکمان هەبێ.
ـــ مەجلیسی ئەعلای ئیسلامیی عێراق:
پێوەندییمان هەیە. لە سەر ئاستی « موحەممەد باقر حەکیم » و لەگەڵ بیرۆکانیان لە « سولەیمانیی »، تا ئەندازەیەک، پێوەندیی باشمان هەیە.
ـــ حیزبی دەعـــــوە:
پێوەندیی باشمان هەیە. بە ڕاستیی، ئەوان دەسپێشخەرییانکردووە، پتر سەردانماندەکەن و لەگەڵ « حیزبی دەعوە » و ڕێکخراوی « عەمەل » دێن.
ـــ پارتی بەعسی عەرەبی سۆسیالیت، ئەو کۆمەڵەی سەر بە « سووریا »ن و دژی « عێراق »ن.
تا ئێستە، پێوەندییەکی بەو شێوەیەمان نییە.
ـــ جۆرێکی دیکەی پێوەندیـــــی، لە پێوەندیی نێوان ئێوە و دەوڵەتەکانی دەوروبەر پێکدێ. وەک « ئێران »:
لەگەڵ « کۆماری ئیسلامیی ئێران »، پێوەندییمان باشە. واتە: وەک چۆن، برادەرانی پارتەکانی دیکە، هاتوچۆیان هەیە، بیرۆی پێوەندییان هەیە، ئێمەش، لە « تاران » هەمانە.

---

* ئەم پرسیارە، بە نامە کراوە و وەڵامەکەشیم هەر بە نامە وەرگرتۆتەوە.

— « توورکیا »:
هیچ پێوەندییمان نییە.
— « سووریا »:
نە لەگەڵ پارتەکەیاندا، نە لەگەڵ دەوڵەتەکەیاندا، هیچ پێوەندییەکی وامان نییە. چونکە، ئێمە داوامانکرد، بیرۆی پێوەندیی بکەینەوە. بەڵام، ئەوان گوتیان: لەم هەلومەرجەدا ناتوانین. ئەو بیرۆی پێوەندیییەی، کاتی خۆشی لە سەردەمی « بزووتنەوە »دا بوومان، ئێستە، وەک « بزووتنەوە »، سەر بە مامۆستا مەلا « عەلی » و ئەوانە.
— دەوڵەتی « شانشینی عەرەبستانی سعوودیە »، هەم وەک وڵات و هەم وەک دەوڵەتێکی ئیسلامییش:
تا ئێستە، پێوەندییەکی وامان نەبووە. بەڵام، لە ئەو ماوەیەی پێشوودا، داوەتنامەیان ناردبوو. دیارە، تا ئێستە، رێک نەکەوتووە، بچین. چونکە، ئەوان ویستبوویان، پێویستیی سەردانەکە، لە رێی « سووریا »وە بکرێ. ئێمەش، برایانی پێوەندییمان، پێیان باشبوو، لە « ئێران »ەوە بکرێ. لەبەرئەوە، سەردانەکە دواکەوتووە.
لە ئەم ماوەیەشدا، لە « کوێت »ەوە هەر بانگهێشتنمان بۆ هات. بە هەمان شێوە، هەر دوو کۆچەکە دواخرا. گەر رێککەوێ، پێکەوە دەیانکەین.
— گەر پێوەندییەکی دیکەتان هەبێ و خۆت ئاگاداربی، لەگەڵ وڵاتێکی عەرەبیی یا ئیسلامییدا، کە من ناوم نەهێنابێ!
نیمانە.
— ئەدی، لە سەر ئاستی « ئەورووپا و ئەمێریکا »، هیچ پێوەندییەکی نێو دەوڵەتانتان هەیە؟
نەخێر. بۆ نموونە: نوێنەرمان لە « بریتانیا » هەیە.
— ئەوە، نوێنەری رێکخراوی خۆتانە.
بەڵێ.
— دێینە سەر جۆرێکی دیکەی پێوەندیی بە رێکخراوە ئیسلامییەکانەوە لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا، بۆ نموونە: « حەماس » لە « فلەستین »:
هیچ پێوەندییەکی وامان نییە. کاتی خۆی، پێوەندیی ناسیاوییمان هەبوو، لە سەردەمی « بزووتنەوە »دا، من سەردانمکردن. بەڵام ئێستە، لەو رۆژەوە « کۆمەڵی ئیسلامیی »مان راگەیاندووە، رەنگە، برایانمان لە

بیرۆی پێوەندیی لە « تاران »، سەردانیانکردبن و ئەوانیش، سەردانی بیرۆکانی « حەماس و حەرەکەی جیهاد »یان کردبێ. بەڵام، لە ئاستی بەندە و بەرپرسیارانی دیکەدا، سەردانمان نەبووە.

ـــ « حیزبوڵڵا » لە « لوبنان »:

ئەوانیش، بە هەمان شێوە.

ـــ « ئەخوان ئەلموسلیمین » بە گشتیی و لە هەر شوێنێ بن:

لەگەڵ برایانی « یەکگرتوو »، پێوەندییمان هەیە.

ـــ مەبەستم لە ڕێکخراوە عەرەبیی و ئیسلامییەکانی دیکەیە. بۆ نموونە: « میسریی، سووریایی، ئوردونیی ... »

نیمانە. کاتی خۆی هەمانبوو. لە سەردەمی « بزووتنەوە »دا، کۆچێکم بۆ « ئوردوون، یەمەن، سوودان » و ئەو شوێنانە کرد. لە پێشدا، چاودێری گشتیی « ئەخوان »م لە « ئوردوون » بینی. پاشان، چاودێری گشتیی « ئەخوان »ی « سووریا »شم، لە « تووركیا » بینی. هەروەها، ئەوەی « یەمەن »یشمان بینی.

ـــ ڕێکخراوی « طالیبان »:

هیچ.

ـــ بە هیچ جۆرێ. واتە: پێش ئەوەش!

بە زەردەخەنەیەکەوە، نەوەڵڵا، نە پێش و نە پاشیش.

ـــ ڕێکخراوی « ئەلقاعیدە »:

ئەوانیش بە هەمان شێوە.

ـــ هەرگیز نەتانبووە؟

نەخێر.

پ54 : پرسیارێ هەیە، زۆر تایبەتییە. چۆن لە کەسێتیی « بارزانیی مستەفا » دەڕوانی؟

و54 : پێم وایە، « مەلا مستەفا »، بۆ هەلومەرجی ئەو کاتەی « کوردستان »، وەک کەسایەتییەکی کورد، کە کوردی لە دەور ئاڵابوو، گەلی کورد باوەڕی پێ کردبوو، بە ڕاستیی، یەکێ بوو، لە ئەو کەسایەتییانەی، لەو سەردەم و هەلومەرجەی خۆیدا، ڕۆڵێکی باشی بینیوە. جا، لە چەندەدا هەڵەیکردووە و لە چەندەدا پێکاویێتی، ئەوەیان

شتێکی دیکەیە. چونکە، لە دوای « مەلا مستەفا »وە، دیارە، خەباتی ڕزگاریخوازانەی گەلی کورد، لە « باشـــــــــووری کوردستان »دا، لە « کوردستان »ی سەر بە « عێراق »دا، لە سەر کەس کۆ نەبۆتەوە. کەواتە: لە سەردەمی ئەودا، ئەو هەموو خەڵکە، لە دەوری کۆبووبوونەوە، دیارە، ئەو کابرایە، شتێکی پێ بووە.

هەڵبەتە، من خۆم نەمبینیوە، لە سەردەمی ئێمەدا نەبووە. بەڵام، کە ژیانەکەی دەخوێنینەوە و لە خەڵکم بیستووە، دەڵێن: پیاوێکی ئازابووە، پیاوێکی بە شەهامەتبووە. ئینجا، پیاوێکی دڵسۆزبووە. دیارە، خەڵکیش قسەی لە سەر دەکا. بەڵام، من بۆ نموونە: پیاوێکی وەک « مام جەلال »، کە خۆم بینیومە، بەڵێ، تێبینیی لە سەر هەبووە. بەڵام، دیارە، « مام جەلال » کە ئامادەبووە، لە پارتەکەی ئەودا ئەندام بێ، دیارە، بایی ئەوەندە لێی ڕازیبووە، کە بە برا گەورەی خۆی و سەرۆکی خۆی بزانێ.

— باشە، تۆ دەڵێی: « بارزانیی »م نەدیوە. بەڵام، لە نزیکەوە، « مەسعوود بارزانیی و جەلال تاڵەبانیی »یشت دیوە.

بەڵێ.

— کەسێتیی ئەو دووانە، چۆن هەڵدەسەنگێنی؟

بێ گومان، ئەو دوو کەسە، هەر دووکیان، دوو سەرکردەی خەباتی ڕزگاریخوازی کوردن و قسە لە سەرکردنیان، گەر بویستریٚ، مافی خۆیان بدرێتێ و چاک هەڵسەنگێنرێن، زۆری دەوێ. بەڵام، ئەوەی بۆ ئەم چاوپێکەوتنەمان بشێ، بگوترێ، ئەوەیە: « مام جەلال »، پیاوێکی خاوەن ئەزموونە. لە هەڵسوکەوت و مامەڵەکردن لەگەڵ خەڵکدا کراوەیە. ئینجا، ڕووخۆشە. تا ئەندازەیەکیش، جۆرێ لە دڵپاکیی پێوە دەبینی. بۆ نموونە: ئەو شتەی پێیەتی، ئەو خەڵکەی دەیانبینێ، حەزدەکا، پێیان بڵێ.

کاک « مەسعوود »، لە تێکەڵی لەگەڵ خەڵک و لە قسەکردندا بۆ خەڵک و لە ئەوانەدا، تا ئەندازەیەک داخراوە. واتە: بە پێچەوانەی « مام جەلال »ەوە، پتر شێوەی مەندیی، کەمدوویی و ئەوانەی بە سەردا زاڵە. بەڵام، من پێم وایە، « مام جەلال »، لە ڕووی زانیاریی ڕامیاریی و لە ڕووی ڕۆشنبیریی گشتیی و ئەوانەوە، بە دڵنیاییی، لە کاک « مەسعوود » پتری پێیە. بەڵام، واش هەستدەکەم، کاک « مەسعوود »، هێندێ هاوسەنگتربێ! بۆ نموونە: لە هێندێ هەڵوێستدەربڕین، کە دێتە پێش، وا پێدەچێ، کەمدووییەکەی

کاک « مەسعوود »، زۆر جار ڕاژەیبکا. شت زۆر ڕوونکردنەوەکەی « مام جەلال »یش ڕەنگە، هێندێ جار زیانی لێ بدا. ئەوەی لە خەڵکیشم بیستووە و خۆشم، ئەزموونم لە سەری هەیە، ئەوەی کە بڵێی، بە گونجاوی بزانم، ئەوەندەیە. ئەگینا، « بە پێکەنینەوە » شتی دیکە زۆرە، لە سەر خەڵکی بیلێین!

پ55 : هەموو ئەو پرسیارانە گشتیی بوون و تەواوبوون. ئێستە، باسی بابەتێکی دیکە دەکەین. ئەویش: پێوەندیی بە باری « کۆمەڵی ئیسلامیی لە کوردستان/عێراق »ەوە هەیە. پێش هەموو شتێ، پێناسەیەکی « کۆمەڵی ئیسلامیی »م بۆ بکە!
و55 : لە « 1999. 08. 08 »دا، « بزووتنەوەی ئیسلامیی » پێشوو، لەگەڵ « ڕاپەڕین »دا یەکیانگرت و « بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامیی »یان پێکهێنا. ئێمە، لە نێو « بزووتنەوەی ئیسلامیی » پێشووتردا و لە نێو « بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامیی » پێشووشدا، تەوژمێ بووین.
بەندە و خەڵکی دیکەی، لەگەڵ مندا هاوبیربوون، تێبینییان، لە سەر زۆر شت هەبوو. بۆ نموونە: کەسانێ هەبوون، بە پێڕەو و بەرنامەوە پابەند نەبوون. کارەکانیان، بە ڕاوێژکردن بەڕێوە نەدەبرد. دادپەروەریی، لە کێشەی « بەیتولمال »دا، جێبەجێ نەدەکرا، هاوسەنگیی ڕا نەدەگیرا، هاوسەنگیی « شەرعیی »، لە هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ خەڵک، دەورووبەر، پارت و دەوڵەتەکاندا، وەک پێویست نەبوو. بە کورتیی: کۆمەڵێ تێبینییمان هەبوو. پاشان یەکەمین کۆنگرەی « بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامیی »، لە مانگی « 08 .2000 »دا گیرا. پێش ئەوەی کۆنگرە بگیرێ، ئێمە، لەگەڵ مامۆستا مەلا « عەلی »دا، کێشەمان هەبوو. لەبەرئەوە، لەگەڵ ئەو و ئەو خەڵکەی لە دەوری بوون، بە سەرپەرشتیی نوێنەری « کۆماری ئیسلامیی ئێران »، ڕێککەوتننامەیەکمان لە نێواندا ئیمزاکرا. ئێمە هەر ئەو کاتە، بە تەمابووین، کارێبکەین، مامۆستا مەلا « عەلی »، لە کۆنگرەدا دەر نەچێ.
برادەرانی « کۆماری ئیسلامیی ئێران » داوایانکرد و گوتیان: با، ڕێککەوتنێکتان لە نێواندا هەبێ، گەر مامۆستا مەلا « عەلی »، بەو ڕێککەوتنەوە پابەند نەبوو، ئەو کاتە، بۆتان هەیە، هەڵوێستی لێ وەرگرن و دەریکەن.

ڕێککەوتنەکە، هەر دوو لامان « مامۆستا و ئێمە » ئیمزامانکرد. یەکێ لەو خالانە ئەوەبوو، هەموو لایەکمان دەبێ، بە ئەنجامەکانی کۆنگرەوە پابەند بین. بەڵێ، کۆنگرە تەواوبوو. ئەو خەڵکەی سەر بە مامۆستا مەلا « عەلی » بوون، جگە لە برایەکی و زاوایەکی خۆی، نزیکەی هیچیان دەر نەچوون. لە ئەنجامدا، گرفتمان بۆ دروستبوو. ئێمەش، « کۆمەڵی ئیسلامیی »مان ڕاگەیاند. بۆ ئەوەی، هەموو ئـــــەو خراپەکاریی و کەموکوڕییانەی، لە « بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامیی »دا هەبوو، لە ژێر سەرکردایەتیی مامۆستا مەلا « عەلی »دا دەمانبینی و پێشمان چارەسەر نەدەکرا، خۆمانی لێ دەربازکەین.

ئیدی، بەو شێوەیە، بە حسابی خۆمان، کۆمەڵێکی ئیسلامییمان دامەزراند و ڕاگەیاند، کە بە بەرنامەوە پابەندبێ. ئێستە، بەرنامەیەکی ڕۆشنمان هەیە. کارەکان بە ڕاوێژ و بە « شوورا »، لە نێوان خۆماندا بەڕێوەدەبەین. « بەیتولمال »، ئەو پارەتیی و ماڵەی دەسماندەکەوێ، چ ئەوەی، بەپێی ڕێککەوتننامە لەگەڵ « یەکێتیی »، چ ئەوەی، خەڵک لە دەرەوە، چ ئەوەی خێرخوازان لە نێوەوە بۆمان دەنێرن، دەزانین، چەندە و هەموو کەسێکیش دەزانێ، چۆن بە دادپەروەریی خەرجدەکرێ.

هەروەها، هەڵسوکەوتمان لەگەڵ خەڵکدا، لەگەڵ « ئێران »دا، لەگەڵ لایەنە ڕامیارییەکاندا، بە شێوەیەکی نێوەندیی ڕێکخستووە. چونکە پێشتر، پتر لە سەر ئاستی، پێوەندیی تاکەکەسیی بوو.

ـــ ئایا، ئێوە لە نێوخۆتاندا، ڕێک و تەبان، یا، ناکۆکن و لە چەن گرووپێ پێکهاتوون؟

سوپاس بۆ خوا، لە نێو خۆماندا، زۆر ڕێک و تەبا و تۆکمەین، هەم لە نێوان ئەندامانی سەرکردایەتیی، هەم لە نێوان سەرکردایەتیی و ئەندام و پێشمەرگەکانیشماندا، خۆشەویستیی و ڕێز و متمانەی چاک هەیە.*

« کۆمەڵی ئیسلامیی »، بە گیانێکی نوێ و بە هەناسەیەکی نوێوە دامەزراوە. لە لایەکەوە، خۆمان بە درێژەپێدەری ســـــــەروەرییەکانی « بزووتنەوەی ئیسلامیی »، « بزووتنەوەی ڕاپەڕین » و « بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامیی » دەزانین، کە لە هەر دووکیان پێکهاتووە. لە لایەکی

---

* ئەم پرسیارە لاوەکییە و وەڵامەکەی مامۆستا، لە نامەیەکی تایبەتییەوە وەرگیراوە.

دیکەشەوە، خۆمان بە پڕکەرەوەی کەلێن و بۆشاییەکان دەزانین. چونکە، ئەو کەموکوڕییانەی، ئێمە، ڕەخنە و گلەییمان لێیان هەبوو، چارەسەر کراوە. تا ئێستەش، ئیشی خۆمان، بەرەو گەشەکردن و بەرەوپێشچوون دەبینین. بەڵام، کەموکووڕیشمان هەر هەیە، هەستیشیان پێ دەکەین، باوەڕیشمان بە هێزە، خوا یاربێ، چارەسەری ئەو کەموکووڕییانەش دەکەین.

پ**56** : ئامانجتان چییە؟

و**56** : لە ڕاستییدا، گەلەکەمان، گەلێکی موسوڵمانە، گەلێکی موسوڵمانیش دەبێ، هەموو شتێکی، بەپێی ئایینەکەی بێ. بەپێی ئیسلام بێ، چ لە خەباتی ڕزگاریخوازیی خۆیدا بێ، چ لە کاتی چارەسەرکردنی کێشەی نەتەوەیی خۆیدا بێ. واتە: کاتێ بیەوێ، گرفتی ڕامیاریی خۆی چارەسەرکا و میریی دامەزرێنێ، یا بیەوێ، هەر ئامانجێکی دیکەی « شەرعیی » ژیان جێبەجێکا، دەبێ، لە ڕوانگەی « شەریعەت »ەوە بێ. دەبێ، لە سەر بنچینەی ئەو « شەریعەت »ە بۆی بچێ. ئامانجی ستراتیژییمان ئەوەیە، کۆمەڵگەی کوردەواریی وا لێ بکەین، بیخەینە ژێر سایەی « شەریعەت »ەوە، بۆ ئەوەی، لە هەر دوو ژیانەکەدا بەختەوەربێ.

ـ گەر هەلتان بۆ بڕەخسێ، ئایا، ئامانجتان ئەوە نییە، دەوڵەتێکی « کوردستانیی ئیسلامیی »، لە « باشووری کوردستان »دا دامەزرێنن؟

وەڵلا، گەر هەلمان بۆ بڕەخسێ، چی بە قازانجی « دونیا و قیامەت »ی ئەم گەلەمان بێ، وا دەکەین. ئێستە، برادەرانی « پارتیی و یەکێتیی »، بۆ هەر دەڵێن: « فیدراڵیی »مان دەوێ؟ چونکە دەڵێن: لەوە پتر ناشێ و توانامان نییە. گەر داوای دەوڵەت بکەین، ڕەنگە، هەر هیچمان بۆ نەچێتەسەر. با نەڵێین: یا هەموو یا هیچ! ئێمەش، گەر لە بارێکی وادا لەنگەربگرین، بە دڵنیاییەوە، هەر وا دەبین.

بەڵام، هێندێ گلەییمان، لە برادەرانی « پارتیی و یەکێتیی » هەیە، کە جارجار دەڵێن: بۆ ئەوەی، برادەرانی « توورک »، گلەییمان لێ نەکەن. یا سەرنجی « ئەمێریکایی »یەکان ڕاکێشین، پێویست ناکا، باسی دەوڵەتی کوردیی بکەین! ئێمە دەڵێین: با، بە شتێکی قەدەغەی نەزانین. چونکە، وەک بۆ خەڵکی دیکە ڕەوایە، بۆ کوردیش هەر ڕەوایە. ئەگینا دیارە، گەر

ئێمەش، لە هەلومەرجێکی وادا لەنگەربگرین، دەبێ، تەماشای دەوروبەرکەمان بکەین. ڕاستە، شتێکی ئایدیاڵ و ئامانجێکی بەرزمان هەیە. بەڵام، تەماشای باری ڕیالیزمیش دەکەین، چیمان بۆ دەسدەدا؟!!

پ57 : شتێکی ئاشکرایە، هەر گرووپێ، هەر ڕێکخراوێ یا هەر پارتێکی ڕامیاریی، چ « سیکولار » بێ، چ « ئیسلامیی » بێ، گەر سەرچاوەیەکی ئابووریی سەربەخۆی نەبێ و ئەو سەرچاوەیە دابین نەکا، دەبێ، بە دەسەڵاتێکی دیکەوە پابەندبێ. بۆ نموونە: گەر پارتێکی گەورەتر، یارمەتیی ئابووریی بدا، دەبێ، لە زۆر شت چاوبنووقێنێ. کامەیە، ئەو سەرچاوە ئابوورییەی ئێوە هەتانە؟

و57 : بە ڕاستیی، ئەو سەرچاوەیەی ئێمە هەمانە و خۆمان پێوە بەستۆتەوە، لە هاوکاریی خەڵک، دۆست و لایەنگرانی خۆمان پێکهاتووە. جا ئەو سەرچاوەیە، چ لە نێوەوەی وولات بێ، چ لە دەرەوەی وولات، بە تایبەتیی، لە وولاتانی « ئەورووپا »وە بێ. بەڵام، ڕێککەوتننامەیەکمان لەگەڵ « یەکێتیی »دا هەیە. ئەو بڕە یارمەتییەی وەریدەگرین، وەک پێشتریش باسمکرد، یەکێ لەو سەرچاوانەیە.

بە ڕاستیی، ئێمە، بە مافێکی ڕەوای خۆمانی دەزانین. چونکە، ئێمەش خەڵکی ئەم وولاتەین و کوڕی ئەم گەلەین، ئەم دەسکەوتەش، هی ئەم خەڵکەیە و خوای پەروەردگار، بۆ هەموو ئەم خەڵکەی ئەفراندووە، کە لە سەر ئەم خاکە دەژین. لەبەرئەوە، هیچ هەست بە منەتباریی ناکەین، کە خێرمان پێ دەکرێ. بە ئاشکراش گوتوومانە.

بەڵام، لە لایەکی دیکەشەوە، خۆمان وا ڕاهێناوە، گەر ڕۆژێ لە ڕۆژان، ئەو یارمەتییەی، لە سەر بناغەی ڕێککەوتننامەیەک وەریدەگرین، بە هەر بیانوویەکەوە بێ، ڕێککەوتننامەکە نەمێنێ، بەو پارە کەمەی، دەس خۆمان دەکەوێ، باوەڕی پێ بکەین و کارەکانی خۆمانی درێژە پێ بدەین.

پ58 : ئەوەی بە ئاشکرا، لە « کوردستان »دا دەبینرێ، تەنیا هەر، ئەو چوار ڕێکخراوە ئیسلامییە « بزووتنەوە، یەکگرتوو، ئەنصار ئەلئیسلام و کۆمەڵی ئیسلامیی » هەن. ئایا، « کۆمەڵی ئیسلامیی »، لە ڕووی قەبارە، توانا و دەسەڵاتەوە، بە پلە چەن دێ؟

و58 : ئێمە، وا دێتە بەر چاومان: لە نێو ئیسلامییەکاندا، لە ڕووی قەبارە، ژمارە، بنکەی جەماوەریی و لە ڕووی چۆنێتیی کادێرانیشمانەوە، گەر یەکەم نەبین، یا، لە پێش برایانی « یەکگرتوو »ەوە نەبین، یا وەک ئەوانین، یا لە دوای ئەوانین. بە ڕاستیی، ئێمە، ئێستە وەنەبێ، بڵێین: برایانمان سەرژمێرێکی وردی لایەنەکانیان کردبێ، بەڵام، هێندە هەیە،

ـ هێندەی هەستی پێ بکەی!

هێندەی هەستی پێ بکەم، یا لە پێش ئەوانین، یا وەک ئەوانین. بەڵام، هێندە هەیە، ئێمە بە ڕاستیی، پتر لە سەر چۆنێتی ئەندامەکانمان کار دەکەین. چونکە، بەڕێزت دەزانی، هەموو گەل، لە یەک پارتدا جێی نابێتەوە. بەڵام، گرنگ ئەوەیە، ئەو پارتە پێشڕەوەی هەیە، لە ئاستی ئەو ئامانجە « شەرعیی » و درووشمانەدا بێ، کە بەرزیکردۆتەوە.

پ59 : چۆن لە جووڵانەوەی نەتەوەیی و مافی چارەنووسی گەلانی جیاواز دەڕوانی؟ مەبەستم کورد نییە.

و59 : من پێم وایە، گەر مافی چارەنووس، بۆ گەل هەبێ، دەبێ، بۆ هەموو گەلان وەک یەکبێ. واتە: هەمان خەباتی ڕزگاریخوازیی، کە بە گەلەکەی خۆمانی ڕەوادەبینین، هەمان ئەو ئامانجە ڕەوایانەی، کە خۆمان بەدیدێنین، بە هەموو گەلێکی دیکەشی ڕەوادەبینین.

ـ بێ جیاوازیی ئایینیی؟

بێ جیاوازیی ئایینیی. دیارە، خوای پەروەردگار، مرۆی درووستکردووە، هێندێکی ئامادەیە، بەندایەتیی بۆ خوا بکا و شوێن ئایینی خوا بکەوێ، ئەو ئایینەی، بە کۆتایی هەموو ئایینەکان دەژمێررێ.

هێندێکی دیکەش هەن، ئامادە نین، ئەو بەندایەتییە بکەن. بەڵام، هەمووی هەر مرۆڤە. بۆیە دەبێ، هەمووی بۆی هەبێ، لە سەر خاکی خۆی بژی، ئازادبێ و ژیانێکی مرۆیانە بژی.

ـ من مەبەستم ئەوەیە، بزووتنەوەی نەتەوەیی و ئایینیی، لە یەک کاتدا، لە وڵاتانی « فلەستین، بۆسنەوهەرسک، چیچێنستان، کشمیر، کۆسۆڤۆ، داگستان،... » هەمووی تێکەڵکراوە. هەموو موسوڵمانان، بە تایبەتیی، ڕێکخراوە ڕامیاریی و دەوڵەتە ئیسلامییەکان، پشگیرییانکردوون. چونکە، کاری نەتەوەیی و باوەڕی ئایینییان تێکەڵاوکردووە.

بۆ نموونە: بۆچی، ئەو هەموو پشگیرییەی « فلەستینیی »یەکان دەکرێ؟ چونکە، گەلی « فلەستین »، لەگەڵ گەل و دەوڵەتێکی دیکەی ناموسوڵماندا دەجەنگێ. بەڵام تەماشادەکەی، کێشەی کورد لەو کێشانە، گەلێ ئاڵۆزترە. ڕاستە.

— ئەمە بۆچی وایە؟ چونکە ئێمە، لە هەر چوار پارچەکەی « کوردستان »، لە ژێر دەسی چوار گەل و دەوڵەت داین، کە هەر چواریان موسوڵمانن. واتە: خەڵکەکە موسوڵمانن، دەوڵەتەکان ئیسلامیین و نیشتمانەکانیش، هەر نیشتمانی موسوڵمانانن! لەبەرئەوە، کێشەی ئێمە، لە کێشەی ئەو گەلانەی دیکەی، بەرانبەر گەلە ناموسوڵمانەکان دەجەنگن، گەلێ ئاڵۆزترە. ئێوە، چۆن لەو کێشەیە دەڕوانن؟

ئەوە ڕاستە. وەڵڵا، بە دڵنیاییەوە دەڵێم: کێشەی کورد، لە هەموو بەشەکانی « کوردستان »دا، زۆر ئاڵۆزە. بۆ نموونە: جارێ لە شوێنێکی وەک « کۆماری ئیسلامیی ئێران »، میرییەکەشی، هەر خۆی بە ئیسلامیی دەزانێ. دیارە، ئەوانی دیکە « توورکیا، عێراق و سووریا »، ناڵێم: میریی ئیسلامیین. بەڵام، وا دیارە، هەر خۆیان بە موسوڵمان دەزانن. ئەوە ڕاستە، ئەو ئاڵۆزییە هەیە.

بەڵام، من پێم وایە، لە ئاییندەدا، گەلانی موسوڵمان هەموویان، ناچار دەبن، یا دەبێ، ڕێز لە یەکدی بگرن، یا دەبێ، چۆک بۆ ویستی بەرەی خۆراوا و « ئەمێریکا » دابدەن. چونکە، نە « عەرەب » بێ « کورد »، هیچی بۆ دەکرێ. نە « کورد » بە تەنیا، لەگەڵ « توورک، عەرەب و فارس »دا، هیچی پێ دەکرێ. بۆ ئەوەی، گەلانی موسوڵمان بتوانن، لە وڵاتی خۆیاندا سەربەرز بژین، دەبێ، هەموویان ڕێز لە یەکدی بگرن، یا دەبێ، سەربەخۆیی خۆیان لە دەسدەن!

—— پێت وانییە، ئەوە کاری ئێوە بێ، وەک گرووپێکی ئیسلامیی، لەگەڵ ڕێکخراوە ئیسلامییەکانی چوار دەوڵەتەکەدا دانیشن و تێیان بگەیەنن، تا پشگیریی کێشەی کورد بکەن؟

با، با. کەم و زۆر، ئەوەشمان کردووە. کاتێ، لەگەڵ بەرپرسانی « کۆماری ئیسلامیی ئێران » قسەمکردووە، گوتوومە: ئێوە دەبێ، کارێکی وا بکەن. بۆ نموونە: لە یادی کۆچیدوایی ئیمام « خومێنیی »دا قسەمکرد و گوتم: کاتێ، بەرپرسانی « کۆماری ئیسلامیی ئێران »، دژی ڕژێمی « شا »

کۆدەتایکرد، هەموو گەلەکان پێکەوە کردیان. بۆیە دەبێ، حسێب بۆ هەموو خەڵکی « ئێران » بە « شیعە، سوننە، کورد، عەرەب، بلووژ، توورکمان ... »وە بکرێ. ئێستەش، « کۆماری ئیسلامیی ئێران »، کاتێ بەهێزدەبێ، کاتێ دەستی بیانیی لە دەستێوەردانی نێوخۆ دەبڕێ، کە ڕێزی هەموو گەلەکان بگرێ. تا هەموو گەلەکان هەستبکەن، ئەو دەوڵەتە هی خۆیانە، بوونی خۆیان و بەشی خۆیانی تێدا ببیننەوە.
ـ ئەوە ساڵی چەندبوو؟
ئەم ساڵ بوو. دیارە، هێندێ لە برایانی خۆمان، تێبینییان هەبوو و گوتیان: ئەوە، جۆرێ لە دەستێوەردانی، کاری نێوخۆی ئەوان بوو. بەڵام، برادەرانی « کۆماری ئیسلامیی ئێران »، دوای ئەوەی بینیمنەوە، گوتیان: زۆرمان پێ خۆشبوو. چونکە، قسەکە ڕاست و ڕەوا بوو.
جا ئێمە، پێشتر لەگەڵ برایانی « حەماس » دانیشتووین و لەو بارەیەوە قسەمانکردووە. یا بۆ نموونە: بە برایانی « یەکگرتووی ئیسلامیی »مان گوتووە: قسە لەگەڵ برایانی « ئەخوان » بکەن. ئەوەبوو، کاتی خۆی، برایانی « یەکگرتوو » لە « تووركیا »، لەگەڵ پارتی « ڕەفاە » پێکەوە دانیشتبوون. پێمان گوتن، پێیان بڵێن: ئێوە بۆچی، کارێکی وا دەکەن، خەڵکەکە هەمووی، دوای « P.K.K. » بکەوێ، لە کاتێکدا؟ ئەوان خۆیان دەڵێن: ئێمە، پارتێکی « مارکسیی ـ لینین »ین؟ ئێوە کارێکی وا بکەن، خەڵک هەمووی دوای ئێوە بکەوێ. داکۆکیی، لە مافەکانی گەلی کورد بکەن، بۆ تەنیا هەر دەبێ، لە بەر دڵڕاگرتنی چوار « توورک »ی دەمارگیر، ئەو هەموو « 15 - 20 » میلیۆن کوردە، بکەنە ناحەزی خۆتان؟
لە بەرنامەشماندا هەیە، پتر کار بۆ ئەو کێشەیە بکەین. کاک « عەبدوڵلا ئۆجەلان » و برادەرانی « P.K.K. » زۆر جار، باسی ئەوە دەکەن و دەڵێن: دەبێ، خەڵکی « خۆرهەڵاتی نێوەند » و هەموو گەلەکان یەکگرن. بەڵام، پێم وایە، دەبێ، خاڵی هاوبەش بدۆزرێتەوە. چونکە، لە ژێر ئاڵای « مارکسیزم ـ لینینیزم »دا، گەلانی « ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست » کۆ نابنەوە. بەڵکوو دەبێ، خاڵێکی هاوبەشی بەهێز بدۆزرێتەوە. ئەو خاڵە هاوبەشە چییە، کە گەلانی « کورد، عەرەب، توورک و فارس » پێکەوە گرێدەدا و بە هۆیەوە، ڕێز لە یەکدی دەگرن؟ وەک برا، لە یەکدی دەڕوانن، هیچیشیان بۆیان نەبێ، بڵێن: من بە سەر تۆوە کوێخام؟ پێم وایە، ئەوە تەنیا هەر ئیسلامە!

پ60 : پێشتر، باسی ئازادییمان کرد. خەڵک، لە سایەی دەوڵەتی ئیسلامییدا، بۆی هەیە، گاووریش بێ، باوەڕی بە خوا نەبێ. وا نییە؟
و60 : بەڵێ.
ـــ کەواتە: چۆن لە ئازادیی، تاکی کورد دەڕوانی؟ بۆ نموونە: ئێوە، لە نێوچەی هاوینەهەواری « ئەحمەاوا » دەژین. خەڵک، بۆ ئەم ناوە نایە و وازی لە سەیرانی ئێرە هێناوە. ئەوە شتێکە، خەڵکیی زۆر باسیدەکەن. لەبەرچی نایەن؟ لەبەرئەوەی، خەڵک وا هەستدەکەن، ئازادیی نییە. ژنان دەبێ، لەچک ببەستن. ئەو پیاوانەی دەخۆنەوە، لێرە نابێ، بخۆنەوە. پێتان وا نییە، ئێوە ئازادیی خەڵکتان زەوتکردووە؟
لە ئیسلامدا، ئازادیی چوارچێوەی تایبەتیی بۆ دانراوە. لە هەموو بیر و فەلسەفەیەکیشدا، چوارچێوەی خۆی هەیە. لە سیستێمە دانراوەکاندا دەڵێ: ئازادیی تۆ، لەو شوێنە کۆتاییدێ، کە مافی خەڵک دەسپێدەکا.
ئێمە وا ناڵێین. بەڵکوو دەڵێین: ئەو سنوورە دیار نییە، سنوورێکی ئەندێشەییە. نازانین، ئازادیی ئەو لە کوێ دەسپێدەکا و هی تۆش، لە کوێ کۆتاییدێ. « شەرع » بڕیوێتییەوە. ژن دەبێ، پۆشاکی وابێ. خەڵک نابێ، بخواتەوە. بۆ؟ چونکە، ژیریی لادەبا. مرۆ، بە ژیریی لە ئاژەڵ جیا دەکرێتەوە. ئەو شتەی، ئەو لە ئاژەڵ جیادەکاتەوە، مرۆ نابێ، بە دەسی خۆی لایبەرێ. ئەوە خوای پەروەردگار بڕیوێتییەوە. (انما الخمر و الميسر و الانصاب و الازلام رجس من عمل الشيطان فاجتنبوه.) ئەها، چۆن لێرەدا، ئیسلام و دیمۆکراسیی، لە یەکدی جیادەبنەوە؟! لە ئیسلامدا، خەڵک بۆی نییە، دەسکاریی سنووری بکا، کە خوا کێشاوێتی. چونکە، خوا چاکتر دەزانێ، چی بۆ بەندەکانی خۆی باشە. بەڵام، جگە لە ئیسلام، خەڵک بۆ خۆی ئازادە، چی دەکا. گەر خۆی گێلکرد، گەر ئابڕووی خۆی برد، « حاشا! » گەر هەر خراپەیەکی دیکەی کرد، ئەوە بۆ خۆی ئازادە. ئیسلام، نەک هەر دەڵێ: بۆت نییە، ئازادیی لە خەڵک تێکدەی، مافی خەڵک بخۆی، بەڵکوو، بۆشت نییە، هی خۆشت تێکدەی. لە ئیسلامدا، خۆکوشتن و خواردنی پیس قەدەغەیە. چونکە، زیان لە خۆت دەدەی. پارەی خۆت بسووتێنی و بە خۆڕایی، بە هەدەری بدەی، قەدەغەیە. چونکە دەڵێ: ئەوە « نیعمەت »ێکی خوایە، « ئەمانەت »ێکە لە دەس تۆ دایە. نەک هەر بۆت نییە، هی خەڵک بفەوتێنی، بەڵکوو، بۆت نییە، هی خۆشت بفەوتێنی.

جـا، لەبەرئەوە، هەر کـەسێ دێ بۆ ئێـرە، گەر بە ڕەوشـتـی ئیـسـلامـیی و سنووری « شـەرعـیی »یەکـانەوە پابەندبێ، ئەوا ئێـمـە، لە خـزمـەت داین. بەڵام، هەر کـەسێ بیەوێ، قەدەغەکـان بشکێنێ، ڕەوشتی « شـەرعیی » و پرینسیپەکـانی ئیسـلامیی ڕەچاو نەکـا، هێندەی ئەو کـەمە دەسـەڵاتەمـان هەیە، پێمان خۆشە، ڕێزی لێ بگرێ!

لەو ڕێککەوتننامەیەی، لەگەڵ برادەرانی « یەکێتیی »شدا ئیمزامانکردووە، بۆ ئاگـاداریی بەڕێزت، خـاڵێکی وای تێدا هـەیە، دەڵێ: لەو ناوچانەی، لە ژێر دەسـەڵاتی ئێـمـە دان، دەبێ، ڕەوشـتـی « شـەرعـیی » ڕەچاوکـرێ. بەو واتایە: شتێ نەکرێ، لەگەڵ ڕەوشتی ئیسلامییدا نەگونجێ. بۆ نموونە: بۆ دەبێ، کـابرا لە بازاڕ بخواتەوە و ئەو خـەڵکە ئیـسـلامـییەش، هەمـوویان لەوێ بن؟ جـا بـاشـە، بۆ ئەو، ئەوە بـە ئازادیی دابنێ؟ واتە: ئـەوەی ئەو، بە ئازادیی دادەنێ، ئێـمـە بە سـووکـایەتیی دادەنێین. چونکە، ئەو دەتوانێ، لە ماڵی خۆیدا بخواتەوە. بۆ هـەر دەبێ، لە بازاڕ بخواتەوە؟!!

ـــــ من، مـەبەسـتـم یەک شـتـە. ئەویش ئەوەیە: ئەو ناوچـەیـەی، لە ژێر دەسـەڵاتی ئێـوە دایە، کـۆنتـرۆڵتـانکـردووە، پاوەنتـانکردووە، دەبێ، ئەو خەڵکەی تێیدا دەژی، یا، ئەو خەڵکەی بـۆی دێ، بەو شێوەیە هەڵسوکەتبکا و بژی، کە لەگەڵ دابونەریتی ئێوەدا دەگونجێ، ئەویش، دابونـەریتی ئایینی ئیسلامە. وا نییە؟

ئێـمـە، لەم ناوچەیە داین. لە هەر ناوچـەیەکی دیکەش بین، گـەر بزانین، خـەڵکەکەی لەگەڵمان دەبن، وەک دەسـەڵاتێکی « شـەرعیی »، دەسـەڵاتمان دەبێ، واتە: خەڵکەکە، گەلەکە وایان دەوێ، جـەماوەر داوادەکا، ئەو شـتـانە نەبێ، بڵێین: سبەینێ، لە هـەموو « کوردستـان »دا، دەسەڵات پەیدادەکەین، بە دڵنیایی نایەڵین، خواردنەوە لە بازاڕ بفرۆشرێ.

ـــ وەک لە دەوڵەتی ئیسلامیی « ئێران »دا پێڕەودەکرێ.

ئێـمـە نـایەڵین، شـتی بێ بەندوباریی بکرێ. نایەڵین، شـتـی نا« شـەرعـیی » بکرێ. ژن بێ بۆ بازاڕ، دەبێ، پۆشـاکی ئیسلامـیی لەبەرکا. ناشڵێین: وەک « طالیبـان » دەکـەین. چونکە شـاردنەوەی دەمـوچاوی ژن پێویست نییە. بۆیە بە پیاو گـوتراوە، « نەزەری حـەرام » مەکە! ئـەوە سەختگیرییەکی بێ جێیە. ئەوەی ئافرەت پەچەدابداتەوە، زۆربەی جەماوەری زانایانی ئیسلام پێیان وایە، دەموچاوی ئافرەت و دەسـی « عەورەت » نییە.

پێشمان وایە، ئافرەتێ بیەوێ، هەر چالاکییەک ئەنجامدا، گەر خۆی داپۆشێ، خۆداپۆشین، ڕێی هیچ کارێکی لێ ناگرێ. پاشان، لە کۆمەڵگەی ئیسلامییدا، لە ژێر دەسەڵاتێکی ئیسلامییدا، ئیسلام پێی خۆش نییە، ژن بێتە بازاڕ و مێیایەتیی خۆی بەرجەستەکا و دەرخا. چونکە، ئەوە دەماری شەڕ، لە خەڵکدا دەجوڵێنێ. ئێمە، گەر ئەوە ئازادییشبێ، گەر ئەو بە ئازادییش لێکیبداتەوە، لە پێناوی بەرژەوەندیی گشتییدا، ئەوەندە ئازادییەی لێ دەگرینەوە. چونکە، هەر ژنێ دەتوانێ، بۆ مێردی خۆی، خۆی ڕووتوقووتکاتەوە. بەڵام، بۆچی دەبێ، لە بازاڕ، سەرنجی خەڵک، بە لای خۆیدا ڕاکێشێ؟ پێمان وایە، ئەو ژنە، هیچ پەکی لە سەر ئەوە نەکەوتووە، زیانیش لە کۆمەڵگە و دەووروبەرەکەی دەدا.

— جا لێرەدا، دوو شتی گرنگ هەیە:

1. هەموو تاکێ، لەم گەردوونەدا، کاتێ، خوای گەورە درووستیکردووە، ئازادە، لەوەی چی دەکا، هەڵە یا چاکە دەکا، کاری خراپە یا باشە دەکا. چونکە، وەک پێشتر خۆت فەرمووت: ژیانی سەر زەویی، وەک تاقیکردنەوە وایە. لەو تاقیکردنەوەیەدا، کێ دەردەچێ و کێ دەر ناچێ، هەر کەسە خۆی هەڵیدەبژێرێ. هیچ کەسێکیش لە سەر زەویی، جێنشینی خوا نییە، تا لێپرسینەوە لەگەڵ مرۆدا بکا و لە ئازادیی کەمکاتەوە، بیگرێ و لێیدا، یا بیکوژێ. بۆ؟ چونکە، چاک یا خراپ بکا، پەروەردگارێ هەیە، لە ڕۆژی زیندووبوونەوەدا، نامەی کرداری چاکە و خراپەی خۆی، دەداتە دەس و تۆڵەی لێ دەکاتەوە.

2. لە کۆمەڵگە ئیسلامییەکاندا، گوشار لە سەر خەڵکی دیکە دادەنرێ، بۆ ئەوەی، کاری خراپە نەکەن. کەچیی دەبینین: لە بنەوە هەر دەیکەن.

ڕاستە.

— کەواتە، چۆن دەتوانی، چارەسەری ئەم گرفتانە بکەی؟

یەکەم ـ ئەوەیان کە خوای پەروەردگار، لە ڕۆژی زیندووبوونەوەدا، لێپرسینەوە، لەگەڵ بەندەکانی خۆیدا دەکا، سزایاندەدا، ئەوە ڕاستە. چونکە، « حساب و کیتاب »ی تەواو، تەنیا هەر لای خوای پەروەردگارە و لە دواڕۆژ دایە. بەڵام، هەر ئەو خوا پەروەردگارەی فەرموویەتی: من، لە دواڕۆژدا، حسابی تەواو، لەگەڵ بەندەکانم دەکەم. هەر ئەویش فەرموویەتی: ئەی بەندەکانم! کۆمەڵگەیەک بڕەخسێنن، « دزیی، زۆرداریی،

دەسـدرێژیی، کـەرەسـەی بێ هۆشکەر و سـەرخۆشکەر »ی تێدا نەبێ. پۆشـاکی ئافرەتان وابێ. خەڵک بەو شـێوەیە ڕەفتـاربکا. ڕێزی یەکدی بگرن. سڵاو لە یەکدی بکەن. هەر ئەو پەروەردگارە فەرموویەتی: وا بکەن. کەواتە: ئەوە ناکۆکیی نییە، کە خوا لە ڕۆژی زیندووبوونەوەدا، « حساب و کیتـاب »، لەگەڵ بەندەکانی خۆیدا دەکا و پاداشـتیاندەداتەوە. واتە: ئێمـە تێڕابیینین، خەڵک چۆنیان پێ خۆشە، وا بکەن!
ئینجـا، گەر سـەیری هـەر کۆمەڵگەیەکی ڕۆژاواییش بکەین، کە بانگەشـەی دیمـۆکـراسیی و هـەر شـتێکی دیکەش دەکەن، کـەچیی، تەمـاشـادەکەین، هەموو گەلێ، کۆمەڵە بەهایەکی تایبەتیی خۆیان هەیە و پێیەوە پابەندن.
من، نموونەیەکت بۆ دێنمـەوە: « ڕۆجیە غارۆدیی » لە « فرەنسـە »، لە سەر پەرتووکی « الاساطير المؤسسه للحكومه الاسرائيليه »، میریی سزایدا.
ئەو پەرتووکەم لایە. لەبەرئەوەی، ئەوەی پێی دەڵێن« هۆلۆکۆست »، واتە: جینۆسـایدی شـەش میلیۆن « جوو »، ئەو نکوولیی لێ کرد. نووسـیوێتی: هێندە نەبووە. بۆ نموونە: گـوتوویەتی: دوو بۆ سێ مـیلیۆن بـووە و شـەش میلیۆن نەبووە. بەڵام، « جوو »ەکان، بۆیە گەورەیانکردووە، تا، خۆیان زۆر بە زۆرلێکراو پیشـاندەن. دواییش، زیانەکانیان بۆ قـــــەرەبووکرێتەوە و « فلەسـتین » داگیرکەن. لە سەر ئەوە، کە هەمووشی بە بەڵگەی زانستانە هێناوەتەوە، میریی « فرەنسە » سزایاندا. چونکە، یەکێ لەو شتـانەی، بە بەهای « فرەنسیی » دادەنرێ، ئەوەیە: باوەڕیـان بە « هۆلۆکۆست » هەیە، باوەڕیان بەوە هەیە، ئەو شتە دژی « جوو »ەکان کراوە. گوتیان: تۆ شتێک گوتووە، پێچەوانەی ڕۆشنبیریی و بەهاکانی ئێمەیە. لەبەرئەوە، سزایاندا. نازانم، دووسەد هەزار دۆلار بوو، چەن بوو، لێیان سەند.
یا لەو مـــاوەیەی پێـــشـــوودا، لە « بریتـــانیـــا »، بەڕێزت ئاگـــاداری، خـــۆپیـــشـــاندانێکی گـــەورە، دژی ڕاوکـــردن کـــرا. خـــەڵکێکی دیکەش، خۆپیشـاندانێکی دیکەیان کرد. دەیانگوت: نەخێـر، دەبێ، ڕاوکردن هەر هەبێ. ڕاوی « ڕێوی » نازانم، ڕاوی « ئاسک » و ئەو شـتـانە دەبێ، هەر بکرێ. ئەوانەی دەیانگوت: ڕاوکـــردن دەبێ، هەبێ، دەیانگوت: ئەوە بەهایەکی لە مێژینەی خۆمانە و دەسبەرداری نابین. تا، چاوپێکەوتنیان لەگەڵ یەکێکدا کرد، گوتی: گەر قەدەغەشیکەن، من هەر ڕاودەکەم. ئەوە بەهایەکی گەلەکەی خۆمە!

جا، گەر چەن کۆمەڵگەیەکی وەک « فرەنسە و بریتانیا »، چەن بەهایەکیان هەبێ و خۆشیان دایاننابێ، هەر کەسێ لێیان لادا و سنوورەکەیان ببەزێنێ، سزایبدەن، ئەدی، ئێمە بۆچی بۆمان نەبێ، پارێزگاریی بەها پیرۆزەکانی خۆمان بکەین؟!!
هیچ گەلێ، بێ بەها نابێ. بەهای ئێمەش، ئایینەکەمانە. بەهاکەمان، لە ئایینەکەمانەوە، سەرچاوەی گرتووە. لەبەرئەوە، زۆر بە شتێکی ڕەوای دەزانم، زۆر بە شتێکی « شەرعیی » و لۆژیکیی دادەنێم، هەموو کەسێکیش دەبێ، لێمان بسەلمێنێ، وەک چۆن هەموو گەلێ، بەهایەکی هەیە، با خۆشی دایینابێ، ئێمەش، بۆمان هەیە، بەهایەکمان هەبێ، کە خوا بۆی ناردووین، پارێزگارییبکەین و نەشهێڵین، کەس ئەو قەدەغانە بشکێنێ. ئەوە بە ڕێژەی خاڵی یەکەمەوە بوو. ئەوەی دووەم، چیت فەرموو؟
— چۆن دەتوانی، ئەوەی بە نهێنیی دەکرێ، بەری پێ بگری و چارەسەری کەی؟ ئێستە لە « سعوودییە »، خراپەکارییەکی زۆر هەیە.
بەڵێ. دەزانم
— لە « ئێران »، کاری خراپە زۆر بڵاوە.
بەڵێ. دەزانم. کاک دوکتۆر! ڕێ لە دز ناگیرێ، گەر دز بێ، تاریکەشەو زۆرە. بەڵام، بە دڵنیاییەوە، لە لایەکەوە، کاتێ خواردنەوەیەک، لە بازاڕدا دادەنرێ، وەک ساردیی و بیبسی دەفرۆشرێ، خەڵک ئاسانتر دەسی دەکەوێ، وەک لە ئەوەی، بە قاچاغیی بۆی بگەڕێ.
لە لایەکی دیکەشەوە، ئیسلام نەهاتووە، هەر بڵێ: کاکە نابێ، خواردنەوە بفرۆشی. بەڵکوو، هاوکات لەگەڵ ئەوەشدا، ئیسلام، خەڵک تێدەگەیەنێ، لە ڕووی پزیشکییەوە، بۆی ڕووندەکاتەوە، زیانی چییە؟!!
هەڵبەتە، وەک لە « قورئان »دا هاتووە، خواردنەوە، هێندێ چاکەشی تێدا هەیە. بەڵام، خوای پەروەردگار، هەر وا بە خۆڕایی، قەدەغەی نەکردووە!
هاوکات، لەگەڵ ئەوەشدا دەبێ، بە شێوەیەکی بەردەوام، کاریشی لە سەر بکرێ. پاشان، لە پێش ئەوەشدا، خەڵک بڕوایەکی لە دڵدا دەڕسکێنرێ و پەیدادەکرێ. ئەو بڕوایەش، وای لێ دەکا، توخنی ئەو قەدەغەیە نەکەوێ.
واتە: دەبێ، پێشتر بەربەستی دەروونیی درووستکرێ. بەڵام دیارە، تەنیا هەر هاندەری دەروونیی بەس نییە، بەڵکوو دەبێ، هاندەری یاساییش هەبێ. بۆ ئەوەی، کۆمەڵگە خاوێن ڕاگیرێ.

جا، هەر کەسێ، گەر ئارەزووی لە خراپەکاریی هەیە، با، خراپەکەی خۆی بە دزییەوە بکا. بەڵام، بە لانی کەمەوە، چینی گەنج و تازەپێگەیشتوو، گەر شتی خراپ و نا« شەرعیی » نەبینن، ناچێ، بیکا و کاری تێ ناکا.
بۆ نموونە: لەوانەیە، کابرایەکی ڕیش سپی، جگەرەیەک بکێشێ، منداڵێ دەیبینێ و دەڵێ: دیارە، ئەو مامە ڕیش سپییە، جگەرەدەکێشێ، هەڵبەتە، شتێکی زۆر باشە، با، منیش بیکێشم. گەر بە دزییەوە، جگەرەکە بکێشێ، ئەوا من دەڵێم: بەر چاوی منداڵەکە ناکەوێ. واتە: چاولێکردن و بینینی خراپە، خۆی لە خۆیدا، ڕەواج بەو کارە دەدا.*
یەک شت ماوە، بیڵێم. پێشتر، لە بیرمچوو، باسیکەم. بێ گومان، لەم نێوچەیە، « ئەحماوا و سەرچاوەی زەڵم » سەرکردایەتییمانی لێ هەیە. واتە: هێندێ پارێزیشدەکرێ و ماوە نادرێ، پشێویی لێرە ڕوویدا. ئەوە جگە لەوەی دەبێ، ڕەوشتی ئیسلامیی ڕەچاوکرێ، هێندێ شتی دیکەش هەیە، بۆ ڕەوشی ئاساییشی سەرکردایەتییمان دەگەڕێتەوە.
هەڵبەتە، بەڕێزیشت ئاگاداری، ئێستە « مام جەلال » لە « قەڵاچوالان » و کاک « مەسعوود » لە « سەریرەش » دادەنیشن، نێوچەی « بارزان » و زۆر شوێنی دیکەشیان هەیە، " بە پێکەنینەوە " نایەڵن، چۆلەکەشی بە سەردا بفڕێ!
— وردەوردە، وای لێدێ، « کوردستان » هەمووی قەدەغەدەکرێ!
" بە پێکەنینەوە " جا، بە هەر شێوەیە بێ، مەبەستم ئەوەیە.
— تا ژمارەی پارتەکان زۆربێ، هەر وای لێدێ!
بە ڕاستیی، ئێمە تا ئێستە، لە ڕووی ئاساییشەوە، ڕامانگەیاندووە و بڵاومانکردۆتەوە، چەکدار نەچێتە ئەو ناوانە. بەڵام، ئەوەی دیکەی هەیە، ڕەوشی کۆمەڵایەتیی دەبێ، ڕەچاوکرێ، ئەو ئافرەتەی دێ، پۆشاکی ئیسلامیی لەبەردابێ، ئەو پیاوانەی دێن، بە شێوەیەکی ناشیرین نەخۆنەوە! چونکە، بە مافێکی « شەرعیی » خۆمانی دەزانین، لە پەنای ئێمەدا، بۆنی « عەرەق »مان بۆ نەیەت!

---

* ئەم نموونەیەی لێرەدا، مامۆستا هێناویتییەوە، زۆر ڕاستە. تەنانەت، لە وڵاتێکی وەک « سوید »یشدا، لە خوێندنگەکاندا، مامۆستا بۆی نییە، بە ئاشکرا و لە بەر چاوی خوێندکارەکان، جگەرە بکێشێ، بەڵکوو، شوێنی تایبەتیی خۆیان هەیە!

ـــ واتە: ئەوەی بە دزییەوە بخواتەوە، قەیناکە؟!
لە کوێ؟ لە ماڵی خۆی قەیناکە.
ـــ وامزانی، لە سەرچاوەی « زەڵم » دەڵێی!
" بە پێکەنینەوە " نا، نا. جا گەر لە سەرچاوەکە بێ،

پ61 : حەزمکرد، چەن پرسیارێکی تایبەتییش بکەم. ریشهێشتنەوە، لە کەلتووری رێکخراوە ئیسلامییەکاندا، چی دەگەیەنێ؟
و61 : ریش یەکێ بووە، لە « سوونەت »ەکانی پەیامبەر « د.خ. » واتە: لە ئەو شتانەبووە، پەیامبەری خوا و هاوەڵانی بەرێزی کردوویانە. لە رێکخراوە ئیسلامییەکاندا، بە یەکێ لە نیشانە و رووخسارەکانی، کەسێتیی موسوڵمان دادەنرێ. وەک چۆن، سەرپۆش بۆ ئافرەت دانراوە و یەکێ لە نیشانەکانی، کەسێتیی ئافرەتێکی موسوڵمان دەردەخا.
بەڵام وەنەبێ، خەڵکێ لە ئیسلام تێگەیشتبێ، ئەوی ریشی نەبێ، وای لێکبداتەوە، کەموکورییەک لە ئایینەکەیدا هەیە. بەڵکوو، تەنیا یەکێ لە « سوونەت »ەکانی جێبەجێ نەکردووە. جا، یەکێ لە « سوونەت »ەکان، چ بەو واتایەی پێویستە هەبێ، چ بەو واتایەی خێری دەگا، گەر هەیبێ. بەڵام، گەر نەیبێ، گوناهبار نییە. چونکە، « سوونەت » ئەو دوو واتایەی هەیە.
واتە: « سوونەت »، لای زاناکانی ئیسلام، بە واتای ئەوە دێ، ئەو شتەی پەیامبەر « د.خ. » کردوویەتی. لەوانەیە، پێویستە. واتە: گەر نەیکەی، گوناهبار دەبی. هەشیانە « مەندووب »ە. واتە: گەر بیکەی، خێرت دەگا، بەڵام گەر نەیکەی، گوناهت ناگا.
ئێمە، وەک رێکخستنەکانیش، یا بۆ کاتی ناچاریی، جاری وا هەیە، پێویستدەبێ، ریش نەبێ. بۆ ئەوەی، لە دوورەوە دیار نەبین و ئاشکرا نەبین.
ـــ وەک ئەوەی، ئەورۆ لە رێ، بە سەر ئێمە هات!

پ62 : زمانی کوردیی، یەزدان درووستیکردووە. ئێوە بەو شێوەیە، بە کوردیی « شەوباش، رۆژباش ... » لە یەکدی ناکەن، بەڵکوو، تەنیا هەر بە « سەلام و عەلەیک » دەدوێن. بۆ؟*

و62 : « مەسەلە »ی « ڕۆژباش و شەوباش »، بەکارهێنانی نا« شەرعیی » نییە. بەڵام، شتێکی بێ نێوەڕۆکە. چونکە، « شەو » و « ڕۆژ »، چاک و خراپ نابن. ئەوە مرۆڤەکان و کردەوە و ڕەفتارەکانیانن، کە چاک و خراپ دەبن. ئەگینا « کات » تووڕەکەیەکە، چی تێکەی، بڕیاری ئەوە وەردەگرێ، چ چاک، چ خراپ! بەڵام، « سەلامکردن » کە مەرج نییە، بە عارەبییش بێ، هەر چەندە، ئەو شتانەی بوونەتە درووشمی موسوڵمانان، وەک: « بانگ و سەلام و ... هتد » ئاساییە، گەر بە عارەبییش بن. سەلامکردنیش، فەلسەفە و « حیکمەت »ی زۆر گرتۆتە خۆ، بە کورتیی: « السلام علیکم و رحمە الله »، هەم ڕاگەیاندنی هەڵوێستی ئاشتییخوازانەیە، هەم پاڕانەوە و نزایە، کە خوا بـــەزەیی و پێز، بە سەر لایەنی بەرانبەردا بڕێژێ. هەم « مەسەلە »کە، ڕوو لە مرۆڤ دەکا، کە بەرەو ئاشتیی، سەلامەتیی، بەزەیی و پێز بچێ ...

پ63 : ناوی براکانی خۆتان، لە « کوردیی »یەوە بۆ « عەرەبیی » گۆڕیوە. بۆ نموونە: « سەروەت »# بووە بە « زوبێر ». ئەوە گەورەکان. جا، مناڵە ساواکانی لەدایکدەبن، ئەوە هەر لە سەر بێشکەوە، بە « عەرەبیی » ناویان دەنێن. بۆ؟ ئایا بە « کوردیی » دوان، یا بە « کوردیی » ناونان، هەڵەیەکی تێدا هەیە؟ گوناهە؟ ئایا پێویست نییە، زمانەکەمان بپارێزین و گەشەی پێ بدەین؟*

بە ڕاستیی، گەر بە دەس من بووایە، « نوێژ، قورئان و فەرموودەکانی پەیامبەر »یشم دەکرد بە کوردیی! جا نازانم، بەڕێزت لەو بارەیەوە، چی دەڵێی؟ چونکە، گەر وا بڕوا، لە نێوچەی ژێر دەسەڵاتی ئێوە و لە ڕیزی پارتە ئیسلامییەکاندا، وردەوردە، ناوی « کوردیی » و سڵاو لە یەکدی کردنیش، بە « کوردیی » نامێنێ!

---

* هەر دوو پرسیاری « 62 و 63 »، ڕۆژی « 2002. 10. 08 »، لە « سولەیمانیی » و بە نامە، ئاراستەی ماموستا کراون. هەروەها، وەڵامەکانیشیان ڕۆژی « 14 .10 .02 »، هەر بە نامە وەرگیراونەتەوە. وەک خۆیان بڵاوکردونەتەوە، بەڵام شێوازەکەیم گۆڕیوە.

# لە ڕاستییدا، ناوی « سەروەت »، لە « ثەروەت »ی عەرەبییەوە وەرگیراوە. بەڵام، تازە ئەم ناوە کوردێنراوە و بەرانبەرەکەشی بە کوردیی « سامان »ە.

و63 : بۆ ناوەکـان، ئێـمـە، هەر دوو لا کـوردیی و عـەرەبیی بەکـاردێنین. کوردییەکە، وەک شێوەی نەتەوەییمان و عەرەبییەکانیش، وەک دروشمی مـوسـوڵمـانێـتـیـیـمـان. بۆ وێنە: نـاوی منداڵەکـانی بەندە بە ڕیز، لە ڕووی تەمەنەوە: « بەسۆز، پیرۆز - کچن - موحـەممەد، عەبدولڕەحمـان، فـاتیمـە، شادیی - کوڕ - یوسرا - کچ - مەلا شەریف، شوان، شاسوار ».
ئینجـا، وەک چۆن، جاری وا هەیە، ناوی کوردیی گۆڕاون بۆ عەرەبیی، کە کـاتی خـۆی، زیاتر بۆ لایەنـی « ئەمنیی » بووە، هـی عـەرەبییش گـۆڕان بۆ کوردیی، وەک: « عومەر: هەڵۆ، ئەحمەد: بڕوا، حەسەن: شوان ... »

پ64 : بە باوەڕی خـۆت، سنووری « باشووری کوردستـان »، چۆن دیاریی دەکەی؟ لە کوێوە دەسپێدەکا؟ لە کوێدا کۆتاییدێ؟*
و64 : وەڵلاییی، دیارە، من زۆر بە وردیی، گـوند و شـارەکـان شـارەزا نیم. بەڵام، ئەوەی ئێستـە هەیە، لە بەر دەسـی ئێـمـە دایە و ئازادە، بێ گـومـان، هەموو ئەو « کوردستان »ە نییە، ئەو نەخشەیەی بڵێی، کێشراوە.
ـ باوەڕت بەو نەخشەیە هەیە؟
بەڵێ. دیارە، ئەو نەخـشـەیە، لە سـەر بنچـینەی ئەوە دانراوە، کـاتێ سـەرژمێـرکـراوە، هەر شـوێنێ، زۆربەی کـورد بووە، بە « کـوردسـتـان » دانراوە. ئەوە، ئەو کـاتە، نەک ئێستـە. چونکە، ئێستـە ڕژێمی « بەعس » دەچێ، خـەڵک ڕادەگـوێزێ، سـبـەینێ، « کـەرکـووک »یش وا لێ بکا. بۆ نموونە: کاتی خۆی لە سەرژمێری « 1957 »دا، کورد زۆر زیاتربووە.
ـ نێوەڕۆکی پرسیارەکە خۆی ئەوەیە.
گریمان ئێستـە، ڕژێمی « بەعس » وا بکا، کورد بە کەمـینە دانێ، واتای ئەوە نییە، کورد ئەو مافە لە دەسدەدا. چونکە، کـاتی خـۆی، پێش ئەوەی، ڕژێم ئەوە بکا، ئەو زۆرداریی و ستەمـە بنوێنێ، « کوردستـان » بـە عەرەب بکا، وا نەبووە.
ـ مەبەستی سـەرەکی ئەم پرسیارە ئەوەیە: ڕۆژی « 2002. 10. 02 »، « طاریق عەزیز »ی جێگری سەرۆک شالیارانی« عێراق »، چاوپێکەوتنێکی لەگـەڵ تۆڕی تێلێـفـیـزیۆنی « CNN »ی « توورکـیـا »دا کـردووە. لەو چاوپێکەوتنەدا گوتوویەتی: کـورد خـەڵکێکن، لادێیین، شـارسـتـانیی نین. ناتوانن، ژیانی خـۆیان ڕێکخـەن و پەرلەمـان بەڕێوەبەرن. ئەمـانە، وەک

منالێکی پچکۆلانە وان. پەرلەمانیش، بە دەس ئەم لادێییانەوە، وەک بووکە شووشەیەک وایە و یاریی پێ دەکەن. ژمارەی « کورد، توورکمان و ئاشووریی » لە « عێراق »دا لە سێ میلیۆن پتر نییە.
پاشان، باسی « کەرکووک »ی کردووە و گوتوویەتی: ئەوە خەونێکە، کورد بە « کەرکووک »ەوە دەیبینێ. چونکە، لە پرۆژەکەی « پارتیی و یەکێتیی » بۆ « فیدراڵیی » تێیدا هەیە، کە بۆم باسکردی، « کەرکووک »یان بە پێتەختی « کوردستان » داناوە. واتە: گەر سبەینێ، « کەرکووک »مان بۆ ساغبێتەوە، دەبێ، پێتەختی هەرێمی « کوردستان »، لە « هەولێر »ەوە بۆ « کەرکووک » بگوێزینەوە.
هەروەها گوتوویشێتی: تا دوا هەناسەمان، ئامادەین، داکۆکیی لە پارێزگەی « کەرکووک » بکەین. چونکە « کەرکووک »، « کوردستان » نییە.
لە ئەوێوە ئەو شتەم هێناوە. تۆ دەڵێی چی؟#
بە پێکەنینەوە، وەڵڵا، جا دیارە، ئەو قسانە هەر بۆ خۆیان
ــ واتە: ئێمە لادێیین؟
دیارن، کە لە بیر و بۆچوونێکی شۆڤێنیانەوە هەڵقووڵاون. ئینجا، هەر ئەو گیانی دیکتاتۆرییە بووە، ئەو بەڵایەی بە سەر هێناون و بە دەسییەوە دەناڵێنن، ئەو گیانەیان بووە، بۆیە، ئەو قسانەی پێ کردوون و کارویاریان وایە.
خۆت ئاگاداری، « کوردستان » لە مێژە کاری لە سەر دەکرێ. بەڵام، بە ئاشکرا دیارە، نەک هەر پارێزگەی « کەرکووک »، بەڵکوو ئەو لای پارێزگەی « کەرکووک »یش، کاتی خۆی، پێش ئەوەی رژێمی « بەعس »، دەس بە سەر دەسەڵاتدا بگرێ، پێش ئەوەی ئەوان بێن، بێ گومان زۆربەی کوردنشین بوون. هەمووو ئەو شوێنانەی، پێش ئەوەی « بەعس »، دەسکاریی باری جوگرافیا و دیمۆگرافیای نێوچەکان بکا، زۆربەی کورد بوون.
لە راستییدا، لە رووی « شەرعیی »یەوە، مافی خۆمانە، گەر کرا بە نێوچەیەکی « فیدراڵ »، هەرێمێ، ئەوا، ئەو هەرێمە، لە کوێ زیاتر زۆربەی کورد بوو، سنوورەکەی لەوێدا دیارییکرێ!
ــ مامۆستا! من هیچی دیکەم نەماوە. جا گەر بەرێزت، شتێکی دیکەت هەیە، فەرموو.

وەڵڵا، من سوپاستدەکەم. پێم وایە، بەڕێزت پرسیاری زۆرت کرد. هیوام وایە، منیش وام وەڵامدابێتەوە، نیشانم پێکابێ، شتێکم نەگوتبێ، پێچەوانەی « شەرع » و ڕەوا بێ، لە ڕووی باوەڕی خۆمەوە قسەمکردووە.
من سوپاسی بەڕێزت دەکەم. دیارە، بەڕێزت لە « سوید »ەوە گەڕاویتەوە، ئینجا، لەوێوە ئەرکتکێشاوە و هاتووی، ئەو هاتنەی بەڕێزت لای ئێمە، جێی پێزانین و ڕێزە. ئەو شەونخوونییەی، لەگەڵ ئێمەدا دەیکێشی، لەوانەیە، ئێمە زیاتر لە تۆ ڕاهاتبین. ڕێزمان بۆ ئەو هەڵوێستەی بەڕێزت هەیە. هیوادارێشم، گەر بەڕێزت بڵاوتکردەوە، بە دەسپاکیی بڵاویکەیتەوە، خۆت ئاسا، پێم وایە، « ئەهلی ئەمانەت »بی!
ــ بەڵێ. لە کۆتاییدا، منیش زۆر زۆر سوپاستدەکەم، کاتێکی خۆشبوو، یەکدیمان ناسی. سوپاسی میوانداریتان دەکەم. داوای لێبووردن دەکەم، ماندوومکردن. هەروەها، هەر دووکیشمان دەبێ، سوپاسی کاک « کاوە پێنجوێن »ی بکەین، کە ئەم دانیشتن و یەکدی ناسینەی ڕێکخست.
وەڵڵا، من بەشە سوپاسەکەی ئەویش، هەر ئاراستەی بەڕێزت دەکەم.
ــ جارێکی دیکەش، زۆر سوپاس بۆ هەموو شتێ. هیوادارم، برایەتییمان هەر بەردەوامبێ.
بە تەمای خوا!

---

* ئەم پرسیارەم بۆیە کرد، تەنیا هەر ویستم، لە کۆتایی ئەم چاوپێکەوتنەدا، ئەو قسە هیچ و پووچانەی دوژمنێکی سەرسەخت و گەورەی وەک « طاریق عەزیز »، بۆ مێژوو تۆمارکەم. بۆ ئەوەی، ڕۆڵەکانی نەتەوەکەم، لە هەموو کاتێکدا بزانن، ئەو بەکرێگیراوەی « بەعس »، کە بە یەکێ لە ڕووناکبیر و دیبلۆماتەکانی عەرەب ناسراوە، چ جۆرە سوکایەتییەکی، بە کورد کردووە! دەقەکەشی بە زمانی « عەرەبیی »، لە کۆتاییدا تۆمارکراوە.

# کورد لە مێژە گوتوویەتی: قسە هەژارە، هەموو کەس پێی دەوێرێ! ئەو پیاوە لەخۆباییبووە و پارت و دەوڵەتەکەشی، نەک هەر نەیانتوانی، داکۆکیی لە « کەرکووک » بکەن، بەڵکوو، هەموو « عێراق »یشیان دۆڕاند، هەموو ئاوات و ئامانجە شۆڤێنیستییەکانیشیان، وەک بلقی سەر ئاو تەقین و نەمان! بەڵام، بە داخێکی زۆرەوە، تا ئەمڕۆش، کێشەی « کەرکووک » و نیوچە بەعەرەبکراوەکانی « کوردستان »، هێشتا بە تەواویی، چارەسەر نەکراوە. لەوە دەچێ، دەسەڵاتدارانی نوێی عەرەب، لە سەر ڕێوشوێنی ئاغاکانی پێشوویان بڕۆن، بۆیە، دان بە « کوردستان »ێتیی « کەرکووک »دا نانێن!

# پاشـــــــــكۆكان

«1»

دەقی چاوپێکەوتنەکە، لە پێشدا، لە وێزگەی « ئەلعراق ئەلحور »، کاژێری حــەوتی ئێــوارەی ڕۆژی چوارشــەممەی ڕێککەوتی « 02. 10. 2002 » بڵاوکراوەتەوە. لە بڵاوکراوەی ژمارە « 2369 »، لاپــەڕە « 4 - 5 »، ڕۆژی پێنجشــەممەی ڕێککەوتی « 03. 10. 2002 »، بەشی گوێگرتنی « یەکێتی نیشتمانیی کوردستان » وەرگیراوە.
بەڵام لێرەدا، هێندەی قسـەکانی « طاریق عەزیز »، پێوەندیی بە کوردەوە هەبێ، هەر هێندەی لێ دەگوێزمەوە.

قال عزيز ( ... و طالب تركيا بالوقوف الى جانب جارتها العراق و اكد عدم تسامح العراق مع الذين يحاولون تجزئته و تاسيس الدوله الكرديه في شمال البلاد، مؤكدا على انه بوسع الجيش العراقي حمايه وحده الاراضي العراقيه.
و من ناحيه ثانيه و ردا على سؤال كيف تقيمون العلاقات بين الحكومه التركيه و بين زعيم الحزب الديمقراطي الكردستاني مسعود بارزاني رد قائلا: " لنا علاقات جيده مع الحزب الديمقراطي الكردستاني و هي علاقات سياسيه و تجاريه جيده و قد عبرت الحدود العراقيه ـــ التركيه من المنطقه الخاضعه لسيطره الحزب الديمقراطي الكردستاني، ان زعيم الحزب مسعود بارزاني يريد ان يواصل مباحثاته معنا، و لكن الاداره الامريكيه تعرقل العلاقات الثنائيه بين الاحزاب الكرديه و الحكومه العراقيه، و انا على ثقه بان امريكا تخطط لعمل عدواني يضر مصالح تركيا و العراق، و ان قيام دوله كرديه ستكون في صالح اسرائيل و امريكا و سيؤدي ذلك الى نزعه انفصاليه لاكراد تركيا ايضا ".

من جانب اخر اضاف عزيز: " لقد بدات ملامح خلافات حاده تظهر بين واشنطن و ادراه الرئيس الامريكي جورج بوش و السلطات التركيه و قيادات الاحزاب الكرديه على نحو يعزز اراء القائلين بصعوبه تحكم الولايات المتحده فيما سار الامور بعد شن الحرب المتوقعه ضد بغداد و باحتمال نشوب صراعات داخليه و دمويه في العراق اذا ما اطيح بالنظام الحالي بواسطه القوه عسكريه خارجيه " و اكد عزيز على ان الاكراد قرويون و ليسوا متحضرين و انهم لا يستطيعون اداره اى تنظيم فكيف لهم بفتح و اداره برلمان حديث و عصرى و انهم اطفال صغار و البرلمان لعبه صغيره في يد قرويون مؤكدا على ان عدد التركمان و الاشوريين و الاكراد في العراق لا يتجاوز « 3 » ملايين نسمه.

و على صعيد اخر على صعيد العلاقات بين تركيا و زعيم الحزب الديمقراطي الكردستاني حول موضوع الفيدراليه قال عزيز ان بارزاني افضل من طالباني في تقييمه للامؤر و لكن لا نعرف اسباب الخلاف بين تركيا و بارزاني و لا يهمنا ذلك لاننا لا نعترف بهم. و ان صيغه الدستور الكردى العراقي الذى يقترحانه للعراق و الذى ينص من زاويه النظر الكرديه على ان مدينه كركوك ستصبح عاصمه الاقليم الكرديه ليست سوى مجرد حلم يحلم بها الاكراد و ان الجيش العراقي مستعد للمحافظه على محافظه كركوك و ان تطلب ذلك احتكاكات مسلحه بين الجانبين الى اخر لحظه.)

* * *

## « 2 »

دەقی ئەم چاوپێکەوتنە، بە دوو زنجیرە، لە ڕۆژنامەی « کۆمەڵ »ی ژمارە « 79 - 80 »ی ڕۆژی « 05 - 12 .07 .2003 » و لە لایەن کاک « هاوژین عومەر »ەوە بڵاوکراوەتەوە. لێرەدا، بەو ڕێنووسە نووسیومەتەوە، کە خۆم باوەڕم پێی هەیە، هەڵەکانم ڕاستکردوونەتەوە و ووشە عەرەبییەکانیشم، کردووە بە کوردیی. ئەگینا، دەقی چاوپێکەوتنەکە چۆنە، هەر وەک خۆی بڵاومکردۆتەوە، گەر چیی، دارشتنەکەیم بە دڵ نییە!

**بەشێک لە سەرکەوتنی هەر کەس و گەلێک بەئاگابوونە لە مێژووی خۆی و سوودوەرگرتنە لە ئەزموونی کەسانێک کە خاوەنی مێژوویەکن، چ لە خەباتی رامیاریی یان ڕووناکبیریی یان هەر بوارێکی تر، بە تایبەت بۆ ئەم نەوە نوێیەی کە سەری لە زۆر کون و کەلەبەری مێژووی خەباتی ڕزگاریخوازی گەلەکەمان دەر ناچێت.**

**بۆ ئەم مەبەستە، بە پێویستمان زانی، دوکتۆر، حوسێن موحەممەد عەزیز، وەکوو کەسێکی ڕووناکبیر و خاوەن ئەزموون و مێژوویەک لە بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلی کورددا بدوێنین :**

پ1: کاک دوکتۆر، وەکوو ئەوەی کە تۆ بێ هیوابووی یان هەندێ شتت لە ناو لایەنە ڕامیارییەکاندا بینی، کە بڕیارتدا، واز لە کاری ڕامیاریی بهێنیت و کار لە پارتە ڕامیارییەکاندا نەکەی. ئایا، مێژووی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد، چۆن هەڵدەسەنگێنی تا قۆناغی ڕاپەڕین و دوای ڕاپەڕین؟ ئایا تێبینیی و هەڵسەنگاندنت چییە بۆ مەسەلەی کورد و بزووتنەوەی نەتەوایەتیی کورد؟

و1: ڕۆژانێکی ڕەش، باڵی کێشابوو بە سەر بزووتنەوەی نەتەوایەتییدا لە کۆتایی « 76 » و سەرەتای « 77 »دا دوای شەڕی « هەکاریی »، واتە: ئەتوانین، بڵێین: ئەوەی کە لە شۆڕشی « 11ی سێپتێمبەری1961 »، تا « 1975 » ڕوویدا، سەرکردەکانی کورد بە هەموو لایەنەکانیانەوە، هیچ سوودێکیان لەو ئەزموونە خوێناوییە وەر نەگرت. چونکە، لە « 1964 »دا، ناکۆکیی درووستبوو، لە « 1970 »دا، بەیانەکە خوێندرایەوە، یەکیانگرتەوە، شەش ساڵ، ئەمان بە پشتی هەر دوو دەوڵەتی « ئێران » و « عێراق » لەیەککران. ئەوە یەکەم. دووەم دەبووایە، لە شۆڕشی تازەماندا، ئەو ئەزموونە لەبەرچاوبگیرایە، جارێکی تر، شەڕی چەپەڵی نێوخۆ دووبارە نەبووایەتەوە، کورد، کوردی نەکوشتایە لە سەر ئایدۆلۆژیا، یان لە

سەر دەسەڵات و پارە، یان کورسیی. شتەکان لە سەر ئەمانە بووە، ئەگینا لایەکیان ناپاک نەبووە، لاکەی تریان باشبێت. هەر دووکیان، لە شاخ بوون، هەر دووکیان، داوای « ئۆتۆنۆمیی »یان بۆ کورد کردووە، هەر دووکیان، جەماوەر و خەڵکیان لەگەڵدا بووە. بەڵام، ئەوان بە داخەوە، لە ماوەی « 77 »وە بیگرە، تاکوو « بەرەی کوردستانیی » دروستبووە، کە نزیکەی « 10 » ساڵێک دەکات، هەموو ئەو هەڵە کۆنانەیان دووبارەکردەوە، ئەو پەڵەڕەشانەی کە بە نێوچەوانی بزووتنەوەی کوردایەتییەوە بوو، نەیانتوانی، بیسڕنەوە. بەڵکوو، بە پێچەوانەوە، ناشیرینتریناکرد.

لەبەرئەوە، هەزاران گەنجی وەکوو ئێمە، ئەوانەی کە لە نێو شاردا بوون، یاخود ئەوانەی پێشمەرگەش بوون، چ لای « پارتیی »، چ لای « یەکێتیی » چ لای « بزووتنەوەی ئیسلامیی »، هەتا لای پارتە پچووکەکان، ڕوویان دەکردە دەرەوە. ئەوە یەکێک لە زیانەکانی بزووتنەوەی کوردایەتیی.

من پێم وایە، هیچ سوودێکیان، لەو ئەزموونە گەورانەی شۆڕشی کورد وەر نەگرتووە، بە تایبەتیی، شۆڕشی « ئەیلوول »، وەکوو چۆلەکە سەریانبڕی. ئەزانی، هۆکەی چییە؟ لەبەرئەوەی، پاڵپشتی تەواوی، لە سەر گەلەکەی نەبوو، « قەیناکا، هیچ شۆڕشێ بەبێ یارمەتیی ناژی » بەڵام، ئەمان وا پاڵیان لێ دابووەوە، کە تا دنیادنیایە، ئەو وڵاتانە دەسیان لێ بەر نادەن. ئەوە هەڵەیەکی گەورەبوو، ئەم جارەش، دیسانەوە وامان لێهاتەوە.

ئێمە، هەلێکی زۆر گەورەمان بۆ هەڵکەوت، هەلی جەنگی نێوان « عێراق » و « ئێران ». ئێمە، لە جیاتی ئەوەی، بێ لایەن بین، کە دوو دەوڵەتی داگیرکەر لە یەکتریان دەدا، بەڵام، بە پێچەوانەوەبوو. ئەمە زیانێکی زۆری لێداین. ئەمە هەمووی، لای میرییەکی فاشیی وەک « صەددام »، کەڵەکە بووبوو، کە لەگەڵ دەسی لە جەنگەکە بەتاڵبوو، ئەوەی بە کوردی کرد، هەموومان دەیزانین و پێویست ناکات، باسیبکەین.

من هەمیشە، بزووتنەوەی کوردایەتییم، لە یەک گۆشەوە سەیرکردووە، کە لای من زۆر گرنگە، ئەڵێم: هەموو گرفتەکان چ ناوەکیی، چ دەرەکیی، ئەمە شوێنی خۆی هەیە. بەڵام، گەورەترین گرفتی بزووتنەوەی کوردایەتیی، کێشەی سەرکردایەتییە. چونکە، هەر پارتێک یان گەلێک، سەرکردەیەکی وشیار و دانا و زانای نەبێت، لەخۆبووردوو نەبێت، مومکین نییە، ئەو گەلە یان ئەو پارتە سەرکەوێت، ئەوەی لێ دەردەچێت، کە دیمان. بەڵام، ئەڵێین: « خوا دەلیلی داماوانە ». ئێمە تێکشکابووین، تێکشکانێکی وا، کە ئەبووایە، ناوی هەرەسی دووەممان لێ بنایە. لە دوای « 1988 »وە، هەر

چەندە مەفرەزە و دەستەی چەکدار کەمێک مابوو، وەک ئێستە لە ڕۆژنامە و ڕاگەیاندنەکانیاندا، لە بیرەوەرییەکانیاندا دەیخوێنینەوە. بەڵام، ئەوە شتێک نەبوو، توانای مەتیریاڵیی و مەراڵیی « پارتی بەعس » و دەوڵەتێکی وا گەورەی لە جیهاندا هەبێت. بەڵام، جیاوازییەکەی لەگەڵ « 1975 »دا ئەوەبوو، کە ئەو کاتە وتیان: چەک دائەنێین. بەڵام، لە « 1988 »دا وتیان: نا، چەک دانانێین. پاشـــان، ئەگـــەر ئەم هەمـــوو تێکشکان و هەڵەیە، تێکەڵاوکەی، ئەو هەمـوو هەڵەی کە لەکیسـدراوە، ئەوەی کە دەڵێم: خوا دەلیلی داماوانە، ئەوەبوو، کە « صەددام » ئەو بێ ئەقڵێتییە گەورەیەی کرد، پەلاماری « کوێت »ی دا، ئەگینە، قۆناغی ڕاپەڕین، لەم قـۆناغەدا، خوا بەوە ڕەحمیکرد، کە « بەرەی کوردستانیی » هەبوو، ئەگەر « بەرە » نەبووایە، شـــەڕی نێـــوخـــۆ دەبوو. بەڵام، ئەو کـــاتە، « بەرە » هەبوو، هۆشـــێکیـــان هێنابۆوە بەر خـــۆیان، ڕەوشـــەکـــەش تۆزێک لەباربوو، لەبەرئەوەی، هێزەکانی هاوپەیمانان، لە بنکەی « ئەنجەرلیک » هاتبوونە نێـوەوە و « UN » سەرپەرشتیی کارەکانی دەکرد، شتێکیان کرد، کە بە ڕاستیی، جێگەی شانازییە بۆ ئەو قۆناغـە، ئەویش ئەوەبوو، بڕیاریاندا، « فیدراڵیی » لە « کوردستان »دا ڕابگەیەنن و هەڵبژاردن بۆ « پەرلەمان » بکەن، میرییەکی هاوبەش دروستبکەن، ئەوە قۆناغێک لە بیر و هۆشی کوردییدا دەچێتە پێشەوە، لەگەڵ قۆناغی دواتردا، جیاوازیی هەیە. من قۆناغی ڕاپەڕین، بەوە هەڵ ناسەنگێنم، کە تەنیا پارتەکان یاخود تەنیا پارتێک بەشـداریيکردووە. من پێم وایە، قـۆناغی ڕاپەین، درێژەدانە بە خەباتی « شێخ مەحموود » لە ساڵی « 1918 »ەوە، درێژەدانـە بە خەباتی « شێخ عەبدولسەلامی بارزانیی »، کە پێش « شێخ مەحموود »یش بووە. درێژەدانی شـۆڕشی « ئەیلوول »ە. واتە: قـۆناغی ڕاپەڕین پەنگخواردووی ئەو سەردەمە مێژووییەیە. بەڵام بە تایبەتیی لە « 1968 »ەوە بۆ « 1991» کە ڕاپەڕینەکەی تیا ڕوویدا. چونکە، لەو کاتەوە، قۆناغێکی زۆر خراپ دەسپێدەکات، کە بریتـییـە لەو سێکوچکەیەی « بەعس: بەعەرەبکردن، ڕاگواستن و بەبەعسیکردن ». ئەم قۆناغە ئەتوانین، جیابکەینەوە، زۆر شتی باشیان کرد، کە ئـــەو کارەی « پەرلەمان » و هەڵبژاردنانەیان کرد و ئێمەش، لە بەر چاوی جیهان، بە شتێکی باش بۆمان نووسرا.

بەڵام، داخی گرانم، کورد بە شێوەیەکی گشتیی، دوو ئاکاری هەیە، کە من هەمیشـە، لە نووسـینەکانمدا باسمکردووە، ئەوانیش یەکەم: هەسـتی نەتەوەیی لاوازە. کـە تۆ هەسـتی نەتەوەییت لاوازبوو، ئەوا بەرژەوەندیی

تاکەکەس، یان هۆز، یان خێڵ، دەخەیتە سەرو بەرژەوەندیی نەتەوەکەتەوە، کاتێک بەرژەوەندیی پارتایەتیی تەسک، لە پێش بەرژەوەندیی نەتەوەوە هات، هەمیشە ململانێی ئایدۆلۆژیا درووستدەبێت. ئایدۆلۆژیا، ئەگەر هەبوو لە « کوردستان »دا، ناکۆکیی درووستدەبێت. لە ئەنجامی ناکۆکییدا، دووبەرەکیی درووستدەبێت. لە ئەنجامدا، جەنگی نێوخۆ درووستدەبێت. بە پێچەوانەوە، ئەگەر هەست و هۆشی نەتەوەیی بەرزبێت، ئەوا تۆ دەتوانی، بە سەر ئەو گیروگرفتانەدا بازبدەی و تووشی ئەو تەنگژانە نەبیت.
خاڵی دووەم ئەوەیە: ئێمە بێگانەپەرستین. واتە: ئەگەر سەراپای مێژووی کورد بگری، لەم خاڵە هەڵکێتشراوە. ئەمەش، هۆکارەکانی بۆ زۆر فاکتەر دەگەڕێتەوە. یەکێ لەوانە: ئایینی هاوبەشە لە نێوان « کورد و عەرەب »، یان « کورد و تورک »، یان « کورد و فارس »دا، ئەو ئایینە هاوبەشە. نەتەوەکانی تر، ئایینیان خراپ بەکارهێناوە، بۆ کوشتن و چەوساندنەوەی کورد، ئایەتی قورئانیان هێناوە، کردوویانە بە ئارمی جەنگەکانیان وەکوو « ئەنفال ». ئەم دوو شتە، زۆر وای لە کورد کردووە، کە تێکبشکێ لە بزووتنەوەکانیدا. چونکە، کە تۆ بێگانەپەرست بووی، واتە: هەمو شتە کۆنەکانت لە بیردەچێتەوە، هەموو تێکشکانەکانت بیردەچێتەوە، گەلێکیش، کە تێکشکانی بیرچۆوە، واتای ئەوەیە، یادەوەریی نەتەوەیی لاوازە، یان کوێربۆتەوە. ئەو کاتەش، تۆ ناتوانی، تا سەر داکۆکیی بکەیت، تا سەر لە سەر پێی خۆت بووەستی. ئەم گیروگرفتە، گەورەیە لای کورد. من پێم وایە: ئێستەش هەر وایە.
ڕاپەڕین یەکێکە لەو نیشانە گەورانەی، کە کورد دەبێ، شانازیی پێوە بکات. چونکە، گەلی کورد بە گەورە و پچووک و پیاو و ژن و چاک و خراپییەوە، هەمووی ڕاپەڕیوە. ئەو قۆناغە زۆر گرنگە، ئەبێ، زۆر بایەخی پێ بدرێت. بە ڕاستیی، ڕاپەڕین پێویستی بەوە هەیە، لێکۆڵینەوەی تایبەتیی لە سەر بکرێت. من ناتوانم، بەشی شێر بۆ پارتێک دیارییبکەم، بەشەکەی تریان بڵێم: وا نییە. ڕاستە، « یەکێتی نیشتمانیی »، دەستێکی باڵای هەبووە لە ڕاپەڕیندا، بەڵام، پارتەکانی تریش، بەشدارییانکردووە. هەتا ئەوانەی کە لەو قۆناغەدا، « جاش »یش بوون و خۆیان فرۆشتووە، ئەوانیش، ڕۆڵێکی باڵایان بینیوە.
دوای قۆناغی ڕاپەڕین، دێینە سەر پەرلەمانی « کوردستان »، ئەوە جێی شانازییە، هەر چەندە، تێبینییەکی زۆر هەیە، من خۆشم تێبینییم لە

سەر جۆری هەڵبژاردنەکە، لە سەر ئەو گزیی و دزییەی تێیدا کرا، هەیە، مافی خەڵک خوراوە، ئەوانە هەمووی بە لایەک، بەلام دیسانەوە، دەردە کۆنەکەی کورد « شەڕی نێوخۆ » یەخەی گرتووینەتەوە.
لە « 1994. 05. 01 »دا، کە شەڕی نێوخۆ درووستبوو، تاکوو ڕێککەوتننامەی « واشنتن »، چەندین جار، دایانیشاندوون، لە « پاریس »، لە « ئەنقەرە »، لە « تاران »، لە « کوردستان » خۆیدا و لە « ئەمێریکا »، ئەم دوو سەرکردەیەی کورد، لێبووردنێکیان نەبووە، دڵیان لە ئاستی یەکتردا پاک نەبۆتەوە. یان بڵێین: وەکوو سەرکردایەتیی دوو ڕێکخراوی گەورە لە « کوردستان »دا نەیانتوانیوە، زەمانێکی هاوبەش بدۆزنەوە، لە گوندێکی « کوردستان »دا، لە بستە خاکێکی « ئەنفال » و کیمیاباران کراودا دانیشن و بڵێن: با ئێمە، لە سێبەری ئەم دارەدا دانیشین و ڕێکەوین، یاخود سەیری ئەو گۆڕستانانە بکەین، کە لە « کوردستان »دا بڵاوە، سەیری ئەو گۆڕە بە کۆمەڵانە بکەین. واتای ئەوەیە، ئێمە گەڕاینەوە بۆ « هەستە نەتەوەییەکە و بێگانەپەرستییەکە » واتە: بە سەدان مامۆستای ئایینیی و مامۆستایانی زانکۆ و ئەکادیمییەکان، بە هەزاران نووسەر و ڕووناکبیر و تەنانەت ژن و منداڵ ڕوویانکردۆتە هەر دوو بارەگاکە، شەڕ بوەستێنن، بەلام، نەیانوەستاندووە. بەلام، بە گوشاری دەرەکیی وەستاندیان. من مەبەستم ئەوەیە: لە ئەزموونی کوردایەتییدا، ئەو پەڵەڕەشەی تێدا هەیە، کە زۆر خراپە. جا ئێمە ناگەڕێینەوە بۆ کاتی ڕاپەڕین، لە دزیی و ئاودیوکردن و داوێنپیسیی، کە ئەوە شتێکی نێوخۆیی بوو، چارەسەرەکەی زوو دەکرێت. بۆ نموونە. دوای ساڵێک، ئاودیوکردن نەما. بەلام، شەڕی براکوژیی کە هەڵگیرسا، دوای چوار ساڵ کوژایەوە، پێشتر بە دە ساڵ کوژایەوە. ئەوەیە گرفتەکەی ئێمە.
بزوتنەوەی کوردایەتییش، بە هەموو یاسایەکی ئاسمانیی و زەمینیی، بزووتنەوەیەکی پیرۆزە. پێویستە، هەموو گەلێکی چەوساوە و بندەست، کە چەوسایەوە، داکۆکیی لە خۆی بکات. ئەمە دەبێت، هەموومان لەگەڵیدا بین. جا ئایا، بیروباوەڕمان نەتەوەییە، یان نانەتەوەییە، یا ئیسلامییە، دێمۆکراسییە یاخود کۆمۆنیستییە. چونکە، ئەو دوژمنە کە دێت، تەڕ و ووشکی تۆ دەسووتێنێ، حساب بۆ ئەوە ناکات، تۆ ئیسلامیی یان کۆمۆنیستیی یا شتێکی تری. گرنگ ئەوەیە، تۆ دژی ئەوی، لە بەرەکەی تر دای، داکۆکیی لە ئەم خاکە دەکەی. ئەوە ناوەڕۆکی بزووتنەوەی کوردایەتییە!

کوردایەتیی ئامانجی زۆرە، بۆ نموونە: ڕزگارکردنی خاک، ئازادکردنی خەڵک، دامەزراندنی قەوارەیەکی نەتەوەییە. ئەم قەوارەیەش، سەرکردەی ئەو ڕێکخراوانە بڕیاردەدەن، چی و چییە؟ لە قۆناغـــــــی یەکەمدا، لە « 1963 » داوای « ناناوەندێتیی »یان دەکرد. لە قۆناغێکی تـــردا، داوای « ئۆتۆنۆمیی »یان دەکرد لە ساڵی « 1970 »دا. لەم قۆناغەی ئێستەدا، داوای « فیدراڵیی » دەکەن. دوور نییە، کە ئەگەر بارودۆخی نەتەوەیی و نێونەتەوەیی لەباربێت، داوای دەوڵەتی سەربەخۆ نەکەن!

من پێم وایە: لە بزووتنەوەی کوردایەتییدا دەبێ:

1. دەسپاکیی و ڕاسگۆیی هەبێت.

2. خەڵک نیشتمانپەروەرێکی باشبێت، باش بیر لە نیشتمانی خۆی بکاتەوە.

3. پێوەندیی خۆی، لەگەڵ نەتەوە سەردەسەکانی « کوردستان »دا، بە باشـیی دیارییـبکات، چ لە ڕووی ئایینیی، یان دۆســـتایەتیی، یان پێوەندیییەوە بێت.

4. بەرژەوەندیی تاکـەکـەسـیی و پارتایەتیی تەسک وەلابنرێت. واتە: بەرژەوەندیی نەتەوەیی، پێش بخرێت.

5. شەڕی ئایدۆلۆژیا لە « کوردستان »دا نەمێنێت.

بۆ نموونە: من موسوڵمانم، لە پارتێکی ئیسلامیی دام، یەکێکی تر کۆمۆنیستە، هەر کەس بۆ خۆی. پێویستم بە چەک نییە، تا داکۆکیی پێ لە خۆم بکەم، پێویستم بە خەباتێکی دووروودرێژی ڕامیاریی هەیە، تا ئەو گەلە تێبگەیەنم. کە من توانیم، ڕازەی ئەو گەلە بکەم، ئەو دەنگ دەدا بە من. ئەو کاتە، من بە قسە، بە « دیمۆکراسیی » چوومە ئەو شوێنەوە، نەک بە خوێنڕشتن. چونکە، ئەگەر یەکێک شوێنێکی بە خوێنڕشتن گرت، هەر دەبێ، بە خوێنڕشتنیش چۆڵیبکات. ئەوە ئەزموونی « بەعس »مان هەیە، لە « 1968 »دا، دوو جار، هاتوونەتە سەر حوکم، هەر دووکیان بە کۆدەتا و خوێنڕشتن، ئەوە دەرئەنجامەکەی بوو، چۆن ڕۆیشتن؟ هەموو جارێکیش، بە « پارتیی » و « یەکێتیی »یان دەوت: « لە کاتی گفتوگۆکردن و دانیشتنەکاندا، ئێمە بە هیچ شێوەیەک ڕازی نابین، ئێوە بێنە بەرەیەکەوە، کە ئێمە پارتی سەرکردە نەبین. چونکە، ئەم شوێنەمان بە خوێن گرتووە » ئێرەش وایە، لە هەموو جیهانیشدا هەر وایە، کە ئەگەر دیکتاتۆریی هەبوو، لەبەرئەوە خەباتی ئایدۆلۆژیا، خەڵک بۆ خۆی بیکا، بەڵام، لە شێوەی ململانێی خوێناوییدا نەبێت.

من پێم وایە: ئەم جۆرە شتانە دەبێت، بزووتنەوەی کوردایەتیی، قاڵبێکی ڕاست وەرگرێ، دووربێت لە جەنگی نێوخۆ و « مونافەسەی ناشەریف » کە درووستدەبێت لە نێوان پارتەکاندا، بۆ ئەوەی پاشقول لە یەکتری بگرن. ئەم پیـــاوی ئەو دەوڵەت و ئەوی تریان هی دەوڵەتێکی تر. بە ڕاستیی، ئەوە کوردایەتیی نییە، کە خەڵک لە ژێرەوە، پیاوی دەوڵەتیتر بێت. بۆ چیش؟ بۆ ئەوەی کە پارتێکی تر، کە لە خۆت پچووکترە، لە خۆت بە دەسەلاتترە، ملی بشکێنی. کوردایەتیی ڕاستەقینە ئەوەیە: کە ئەگەر من هەڵەیەکم کرد، تۆ بۆم ڕاستکەیتەوە. چونکە، ئەگەر من هەڵەبکەم، تۆ هەڵەبکەی، ئەوی تر و یەکێکی تر، تەنیا دوژمن قازانجدەکات، بەلام، ئەی ئەگەر هەموومان ڕێکبووین، کێ قازانجدەکات؟ بێ گومان گەلەکەمان!

پ2: کاک دوکتۆر، ئەگەر موتابەعەی بزاڤی ڕووناکبیریی کوردییت کردبێت، ئایا دەتوانی، پێمان بڵێیت: ئەو بزاڤە، بزاڤێکی سەرکەوتوو، یاخود ڕەسەن بووە، یان دواکەوتوو و ناڕەسەن بووە؟

و2: لەو ڕۆژەوە، کە شەڕی نێوخۆ لە « کوردستان »دا درووستبووە، من بزاڤی ڕووناکبیریی، بە بزاڤێکی سەقەت و خوار و خێچ و گێل دەبینم. چونکە، هۆنەر و نووسەر و چیرۆکنووسی پارت درووستبوون، کە ئەو جۆرە کەسانە دەبێ، زۆر بێلایەنبن، بە چاوێکی ڕاستەقینە، سەیری بزاڤەکە بکەن و وێژە و نووسینەکەیان تەرخانکەن بۆ بەرژەوەندیی بالای بزووتنەوەی کوردایەتیی، نەک بۆ پێداهەڵدان بە سەرکردەی ئەم پارت و ئەو پارت، ئەمە یەکەم.

دووەم: لە ئەنجامی ئەو کێبرکێ خراپەی، ئـــەو دوو بەڕێوەبەرایەتییەی « هەولێر و سولەیمانیی » کە هەبووە، زۆر شت هەڵتۆقیوە لە ڕۆژنامە و گۆڤار و دەزگەی ڕۆشنبیریی لێرە و لەوێ « ناوەکانیان نابەین » ڕەسەن نین. ئەمانە وەکوو من لە تێلێفیزیۆنی « کۆمەڵ »یشدا باسمکرد، ڕەسەن نین. ئێستە دوور نەڕۆین، هەر دوو بەڕێوەبەرتییەکە ببنەوە بە یەک و خەڵک بچێتەوە بارودۆخی جارانی، زۆر لە ئەم دەزگایانە نامێنن، هەر خۆیان پارەیان نادەنێ، چونکە، پێویستیان پێیان نامێنێ. ئەمانە، واجیهە بوون بۆ ئەو دوو بەڕێوەبەرایەتییەی « هەولێر و سولەیمانیی »، ئەم لێرە، دەستەیەکی ڕۆشنبیریی داناوە بەرانبەر ئەو. ئەویش دەزگەیەکی تری کردۆتەوە. واتە: ئەمە بزووتنەوەی ڕۆشنبیریی نییە، بزووتنەوەی ڕۆشنبیریی ئەبێ، بزووتنەوەیەکی ڕەسەنی ڕێکوپێک و سەربەخۆ بێت، لە زادەی بیری خەڵکەوە هەڵقوڵێ.

جگە لەوە، شتێکی زۆر گەورە لە بزووتنەوەی ڕۆشنبیرییدا نوقسانە، کە ئەویش بزووتنەوەی ڕەخنەگرییە، ڕەخنەیەکی ڕاست و ڕەوا نییە، ڕەخنە تەنیا لەو لایەنە دەگرێ، کە تۆ لەگەڵیدا نیت، زۆر شت هەیە، پارتەکەی خۆی کردوویەتی، چاوی لێ نووقاندووە، لە بەرئەوەی ئەو ڕەخنەگرانە، ڕاستەقینە نەبوون.
پاشان، جگە لەوەی زمان، کە کۆڵەکەی بزووتنەوەی ڕۆشنبیرییە، زۆر لاوازە، وەکوو دەبینین لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا بە تایبەتیی، لە تێلێفیزیۆنەکاندا، زۆر بایەخ بە زمانەکە نادرێ. لەبەرئەوە، کە زمانەکە لاوازبوو، زمانی دارشتنیش لاوازدەبێت، زمانی داهێنانیش نامێنێت، واتە: لە هەموو ڕوویەکەوە بیگرە، ڕێنووسی کوردیی نییە، هەر نووسەرێک بە ئارەزووی خۆی دەنووسێت، ئەمانە هەموو پێوەندییان بە بزووتنەوەی ڕۆشنبیرییەوە هەیە. من پێم وایە: ئێستە، بزووتنەوەیەکی ڕۆشنبیریی ڕەسەن لە « کوردستان »دا نییە.
**پ3**: کاک دوکتۆر، بەو پێیەی کە تۆ کەسێکی ئەکادیمییت و دوکتۆرات لە کشتوکاڵدا هەیە، چۆن بڕیارت نەداوە بێی لە زانکۆیەکی « کوردستان »دا ڕاژەبکەیت؟
**و3**: من لە ساڵی « **1993** » ئەو کاتە کە میریی هەرێم یەکبوو، گەڕامەوە و چوومە زانکۆی « هەولێر ». لەوێ دوکتۆر « فاضیل قەفتان » لەوێ بوو، وتم: ئەگەڕێمەوە. برادەرانیش « کاوس عەزیز » و مامۆستا « ئەحمەد حەمە ئەمین » لەوێ بوون، وتیان: باشە. بڕوانامەکەمان بۆ بنێرە، ئێمە لێرە دادەمەزرێنین. بێ گومان، ئەم قسانەی ئێستە بۆتان دەکەم، لە ساڵی « **1996** »دا، لە سەر تێلێفیزیۆنی « گەلی کوردستان »یش کردوومە. ئەوەبوو، من بڕوانامەکەم نارد بۆ ئێرە. « بێ گومان، من لە یەکێتی سۆڤێتی کۆن تەواومکردووە، ئەبێ، یەکێ ئەو بڕوانامەیەی من بخوێنێتەوە کە ڕووسیی بزانێت. » من نامەیەکم لە لایەن دوکتۆر « فاضیل »ەوە پێگەیشت کە دەڵێ: « تێ نەگەیشتین، تۆ کولێژی کشتوکاڵت تەواوکردووە، یان کۆلێژی ئاداب !» منیش، زۆر سەیرم لێهات. قەیناکە، من پەرتووک دەخەمە بازاڕەوە، بەڵام، من بڕوانامەکەم کشتوکاڵ نووسراوە، منیش زانیم، شتێکی تێدا هەیە. دوای ئەوەی شەڕی نێوخۆی بەسەرداهات، خەڵکیی، خۆی وولاتەکەی بەجێدەهێشت، ئیتر من بۆ کوێ بێمەوە؟!!
ئەو کاتە، ساڵی « **2000** » هاتمەوە، چوومە لای سەرۆکی « زانکۆی سولەیمانیی » و وتم: من بۆ ماوەی شەش مانگ بەبێ پارە وانەدەڵێمەوە.

وتی: باشە. پێشنیازێ بنووسە، ئێمە وەڵامتدەدەینەوە. بەڵام، وەڵامیان نەدایەوە. پاش پێنج ڕۆژ، من چوومە زانکۆ. وتیان: کاکە لە سەر پێشنیازەکەتیان نووسیوە: « پێویستیمان بەو پسپۆڕییە نییە ! » منیش، زۆر دڵگرانبووم. ئەمان خۆیان بە ئینتەرنێت و ڕۆژنامە ... هتد هاوار دەکەن و دەڵێن: کادێرەکانمان بێنەوە لە « ئەوروپا »وە، ماجستێر و دوکتۆرامان دەوێ بۆ زانکۆکانمان، من هاتوومەتەوە، وەکوو ئەزموونێکی کورت شەش مانگ وانەبڵێمەوە، ئەگەر توانیم، بگونجێم، ئەوا بەردەوام دەبم. ئەگەر نەشمتوانی، ئەوا نە ئەوان زیانیانکردووە، نە منیش.

لەبەرئەوە، هەموو هیوایەکم ئەوەیە، ڕۆژێکو لە ڕۆژان بێمەوە. پار « مام جەلال » پێی وتم: حەزدەکەین، بێیتەوە « کوردستان » و ئەوە زانکۆ هەیە. من پەیمانم نەدایە. وتی: زۆر کارئاسانیشت بۆ دەکەین. ئەم ساڵ کاک « بەرهەم »یشم بینی و وتی: وەرەوە. بەڵام، هێشتا بەڵێنم پێ نەداوە. هەموو هیوا و ئاواتی من ئەوەیە، ڕۆژێ لە ڕۆژان بێمەوە نێو گەلەکەی خۆم، لە هەر بوارێکدا بێت، ڕاژەبکەم. بەڵام، هەموو هیوایەکیش پێوەندیی بە تواناوە هەیە، کە مرۆڤ توانای نەبوو، ژیانێکی مامناوەندیی هەبێت، کە وەکوو ئەو خەڵکە بژی. چونکە، من هیچ شتێکم لەم خاکەدا نییە، تەنانەت بستە زەوییەکم نییە. جگە لە مەسەلەی ئەکادیمیی، من ڕەگم لەم خاکە دایە، گەلەکەم و پێنووسەکەم لێرەیە. من چەند ساڵە لە « ئەوروپا »م، ئەو هەموو پەرتووکەم نووسیوە، تا ئێستە، هیچ شتێکم لە سەر « ئەوروپا » نەنووسیوە. لەگەڵ ئەوەشدا، کە خەڵکانێکی زۆر دەچنە ئەوێ، لە سەر ئازادیی و دیمۆکراسیی « ئەوروپا » دەنووسن. بە پێچەوانەوە، من دژی ئەوان نووسیومە. چونکە، بە ڕاستیی، من لەگەڵ ئەو بەرەڵڵاییی ئەوێدا نیم، ئازادیی سێکس و تلیاککێشان هەبێ، من ئەوە بە ئازادیی نازانم.

پ4: سەبارەت بەو چاوپێکەوتنەت لەگەڵ مامۆستا « عەلی باپیر »دا، کە بە پەرتووکی « سنووره قەدەغەکان مەشکێنن! » دەرچووە، ئایا، ئەم ناوە لە چییەوە هاتووە؟

و4: لە ڕاستییدا، پاش ئەوەی کارەکەم تەواوکرد، من بیرم لە ناوی پەرتووکەکە دەکردەوە.. من ناوی بنێم چی؟ تەنانەت، لە ڕێگەدا کە ئەگەڕاینەوە لەگەڵ « شێخ عەزیز » و کاک « کاوە »دا گوتم: کوڕینە! من ناوی دەنێم: « لە بناری ئەحماوا ». وتیان: وەڵڵا، ناوێکی زۆر جوانە. بەڵام، من وتم: من خوویەکم هەیە، چۆن باوکێک بیست ناو بۆ منداڵێکی تازە بووی دەدۆزێتەوە، پاشان، هەر یەک ناویشی لێ دەنێت، منیش وام، پەلە

ناکەم. کە کاسێتەکانم گوێ لێ گرتەوە، و خستمە سەر کاغەز، گوێم لێ بوو، مامۆستا خۆی دەڵێ: « ئەوە سنووری ئیسلامە و قەدەغەیە و مەیشکێنن. » ئەو سنوورانەی کە ئەو باسیدەکات، « خواردنەوە و زینا » ئەو شتانەن. منیش، ئەو ناوەم زۆر لا جوانبوو. چونکە، هەڵبەت ئەو، ئەو ناوەی لا جوانبووە، منیش لام جوانە.

لە سەر پەرتووکەکە: من سێ کاری ڕۆژنامەگەریم کردووە: یەکێکیان لەگەڵ مامۆستا « برایـــــــــــم ئەحمەد » و دووەمیان: لەگەڵ مامۆستا « جەرجیس فەتحوڵڵا » و سێیەمیشیان لەگەڵ مامۆستا « عەلی باپیر » دایە. ئەمانە، من بە کاری هاوبەشیان دادەنێم. چونکە، پێشەکیی و پرسیارەکانی هی منن و وەڵامەکانیشی هی ئەوانن. لەبەرئەوە ناتوانم، بڵێم: تەنیا بەرهەمی خۆمن، ئەمە یەکەم.

خاڵی دووەم: من لێرەدا، تەنیا باسی « سنوورە قەدەغەکان مەشکێنن! » دەکەم. من پێم وایە: لە کەشێکی زۆر ئازاددا دانیشتووین لەگەڵ مامۆستا و ئەوەی من ویستوومە، بە دڵی خۆم وتوومە. ئەویش بە دڵی خۆی وتوویەتی و شەرممان لە یەکتری نەکردووە، وەک دوو هاوڕێ، وەک دوو برا و دوو خۆشەویست دانیشتووین، قسەمانکردووە. ئەویش، خوا هەڵ ناگرێ، ئەو کەشەی بۆ من دروستکردووە، هەستدەکەم، ئەو وەڵامانەی مامۆستا داویەتییەوە، لە باوەڕێکی زۆر پتەو، لە دڵێکی زۆر خاوێن و دەروونێکی زۆرزۆر ڕاستەوە داویەتییەوە. لەبەرئەوە، من ئەگەر سەرنجێکم هەبێ، لە سەر هەندێ بۆچوونی مامۆستا، لە سەر قسەکانی ئەو نییە، ئەو لە دید و ڕوانگەی خۆیەوە قسەیکردووە، من سەرنجەکە ئەبێ، بڵێم: لە دیدێکی دیکەوە بیدەم. بەڵام، هیچ گومانم لە ڕاسگۆیی قسەکانی ئەو نییە. پێشم وابووە، من خۆم باسی نەکەم، کە خۆم ئەو کارەمکردووە. با ئەوە جێبهێڵم بۆ جەماوەر و نووسینی ڕۆژنامەکان لە سەری بنووسن، کە هیوادارم، لە سەری بنووسن، لە سەر پێشەکییەکەی، لە سەر پرسیار و وەڵامەکان، هەڵیسەنگێنن.

مامۆستا ئەو کەسەیە، کە لەوێدا قسە دەکات. « حوسێن موحەممەد عەزیز »یش ئەو کەسەیە، کە لەوێدا ئەو پرسیارانە دەکات و زۆر بە ئازادانە و لە بنکەی سەرکردایەتی « کۆمەڵی ئیسلامیی »دا. هیوادارم، ئەو گوتارانەی لە سەر ئەو بابەتە دەنووسرێن، بە چاک یان بە خراپ، ڕۆشنایی ببینن.

* * *

« 3 »

کاتێ، مامۆستا « عەلی باپیر » و هێندێ لە هاوەڵەکانی، لە لایەن هێزەکانی « ئەمێریکا »وە، بە فرتوفێڵ دەسگیرکران و بە فرۆکە فرێنران، بەو بۆنەیەوە، ڕۆژنامەی « کۆمەڵ »، زنجیرە چاوپێکەوتنێکی، لەگەڵ کۆمەڵێ « ڕووناکبیر، نووسەر، هۆنەر، ڕۆژنامەنووس، ڕامیار و پیاوانی ئایینیی »دا سازکرد، تا، دید و بۆچوونی تایبەتیی خۆیان، دەربارەی ئەو کارە نارەوایەی « ئەمێریکا » دەربڕن. منیش، یەکێ لەو کەسانە بووم، نارەزایی خۆم دەربڕی.

ئەم چاوپێکەوتنە کورتانە، لە لایەن بەڕێزان « عومەر عەبدوڵڵا » و « ئارام عەلی »یەوە ئامادەکراون و لە ڕۆژنامەی « کۆمەڵ »ی ژمارە « **81** »ی ڕۆژی شەممەی ڕێککەوتی « **2003. 07. 19** »دا بڵاوکراونەتەوە. ئەز لێرەدا، تەنیا پێشەکیی ئامادەکارانی چاوپێکەوتنەکە و وەڵامەکەی خۆم، بۆ مێژوو تۆماردەکەم.

**مامۆستا « عەلی باپیر »، وێڕای تەمەنێک لە خەبات و تێکۆشان لە دژایەتی کردنی پارتی « بەعس »ی دیکتاتۆردا، هەر لە سەرەتای ساڵانی هەشتاکانەوە، وەک نووسەرێک دەرکەوتووە و تا ئێستە، زیاتر لە « 40 » پەرتووکی نووسراوی خۆی هەیە. هەندێکی لەوانە، لە بەر بایەخیان، زیاتر لە جارێک چاپ کراونەتەوە. ئەمە، وێڕای ئەو سەدان وتارەی، کە مامۆستا وەک وتاربێژێک ناسراوە، ئەم بوارەی ژیانی مامۆستا وای کردووە، کە مامۆستا لە ناوەندە ڕۆشنبیرییەکەدا، جێگەی دیار و بەرچاوی هەبێت و لەگەڵ زۆرێک لە نووسەر و ڕۆشنبیر و ڕۆژنامەنووسی « کوردستان » و دەرەوەی « کوردستان »دا، پەیوەندیی توندوتۆڵی هەبێت.**

**هاوکات لەگەڵ مامۆستادا، کاک « تۆفیق کەریم » بەرپرسی مەکتەبی ڕاگەیاندن و سەرنووسەری ڕۆژنامەی « کۆمەڵ » و ئەندامی یەکێتی ڕۆژنامەنووسان، لە ناو هاوڕێ دەسگیرکراوەکانی مامۆستا دایە. هەر بۆیە، بە مەبەستی خستەنەڕووی نارەزایی و ئیستینکاری ئەو کارە ناشایستەیە، لە لایەن ڕۆشنبیران و نووسەرانەوە، ئەم دیمانەیەمان سازکرد و ئەوانیش، لە بارەی ڕووداوەکەوە، بەم شێوەیە هەڵوێستیان بۆ ڕۆژنامەکەمان دەربڕی:**

بە ڕاستیی، وەکوو دۆستێکی، من وەکوو کوردێکی نیشتمانپەروەر، زۆرم پێ ناخۆشە، بەرامبەر بەو کارەی، « ئەمریکایی »یەکان کردوویانە. چونکە، هەر کەسێکیش، ئەگەر هەڵەشی هەبێت، پێویست ناکات، بەو شێوەیە بگیرێت. لەبەرئەوە، شێوەی دیکە هەیە.

هەر چەندە، من نازانم، تا وەکوو ئێستە، هۆی گرتنەکەی چییە. بەڵام، زۆر زۆر دڵگرانم بۆ مامۆستا « عەلی باپیر »، کە خەباتێکی دووردرێژی ئاوای هەبێت، لە ڕیزی کوردایەتیی و لە ڕیزی بزووتنەوەی ئیسلامییدا، پێم ناخۆشە، نەک ئەو، بەڵکوو هەر کەسێکی تر بێت کە ڕاژەی هەبێت.

ئەمڕۆ « عێراق »، لە ڕاستییدا، داگیرکراوە و ئەم داگیرکردنە، ئەگەر خێری تیابێت، بەس بۆ کورد تیایەتی. ئەگینا، لە ڕووی یاسای نێو دەوڵەتیی و یاسای مرۆییەوە، ئەمە داگیرکردنە، تۆ بێیت، بە تۆپ و فڕۆکە، وولاتێک داگیربکەیت.

ئینجا، کە وولاتێک داگیرکرا، دەستووری تیا نییە، یاسای تیا نییە، میریی تیا نییە. واتای وایە: هەموو مافەکان پێشێلکران. ئەگەر تۆ بڵێی، لە ڕووی یاسای نێودەوڵەتییەوە، گرتنی « ئۆجەلان » هەر تاوانە. ئەم گرتنەی مامۆستا « عەلی باپیر »یش، هەر تاوانە. ئەوانەی دەرهەقی خەڵکی تر دەکرێن، ئەگینا پێویستە، ئەوەی دادگایی دەکرێت، پێویستە نامەی بکرێتە سەر و پارێزەری هەبێت، تا داکۆکیی لە خۆی بکات، یاخود، لە دادگایەکی ئاشکرادا دادگایی بکرێت.

* * *

## « 4 »

هەر وەک لە پێشەکیی ئەم چاپە نوێیەدا، ئاماژەم بۆ کردووە، لەو ڕۆژەوە، ئەم چاوپێکەوتنە بڵاوکراوەتەوە، تا ئێستە، تەنیا هەر، ئەم گوتارەی کاک « ئیسماعیل سەیید ئیبراهیم »ی لە سەر نووسراوە. گوتارەکە، لە لاپەڕە « 7 »ی ڕۆژنامەی « کۆمەڵ »ی ژمارە « 83 »ی ڕۆژی شەممەی ڕێککەوتی « 2003. 08. 02 »دا بڵاوکراوەتەوە.
لێرەدا، زۆر بە پێویستی دەزانم، بێ ئەوەی، دەسکاریبیکەم و هەڵەکانی ڕاستکەمەوە، وەک خۆی چۆنە بڵاویکەمەوە. پاشان، وەڵامێکی کورتی بدەمەوە، تا هێندێ شت هەیە، هەروا بە ئاسانیی، بە سەر هەموو لایەکماندا تێپەڕ نەبێ!

## پەیامێک بۆ تەبایی

# خوێندنەوەی کتێبی
# « سنوورە قەدەغەکان مەشکێنن! »

**ئیسماعیل سەید ئیبراهیم**

کەمن ئەو دەنگە ڕەسەنانەی لەناو ڕۆشنبیریی کوردیدا دەرکەوتبن تائەمڕۆش کەئامانجداربن و مەبەستیان خزمەتکردنی ئەو ڕۆشنبیرییە بێت، کە دەڵێم ئامانجدار مەبەستم ئەوەیە: کۆی گوزارشت و گوتارەکانیان لەپێناو بەدیهێنانی تەبایی نەتەوەیی و نەهێشتنی دووبەرەکی و فەرامۆشکردنی خاڵە جیاوازەکاندا بێت، چونکە ئەمڕۆ گرنگە ڕۆشنبیرانی کورد هەست بەو دەرفەتە ناسکە بکەن کەتیایدا لەسەر خاڵە جەوهەری و هێڵە گشتییەکان ڕێککەوت و تەبابن، گەر ئەوان ئەوە نەکەن ئەوا گلەیی چی لەسەرجەمی خەڵک بکەین؟ پێموایە ڕۆشنبیران خاوەن کاریگەرین و یەکەم بەرپرسیاریشن لەهێنانەدی ئەو کەشە ویستراوەدا.
بەداخەوە لەچەند ساڵی ڕابردوودا ڕووناکبیران خزمەتکاری بیری تەسکی حزبی بوون و لەو پرۆژەیەدا کاریانکردووە کەحزبی سیاسی گەڵاڵەی

کردووەو لەنەتەوە گەورەتربووە لایان، ئەمانەش لەدوو حاڵ بەدەرنەبوون، یان بۆ بڵاوبوونەوەی ناوو شۆرەو دەرکەوتن ئەو کارەیان کردووە، یاخود لەبەرامبەریدا پارەی بێعەزیەت و بێئارەقیان وەرگرتووە.
چەند جارێک کەدەربارەی ئەو فەریکە نووسەرانە شتم نووسیوە جەختم لەسەر ئەوە کردووە کەئەو کارانەی ئەوان دەیکەن نەک خزمەت بەکوردو کێشەکەی ناکا، بەڵکو ئەوە خیانەتەو لەباربردنی ئەو کەشەشە کەئەمڕۆ بەدیهاتووە، دەبێ ئەوە لەئاگایی و زەینی هەمووماندا بچەسپێ کەبەڕەفزکردنی یەکترو نەخوێندنەوەی بەرامبەر جگە لەناتەبایی و کێشە دروستکردن هیچی دی چاوەڕێ ناکرێ، چونکە هیچ کەسێک بەو کارەی ناتوانێ بەرامبەری بسڕێتەوە.
سەبارەت بەو هەوڵەی کاک دکتۆر حوسێن موحەممەد عەزیز کەداویەتی دەتوانم بڵێم یەکەم کارێکی دیاری لەو جۆرەیە کەتائێستا کرابێ و خۆی لەقەرەی زۆرێک لەمەسەلە هەنووکەیی و مشتومڕ هەڵگرەکان داوە، هەروەک خۆی پاراستووە لەورووژاندنی ئەو بابەتانەی کەتەنها وەکو تۆمەت دەدرێنە پاڵ ئیسلام، خاوەنەکانیان مەبەستیان گەیشتن بە حەقیقەت نییە بەڵکو تەنها وەکو جەدەلێک دەیورووژێنن، هەروەها ئەمە ڕێگە خۆشکردن و دروستکردنی پردی دیالۆگە لەنێوان هەردوو جەمسەری « ئیسلامی ـ عەلمانی » لەکۆمەڵگەکەماندا کەزۆرێک لەتەم و مژەکان دەڕەوێنێتەوە.
کتێبەکە لەقەبارەیەکی مامناوەندیدا گەلێک بابەتی وروژاندووە لە شێوەی پرسیارو وەڵامدا، جگە لەپێشەکییەکی درێژ، بەگشتی دەتوانم بڵێم کتێبێکی فیکرییەو هەوڵێکە بۆ خوێندنەوەی فیکری مامۆستا عەلی باپیرو بیروڕاکانی، هەڵوێستی بەرامبەر گروپ و ئاڕاستەو مەزهەبە جیاجیاکانی ناو فیکری ئیسلامی و خوێندنەوەی بۆ فەلسەفەو فیکرو ئایینە جیاجیاکانی تر، ئەمە جگە لەچەند پرسیارێکی تایبەت بەخودی مامۆستاو هەڵسەنگاندنی کەسایەتی ئەو، لەڕێگای شارەزابوون لەباری کۆمەڵایەتی و ئەو دۆخە ڕۆشنبیرییەی کەتیایدا گەورە بووە، هەروەها کۆمەڵێک پرسیار سەبارەت بە(کۆمەڵی ئیسلامیی، پێکهاتن و پەیوەندییەکانی).
جارێ سەبارەت بەناوی کتێبەکە پێموایە شتێکی جوان و گونجاوە لەو ڕووەوە کەنووسەر کەسێکی ناسیۆنالیستەو بڕوای تەواویشی بەسیکولاریزم هەیە، خۆی بانگەشەی نەشکاندنی ئەو سنوورە قەدەغانە

بکات کەخواو پێغەمبەر « ص » دیاریانکردوون، چونکە زۆربەی نووسەرە عەلمانییەکان بیرمەندی و تێگەیشتوویی خۆیان لەوەدا دەبیننەوە کەچەند دەتوانن قسە بەخواو پێغەمبەر « ص » بڵێن و تانەو تەشەر لەئیسلام بدەن.

نامەوێ لێرەدا قسە لەسەر ناوەڕۆکی کتێبەکە بکەم، چونکە بیروبۆچوونەکان هەمووی هی ماموستا عەلی باپیرەو من هەرچییەک بڵێم بەزیادی دەزانم، چونکە حەقی تەواوی بەوەڵامەکان داوە، بەڵام دوو تێبینیم لەسەر پێشەکییەکەی هەیە، پێش ئەوەش دەمەوێ بڵێم پێشەکییەکە « سەرنج و تێبینی » دەقێکی ئەدەبیی جوانی چیرۆک ئامێزە، بەدەربڕینێکی هونەریی و زمانێکی پاراو، چەند وێنەیەکی هونەریی ئەفراندووەو وەسفێکی جوانی گەشتەکەی کردووە، من بەش بەحاڵی خۆم چێژێکی تایبەتیم لێبینی وتێبینییەکانیش ئەمانەن:

1. لەهەڵسەنگاندنەکەیدا بۆ کۆمەڵی ئیسلامیی کەبەچەند خاڵێک نووسیویەتی، لەخاڵی سێیەمدا دەڵێ(نوێژ لەمەڵبەندەکەیان دەکەن و هاتوچۆی مزگەوت ناکەن، لەوەدەچێ بڕوایان بەمەلای مزگەوتەکانی کوردستان نەبێ) دەبوایە کاک دکتۆر کاتێ سەرنجێکی وای لاگەڵاڵە دەبێ، بەدوای وەڵامەکەشیدا بگەڕێ، نەک تەنیا بیورووژێنێ و بەس، هەقبوو وەکو باقی پرسیارەکانی تر ئەم پرسیارەشی لەماموستا بکردایە، چونکە من دڵنیام ئەم هەڵوێستە لەو بۆچوونەوە سەرچاوە ناگرێ کەنووسەر وتوویەتی، بەڵکو لەوانەیە حاڵەتی ئەمنی یا هەر شتێکی تر بێت، چونکە کۆمەڵی ئیسلامیی هەر لەسەرەتاوە ڕایگەیاندووە کەهەڵوێستی ئیجابییە بەرامبەر ماموستایانی ئاینی و هەموو خەڵکی کوردستان، ماموستاش لەچەندین وتارو کۆڕو کۆبوونەوەدا ئەو هەڵوێستەی بەئاشکرا ڕاگەیاندووە، ئەمە لەلایەک، لەلایەکی ترەوە هەڵوێستێکی لەوجۆرە، لەشوێنێکی دیاریکراودا تەعمیم ناکرێ بەسەر هەموو شوێن و کاتەکانی تردا، لەوانەیە تێبینی و پرسیار لەسەر ماموستایەک یا چەند ماموستایەکی ئاینی هەبێ بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کەسەرجەم ماموستا ئاینییەکانی کوردستان وەکو یەکبن، من پێموایە کەماموستایانی ئاینی لەکوردستاندا دەوری ئیجابییان هەبووە لەگەڵ بوونی کەم و کوڕی و چاوپۆشیش لەزۆر شت، نموونەی زۆر ماموستا هەیە کەلەسەر حەقبێژی و هەڵوێستی نیشتمانپەروەرانەیان تیاچوون، ئەوەشمان بیرنەچێ کۆمەڵێک ماموستای ئاینی کوردستان

بوون سەرەتاكانی بزاڤی ئیسلامیی چەكدارییان دروست كرد، وابزانم ماموستا ئەوەشی باش بۆ كاك دكتۆر ڕوونكردۆتەوە لەوەلامەكانیدا.
2. نووسەر لەكۆتایی پێشەكییەكەیدا تەئكیدی لەسەر ئەوە كردۆتەوە كەبەكوردی پەتی دەنووسێ و زاراوە عەرەبییەكانیش دەكات بەكوردی، هەموو نووسەرە ناسیۆنالیستەكان جەخت لەسەر بەكوردیكردنی زاراوەو دەربڕینەكان دەكەن، بەڵام پێموایە ئەوان مەبەستیان تەنها زاراوە عەرەبییەكانەو حەساسیەتیان تەنها لەگەڵ ئەواندا هەیە، چونكە لەقسەو نووسینەكانیاندا زاراوەی بیانی زۆر بەكاردەهێنن، بەتایبەتی ئینگلیزی، هەروەک دكتۆر حوسێن ـ یش هەمانكاری كردووە، بۆ نموونە (پرۆژێكتەر، كۆمەڵگای سیڤیل، سیكولاریزم، پلۆرالیزم) ئەمانە خۆ هیچی كوردی نین، هەروەها كەویستوویەتی هەندێ زاراوەی تر بكات بەكوردی تەنها بەوەش عەرەبییەكەی بەوشەیەكی بیانی گۆڕیوە، بۆ نمونە « واقیع بینی = ڕیاڵبینی »، « ماددی = ماتریاڵی »، بەكوردیكردنی زاراوە كارێكی زۆرباش و پەسەندە بەمەرجێک كوردییەكی ڕەسەن بێ و لەهەناوی زمانی كوردییەوە بێ، ئەمەش كێشەیەک نییە تەنها زمانی كوردی گرتبێتەوە، بەڵكو زۆربەی زمانەكانی جیهانی سێیەمی گرتۆتەوە، كەلەپاشكۆیەتییەكی ڕۆشنبیریدات، بەڵام ڕێگە چارەیەک كەتا ئێستا هەبێ ئەوەیە كەهەر زاراوەیەک كەدەخرێتە ناو زمانێكی ترەوە ئەگەر زمانی وەرگر كۆمەڵێک گۆڕانی بەسەر لایەنی « فۆنەتیک » و وشەسازیدا هێنا وەكو ئاڵوگۆڕی فۆنیم و گۆڕان لەڕیزبەندی فۆنیمەكاندا یاخود زیادكردن و كەمكردنی فۆنیمێک یا زیاتر ئەوا ئەو زاراوەیە دەبێتە موڵكی ئەو زمانە، هەروەكو « واقیع ـ عەرەبییە » « بینی ـ كوردییە » كەچەند فۆنیمێكی لێزیادكراوە، دەبێتە زاراوەیەكی كوردی، بەڵام ئەگەر تەنها عەرەبی بكرێت بەوشەیەكی بیانی ئەوا كامەیە بەكوردیكردن؟ هیوادارم هەوڵی لەوجۆرە هەر زۆر بێت و زمانێكی لەیەكگەیشتن بێتە ئاراوە بۆ سەرجەم توێژەكانی كۆمەڵگەی كوردی.

* * *

« 5 »

# وەڵامێ بۆ گوتارنووس

•

پێشەکیی دەمەوێ، بڵێم: کارێکی زۆر باشە، گەر لە نێو چوارچێوەی سنووری، بزووتنەوەی ڕووناکبیریی کوردییدا، هەڵسەنگاندن و ڕانانی پەرتووک هەبێ، وەک لە نێو بزووتنەوەی ڕووناکبیریی، گەلانی پێشکەوتووی دیکەی جیهانیشدا هەیە. بەڵام، ئەو هەڵسەنگاندن و ڕانانە، بۆ کۆڵینەوەیەکی زانستانە، ڕەخنەیەکی بابەتانەی ڕاست و تەندرووست بێ، لە لایەکەوە، هەڵەوپەڵە، کەموکوڕیی، لایەنە لاواز و باری سەرنجە ناڕاستەکان دیارییکا. لە لایەکی دیکەشەوە، لایەنی بەهێزی نێوەڕۆک، زمان و شێوەی داڕشتنەکەی دەسنیشانکا، نەک تەنیا هەر، ڕەخنە بۆ ڕەخنە بێ، یا، بۆ مەبەستێکی تایبەتیی بێ!

با لێرەدا، ڕاستییەک بدرکێنم. ئەوەتەی دەسم بە نووسین کردووە و بەرهەمەکانم بڵاودەکەمەوە، چەن نووسەرێ، ڕەخنەیان لێ گرتووم و ڕەخنەکانیشان بۆ ئەوە نەبووە، ڕێی ڕاستم پیشاندەن، بەڵکوو، تەنیا هەر بۆ سەرکوتانەوە و هێرشکردن بووە. بۆیە منیش، بە شێوەی « ساتیر » وەڵاممداونەتەوە! بەڵام، هێندێ لە بەرهەمەکانم، بایەخێکی زۆریان پێ دراوە، لەبەرئەوەی، لە قازانجی لایەنێکی ڕامیاریی « کوردستانیی »دا بوون و بە زیانی لایەنێکی دیکە شکاونەتەوە، بێ ئەوەی، مەبەستم لە هیچیان بووبێ!

لێرەدا، هەر بۆ نموونە دەڵێم: هێندەی « یەکێتی نیشتمانیی کوردستان »، بایەخیان بەو دوو چاوپێکەوتنە داوە، کە لەگەڵ مامۆستایان « برایم ئەحمەد » و « جەرجیس فەتحوڵڵا »دا کردوومە، هێندە بایەخیان، بە هیچ بەرهەمێکی من نەداوە! هەروەها، هێندەی « کۆمەڵی ئیسلامیی »ش، بایەخ بەم چاوپێکەوتنە دەدەن، هێندە بایەخ، بە هیچ بەرهەمێکی دیکەی من نادەن. ئەمەش، عەرەب گوتەنی، تەنیا هەر ئەوە دەگەیەنێ و دەسەلمێنێ: هەر کەسێ، گۆرانیی بۆ « لەیلا »ی خۆی دەچڕێ!

له ڕاستییدا، سەرەتا، سەرنجێکی سەرپێیم، له باری سەرنج و ڕەخنەکەی گوتارنووس دا و زۆر بە وردیی نەمخوێندەوە. بۆیە، تەنیا هەر ویستم، وەلامی ئەو دوو خاڵەی بدەمەوە. بەلام، کاتێ بە قووڵیی لێی وردبوومەوە، بڕیارەکەم گۆڕی. چونکە، گەر گوتارنووس، پەلی بۆ هێندێ بابەتی زمانەوانیی نەهاویشتایە، هەڵبەتە، تەنیا هەر ئەو لایەنەم بەسەردەکردەوە. بەلام، لەبەرئەوەی هەولیداوە، لەو زەریا قووڵە بێ بنەی زمانەوانییدا پەل بکوتێ، پەشیمانبوومەوە و باری سەرنجەکەم گۆڕی. ئێستەش، با سەرنجێکی بە وێژدانانە، لە سەرجەمی گوتارەکەی بدەین، تا بزانین، لە دیوەخانی شێوە و نێوەڕۆکی گوتارەکەی گوتارنووسدا، چ باسە؟!!
پێموایە، لە چاو ئەوەی گوتارنووس « ناسیۆنالیست !» نییە و وەک هەموو « ئیسلامیی »یەکی دیکە، بایەخێکی زۆر، بە زمانی نەتەوەیی نادا و زمانە ئایینییەکەی لا گرنگترە، تا ئەندازەیەک، گوتارەکەی لە ڕووی زمان و داڕشتنەوە، بە شێوازێکی باش نووسیوە. بەلام، لەگەڵ ئەوەشدا، لە هێندێ جێدا، لاوازیی پێوە دیارە، کەموکوڕیی و هەڵەی تێدا هەیە. بۆیە بە پێویستم زانی، هەلوێستەیان لە سەر بکەم و ڕوونیانکەمەوە. بۆ نموونە:
گوتارنووس، لەو کورتیلە گوتارەدا، گەلێ ووشەی بیانیی « عەرەبیی » بەکارهێناوە، لە کاتێکدا، بەرانبەرەکانیان لە مێژە، لە زمانی کوردییدا هەن. وەک: « خزمەت، حیزب، سیاسی، حاڵ، حاڵەت، شۆرە، خیانەت، زەین، ڕەفزکردن، مەسەلە، حەقیقەت، جەدەل، عەلمانی، کتێب، فیکریی، مەزهەبیی، زیاد، حەق، ئەدەبی، وەسف، باقی، ئەمنی، ئیجابی، تەعمیم، تەئکید و حەساسییەت »
سەیر ئەوەیە، لە خاڵی دوودا نووسیوێتی: « نووسەر لە کۆتایی پێشەکییەکەیدا تەئکیدی لەسەر ... » کەچیی، هەر سێ دێڕ دوای ئەوە، بەرانبەرەکەی بە کوردیی بەکارهێناوە و نووسیوێتی: « هەموو نووسەرە ناسیۆنالیستەکان جەخت لەسەر ... » کە ئەمە، بە لاوازیی و کەموکوڕیی دادەنرێ. چونکە، کاتێ دەبێ، نووسەران پەنا بۆ بەر، زمانێکی دیکەی بیانیی بەرن و ووشەی لێ بخوازن، کە لە زمانە زکماکەکەی خۆیاندا نەبێ!
گوتارنووس، ئامرازی پێوەندیی « کە »ی پتر لە پێویست دووبارەکردۆتەوە و « 30 » دانە جار، لە گوتارەکەیدا بەکاریهێناوە. لە کاتێکدا، لە هێندێ جێدا دەیتوانی، خۆی لێ بپارێزێ و بەکاری نەهێنێ! بۆ نموونە: لە بەشێکی گوتارەکەیدا نووسیوێتی: (... بەڵکو زۆربەی زمانەکانی جیهانی

سێیەمی گرتۆتەوە، کەلەپاشکۆیەتییەکی ڕۆشنبیریدات، بەڵام ڕێگە چارەیەک کەتا ئێستا هەبێ ئەوەیە کەهەر زاراوەیەک کەدەخرێتە ناو زمانێکی ترەوە ...) وەک دەبینین: لە دوو دێڕی نووسینەکەیدا، چوار جار، ئەو ئامرازەی دووبارەکردۆتەوە. ئەم نەخۆشییەش، تەنیا هەر تووشی گوتارەکەی ئەم نەبووە، بەڵکوو پەتایەکە، جەستەی نووسینی، زۆربەی زۆری نووسەرانی کوردی گرتۆتەوە و وەک پەڵەیەکی ناشیرین، نووسینەکانی لاواز و بێ پێز کردوون. ڕەنگە، مرۆ لە کاتی ئاخافتندا، ئەو ئامرازە زۆر بەکاربێنێ، بەڵام، لە نووسیندا، کارێکی باش نییە و دەقە وێژەییەکە خەوشداردەکا!

گوتارنووس، نیشانەکانی خاڵبەندیی، زۆر بە کەمیی بەکارهێناوە. بە تایبەتیی، کاتێ هێندێ ناوی نووسیوە، پێویستبوو، لە نێوان دوو کەوانەی پچووکدا دایانێ. « وێرگول » و « خاڵ »یشی، لە جێی پێویستی خۆیدا بەکار نەهێناوە.

لە هێندێ جێی نووسینەکەشیدا، لە ڕووی داڕشتن و زمانەوە هەم لاوازیی پێوە دیارە و پێڕەوی داڕشتنی دەقی « عەرەبیی » کردووە، هەم هەڵەشی تێدا هەیە. بۆ نموونە:

پێموایە ڕۆشنبیران خاوەن کاریگەرین و یەکەم بەرپرسیاریشن لەهێنانەدی ئەو کەشە ویستراوەدا.

پێموایە ڕۆشنبیران، کارتێکردنی خۆیان هەیە و یەکەمین بەرپرسیاریشن، لەوەی ئەو کەشە ویستراوە بەدیبێنن.

... جگە لەناتەبایی و کێشە دروستکردن هیچی دی چاوەڕێ ناکرێ، چونکە هیچ کەسێک بەو کارەی ناتوانێ بەرامبەری بسرێتەوە.

... جگە لە ناتەبایی و کێشە دروووستکردن، هیچی دی لێ چاوەڕێ ناکرێ، چونکە هیچ کەسێک، بەو کارەی ناتوانێ بەرامبەرەکەی « یا بەرامبەرەکەی خۆی » بسرێتەوە.

هەروەها، هێندێ هەڵەی ڕێنووس و زمانەوانیی دیکەشی تێدا هەیە. دیارە هەڵەی ڕێنووس، خەتای گوتارنووس نییە، بەڵکوو، بۆ دەستەی نووسەران دەگەڕێتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، کارێکی خراپ نییە، گەر هێندێکی دەسنیشانکەم. لە زۆر شوێندا پێویستبوو، هێندێ ووشە بە دوو « ی »، یا بە دوو « و » بنووسرێ، بەڵام، بە یەک پیت نووسراوە. جگە لەوەی، ئامرازەکانی « پێوەندیی و لێکدەر »، ڕاناوی سەربەخۆ، بە هیچ شێوەیە، لەگەڵ ناو و ووشەکاندا پێکەوە نالکێنرێن.

خۆزەگەم، نووسەرانی کورد، جیاوازییان لە نێوان زمانی ئاخافتن و نووسین، قسەی دەمیی و دەقی نووسراودا دەکرد! بۆ نموونە: کاتێ دەبێ، بنووسین: نووسەر « دەڵێ یا گوتی » کە شتێکی بە دەمیی، بۆ نووسەرەکە گێڕابێتەوە. بەڵام، گەر کۆپلەیەکی، لە دەقێکی نووسراوەوە وەرگرت، دەبێ، بنووسێ: « نووسیوێتی ». چونکە، ئەز بەرانبەری دا نەنیشتووم و قسەی بۆ بکەم، تا بنووسێ: « دەڵێ ». جگە لەوەی، « دەڵێ » هەر نابێ، بەڵکوو « گوتوویەتی » ڕاستترە، چونکە، کارەکە کراوە و تێپەڕبووە، نەک ئێستە بێ!

لەبەرئەوەی، پاشخانی خوێندەواریی و ڕووناکبیریی، زۆربەی نووسەرانی کورد، کوردیی نییە و لە سەر بنچینەی زمان و کەلتووری نەتەوەی عەرەب هەڵچنراوە، هێندێ جار، ووشە و زاراوەی کوردیی، لەبری ووشە و زاراوەی عەرەبیی، بە هەڵە بەکاردێنن. لەبەرئەوە، لە جێی خۆیدا نییە و ئەو واتایە نابەخشێ. بۆ نموونە: ئەز لەو باوەڕەدام، جیاوازیی لە نێوان « کاریگەریی » و « کارتێکردن »دا هەیە. کەچیی نووسەران، هەر دووکیان هەر بۆ یەک مەبەست بەکاردێنن، لە کاتێکدا، واتاکانیان جیاوازە. چونکە، « کاریگەریی » بە « فەعال » و « کارتێکردن »یش بە « تەئثیر » دێ، وەک ئەوەی دەڵێین: ڕۆڵێکی کاریگەری بینی. یا کارێکی زۆری تێکرد.

هەروەها، زۆربەی نووسەرانی کورد، پلەی ئەکادێمیی « دوکتۆر »، بە هەڵە دەنووسن. لە کاتێکدا، باشتر وایە، لە بنەڕەتدا چۆنە « **Doctor** »، هەر واش بینووسین. بەڵام، وا دیارە، ئەمەش وەک زۆر شتی دیکە، لە نووسەرە عەرەبەکانەوە فێربوون، بنووسن « دکتۆر » !

پێش ئەوەی، وەڵامی ئەو دوو خاڵەشی بدەمەوە، بە پێویستی دەزانم، باری سەرنجی تایبەتیی خۆم، دەربارەی هەر دوو زاراوەی « سیکولاریزم » و « ناسیۆنالیزم » ڕوونکەمەوە.

ئەز، لە ڕووی بیرەوە، خۆم بە « ناسیۆنالیست » دەزانم و باوەڕێکی تەواویشم بە « دێمۆکراسیی و سیکولاریزم » هەیە. بەڵام لە هەمان کاتدا، ئەو « سیکولاریزم »ەی، ئیسلامی ڕامیاریی تێیگەیشتووە، هەرگیز باوەڕم پێی نەبووە و نییە. چونکە، بە هەموو بوونمەوە، دژی بێ باوەڕیی بووم، خۆم بە موسوڵمان زانیوە، باوەڕێکی تەواو و لەبننەهاتووشم، بە خوای خۆم هەبووە و هەیە. « سیکولاریزم »یش لای من، تەنیا هەر ئەوەیە: کاری ڕامیاریی و دەوڵەت، لە کاری خواپەرستیی و ئایین جیاکرێتەوە. ئەگینا، چۆن بە هەموو شێوەیە هەوڵدەدەم، « سیکولاریزم »ێکی پڕ لە گومڕایی،

بێ باوەڕیی و دژایەتییکردنی خوا ڕەتکەمەوە، وەک چەکێکی کوشندە، دژی ئایین بەکار نەهێنرێ، بە هەمان شێوەش هەوڵدەدەم، ئیسلامی ڕامیاریی، بە ناوی دژایەتییکردنی « سیکولاریزم »ەوە، هەموو کارتەکان تێکەڵاو نەکا و دژی هەموو هێزە « کوردستانیی »یەکان بوەستێتەوە!
ئێستەش، کاتی ئەوە هاتووە، سەرنجێکی ورد، لەو دوو خاڵە بدەم، کە مەبەستی سەرەکیی، نووسینەکەی گوتارنووس پێکدێنێ!
لە خاڵی یەکەمدا نووسیوێتی:(لەهەڵسەنگاندنەکەیدا بۆ کۆمەڵی ئیسلامیی کەبەچەند خاڵێک نووسیویەتی، لەخاڵی سێیەمدا دەڵێ(نوێژ لەمەڵبەندەکەیان دەکەن و هاتوچۆی مزگەوت ناکەن، لەوەدەچێ بڕوایان بەمەلای مزگەوتەکانی کوردستان نەبێ)
جارێ، پێش هەموو شتێ، هەر نووسەرێ، دەقێکی لە نووسینی نووسەرێکی دیکەوە خواست، دەبێ، وەک خۆی چۆنە، هەر بەو شێوەیەش بیگوێزێتەوە. من نووسیومە: « لەوە دەچێ، باوەڕیان... » نەک « بڕوایان » وەک ئەو نووسیوێتی!
پاشان نووسیوێتی: (دەبوایە کاک دکتۆر کاتێ سەرنجێکی وای لاگەلاڵە دەبێ، بەدوای وەلامەکەشیدا بگەڕێ، نەک تەنیا بیوروژێنێ و بەس، هەقبوو وەکو باقی پرسیارەکانی تر ئەم پرسیارەشی لەماموستا بکردایە.) ئەمە زۆر ڕاستە. بەلام ڕەنگە، لە کاتی چاوپێکەوتنەکەدا، ئەو باری سەرنجەم لا درووست نەبووبێ. بەڵکوو، کاتێ پێشەکییەکەم نووسیوە، شەن و کەوی بیرەوەرییە کەم و کورتەکانی، ئەو چەن کاژێرەم کردووە، ئەوەم بیرکەوتبێتەوە!
جگە لەوەی، نەک هەر ئەو پرسیارە، بەڵکوو، ئێستە هەستدەکەم و دەزانم، هێندێ پرسیاری دیکەش هەبوون، ئەو کاتە لە یادم نەبوون، ئاراستەی ماموستایان بکەم!
پاشان نووسیوێتی: (چونکە من دڵنیام ئەم هەڵوێستە لەو بۆچوونەوە سەرچاوە ناگرێ کەنووسەر وتوویەتی، بەڵکو لەوانەیە حاڵەتی ئەمنی یا هەر شتێکی تر بێت، چونکە کۆمەڵی ئیسلامیی هەر لەسەرەتاوە ڕایگەیاندووە کەهەڵوێستی ئیجابییە بەرامبەر ماموستایانی ئاینی و هەموو خەڵکی کوردستان، ماموستاش لەچەندین وتارو کۆڕو کۆبوونەوەدا ئەو هەڵوێستەی بەئاشکرا ڕاگەیاندووە، ئەمە لەلایەک، لەلایەکی ترەوە هەڵوێستێکی لەوجۆرە، لەشوێنێکی دیاریکراودا تەعمیم ناکرێ بەسەر هەموو شوێن و کاتەکانی تردا، لەوانەیە تێبینی و پرسیار لەسەر

مامۆستایەک یا چەند مامۆستایەکی ئاینی هەبێ بەڵام ئەمە ئەوەناگەیەنێ کەسەرجەم مامۆستا ئاینییەکانی کوردستان وەکو یەکبن، من پێموایە کەمامۆستایانی ئاینی لەکوردستاندا دەوری ئیجابییان هەبووە لەگەڵ بوونی کەم و کوڕی و چاوپۆشیش لەزۆر شت، نموونەی زۆر مامۆستا هەیە کەلەسەر حەقبێژی و هەڵوێستی نیشتمانپەروەرانەیان تیاچوون،)

ئەز پێموایە: ئەوە ڕاستییەکە و دوولەت ناکرێ، هەموو گرووپەکانی ئیسلامیی ڕامیاریی بە گشتیی، ئیسلامییەکانی « کوردستان » بە تایبەتیی، باوەڕیان بە مەلای مزگەوت و مامۆستایانی ئایینیی نییە، گەر لەگەڵ خۆیاندا کار نەکەن، یا لە دید و بۆچوونەکانی خۆیانەوە نزیک نەبن. خۆ گەر نێوانیان باش نەبێ و دژایەتییانبکەن، ئەوا گەلێ خراپترە! لە هەمان کاتیشدا، ئەوانیش، باوەڕیان بەو ڕێباز و هەڵوێستانەی ئەوان نییە. چونکە، زۆربەی زۆریان، جیاوازیی لە نێوان خواپەرستیی ڕاستەقینە و پارتی ڕامیاریی ئیسلامییدا دەکەن.

دڵنیاشم لەوەی، گەر ڕۆژێ لە ڕۆژان، هەر گرووپێکی ئیسلامی ڕامیاریی لە « کوردستان »، توانای ئەوەی هەبێ و دەسەڵات وەرگرێ، ئەوا مەلا و مامۆستا ئایینییەکان دەبێ، خۆیان لێ نزیککەنەوە، لە دید و بۆچوون، کردار و ڕەفتارەکانیان بێ دەنگبن. ئەگینا، زۆربەیان دەگۆڕن و کادێرەکانی خۆیان، لە جێیان دادەنێن، هەر وەک پارتە « سیکولار »ەکان، لە جیهانی دواکەوتووی نادیمۆکراسیی خۆرهەڵاتی نێوەندددا، ئەو کارەیان کردووە. چونکە، لێرەدا تەنیا هەر ئایدۆلۆژیا، ڕۆڵی تایبەتیی خۆی دەبینێ، نەک خواپەرستیی و ئایینداریی، مەبەستی سەرەکیی، ئەو گرووپانە بێ! هەر کاتێکیش ئایدۆلۆژیا، پێش هەمو شتەکانی دیکەوە خرا، ئەوا وەک عەرەب گوتوویەتی: « حابل و نابل » تێکەڵدەبن! ئەگینا، گەر تەنیا هەر خواپەرستیی و ئاییندرایی ڕاستەقینە، مەبەستی سەرەکیی ئەو گرووپە ئیسلامییانە بووایە، ئەوا، ئەو هەموو گرووپ و کۆمەڵە ئیسلامییانە، لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا بۆ دادەمەزران؟ بۆ تەنیا هەر، یەک پارتی ئیسلامیی سەرەکیی و بەهێز درووست نەدەبوو؟!!

ئاخر، خۆ مزگەوتی « جیهاد »یش لە « سولەیمانیی »، نموونەیەکی زیندووی لەبەرچاوە، کە زۆربەی زۆری ئەوانەی هاتوچۆیدەکەن، خۆیان لە « کۆمەڵی ئیسلامیی » بە تایبەتیی و گرووپە ئیسلامییەکانی دیکە بە گشتییدا دەبیننەوە. بە تایبەتیی، نوێژی ڕۆژی « هەینیی »، هەر لە ئەوێ دەکەن و شێوەی کۆبوونەوەیەکی ڕامیاریی بە خۆیەوە گرتووە!

ڕاستە، منیش پێموایە: هەموو مەلا و مامۆستا ئایینییەکان، نەک هەر لە « کوردستان »، بەڵکوو، لە هەموو جیهانی ئیسلامییشدا، وەک یەک نین. چونکە، کەم مامۆستای ئایینیی هەبووە، لە ئاستی زۆرداریی نەتەوەیی و چەوساندنەوەی کۆمەلایەتییدا، بەدەنگهاتبێ و خوێنی خۆی، لە ڕێی خوا، نیشتمان و کۆمەلانی خەڵکدا، لە کاسە کردبێ! بەڵکوو، زۆربەی مەلا و مامۆستا ئایینییەکانی « کوردستان »، زۆربەی کات، وەک دارشەقی بن هەنگڵی « دەرەبەگ، ئاغا، خان و شێخ »ەکان وابوون. هەمیشە، لە دیوەخانەکانیاندا ئامادەبوون، دیاریی و یارمەتییان لێ وەرگرتوون. لەبەرئەوە، لە ئاستی زۆرداریی کۆمەلایەتییدا بێ دەنگبوون. چاوپۆشییان، لە چەوساندنەوەی چینی ڕەشوڕووتی جوتیارانی کورد کردووە. هەر بە چاو سوورکردنەوەیەکی ئەو دەسەلاتدارە تەنگەئەستوورانە، یا بە دەم چەورکردنیان، بە دەیان بەڵگەی « شەرعیی »یان بۆ هێناونەتەوە، ڕەوایان بە ناڕەوا و ناڕەواشیان بە ڕەوا بۆ لێکداونەتەوە! هێندێ جاریش، ڕاژەیەکی باشی، سەرانی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی « کوردستان »یشیان کردووە. بەلام، خۆ نموونەی چەن کەڵەپیاوێکی گەورە و لە بنەماڵەیەکی ئایینیی ناوداری کوردی وەک « شێخ عوبێدوڵلای شەمزینیی، شێخ عەبدولسەلامی بارزانیی، شێخ مەحموودی بەرزنجیی، شێخ سەعیدی پیران، قازی موحەمەد، شێخ سەعیدی نەورەسیی ... »، تاهەتایە، وەک چەن ئەستێرەیەکی گەش و پرشنگدار، لە ئاسمانی ڕوون و خاوێنی شینی خەباتی خواپەرستیی و کوردایەتیی ڕاستەقینەدا دەدرەوشێنەوە!
لە کۆتایی خاڵی یەکەمیشدا نووسیوێتی:(ئەوەشمان بیرنەچێ کۆمەڵێک مامۆستای ئاینی کوردستان بوون سەرەتاکانی بزاڤی ئیسلامیی چەکدارییان دروست کرد، وابزانم مامۆستا ئەوەشی باش بۆ کاک دکتۆر ڕوونکردۆتەوە لەوەلامەکانیدا.)
ڕاستە، ئەو کۆمەڵە مەلا و مامۆستا ئایینییە بەڕێزانە، کورد بوون، ئەو کارە پیرۆزەیان جێبەجێکردووە. بەلام، ئەز دڵنیام، گەر ئەو کۆمەڵەی گوتارنووس مەبەستێتی و باسیکردوون، دەسیان بە کاری ڕامیاریی نەکردایە، لەگەڵ خواپەرستییدا تێکەڵیان نەکردایە، بەشدارییان لە شۆڕشی گەلی کورد لە « باشووری کوردستان »دا نەکردایە، ئێستە، هەر هەمان تێبینییان لە سەر دەبوو!
لەبەرئەوە، ئەو گرووپە ئیسلامییانە، تەنیا لەو ڕوانگەیەوە، لە مەلا، مامۆستا و زانا ئایینییەکانی « کوردستان » دەڕوانن، تا چەن لە

خۆیانەوە نزیکن! واتە: گەر کار لەگەڵ خۆیاندا بکەن، ئەوا زۆر باشن. بەڵام، گەر کاریان لەگەڵ نەکەن، دژیان نەبن و مەیلێکیان بۆیان هەبێ، ئەوا هەر باشن. گەر تەنیاش خواپەرستبن و ئایندارییی خۆیان بکەن، بایەخ بە ئەو گرووپە ئیسلامییانە نەدەن، ئەوا لەکن و چوونیەک نین!
لە خاڵی دووەمی گوتارەکەشیدا نووسیویتی: (نووسەر لەکۆتایی پێشەکییەکەیدا تەئکیدی لەسەر ئەوە کردۆتەوە کەبەکوردی پەتی دەنووسێ و زاراوە عەرەبییەکانیش دەکات بەکوردی.)
ئەمە ڕاستە. چونکە، لە هەموو بەرهەمەکانمدا، هەمیشە هەوڵمداوە، بە زمانێکی ڕەوان و سفتوسۆڵ، بە کوردییەکی پەتیی و ڕەسەن بنووسم. واتە: شێوە لە ڕاژەکردنی نێوەڕۆکدا بێ. بۆ ئەوەی بتوانم، ئەو بابەتەی دەینووسم و پێشکەش بە خوێنەرانی کوردی دەکەم، پێزی هەبێ، چێژدار بێ، لە بەرگێکی ڕازاوەی هونەریی جوان هەڵکێشرابێ، بە شێوەیەکی وێژەیی بەرز ڕازابێتەوە. ئەگینا، نێوەڕۆک بێ شێوەیەکی جوان، بێ دارشتنێکی وێژەیی بە پێز و بەرز، بێ زمانێکی وێژەیی، بێ کوردییەکی پەتیی و ڕەسەن، ئەو تام و چێژە، بە خوێنەر نادا و سەرنجیان، بە لای بابەتەکەدا ڕاناکێشێ، گەر باسی گرنگترین شتی ئەم جیهانەشیان بۆ بکرێ، هەر وەک گوتارنووس خۆشی، لە گوتارەکەی خۆیدا، باسی پێشەکیی نووسینەکەی منی کردووە، گەواهیی ئەوەی بۆ داوم و نووسیویتی: (پێشەکییەکە « سەرنج و تێبینی » دەقێکی ئەدەبیی جوانی چیرۆک ئامێزە، بەدەربڕینێکی هونەریی و زمانێکی پاراو، چەند وێنەیەکی هونەریی ئەفراندووەو وەسفێکی جوانی گەشتەکەی کردووە، من بەش بەحاڵی خۆم چێژێکی تایبەتیم لێبینی ...) چونکە، گەر وا نەبووایە، هەڵبەتە، ئەو چەن ووشەیەی نەدەنووسی!
ئینجا، با ئەوەش دەربڕم: مامۆستا « عەلی باپیر »، وەک مەلا و موسوڵمانێ، لە قسەکانیدا، ووشەی عەرەبیی بەکارهێناوە. منیش، ئەو ووشانەی بەرانبەرەکانیانم، لە زمانی کوردییدا زانیبێ، ئەوا بە کوردیی نووسیومن. ئەوانەی نەشمزانیبێ، یا نەبووبن، ئەوا بە زمانێکی دیکەی بیانیی نووسیومن. بۆیە نووسیومە: بە کوردییەکی پەتیی! ئەگینا، گەر چاوپێکەوتنەکەم، وەک خۆی بڵاوکردایەتەوە، لە ڕووی زمان و دارشتنەوە، لاوازدەبوو، ئەو تام و چێژەی نەدەبوو!
هێندەی من ئاگادارېم، هەموو ژۆرنالیستە سەرکەوتوو و شارەزاکانی جیهانیش، هەر وا دەکەن! کاتی خۆشی، لەگەڵ مامۆستادا، لە سەر ئەوە

پێکهاتووین، لە کۆتایی دوا کاسێتیشدا تۆمارمانکردووە. جگە لەوەی، گەر گۆڕانکارییەک لە چاوپێکەوتنەکەدا هەبووایە، یا لە هێندێ جێدا، واتاکەی تێکبدایە، هەڵبەتە، مامۆستا خۆی بەدەنگدەهات!
من هەر لە کۆنەوە پێموابووە و نووسیویشمە: (ئەز، لەگەڵ ئەوە دام، تا ووشەی ڕەسەن و شیرینی کوردییمان هەبێ، نابێ، پەنا بۆ بەر ووشەی بیانیی بەرین. لەبەرئەوە، هەرگیز لەگەڵ بۆچوونی ئەو نووسەرانەدا نیم، ماف بە خۆیان و خەڵکی دیکەش دەدەن، بە ئارەزووی خۆیان، گێرە لە خەرمانی، زمانی گەلانی دیکەی جیهاندا بکەن.)«441،1»
لەبەرئەوە، لە کاتی نووسیندا، تا ووشەی پەتیی و ڕەسەنی کوردییم چنگ کەوتبێ، هیچ ووشەیەکی دیکەم، لە زمانێکی دیکەوە نەخواستووە. ئیدی، لە هەر دیالێکت و خواردیالێکتێکی زمانی کوردییەوە بووبێ، ووشەکانم وەرگرتووە و هەمیشە، لە ووشەی بیانیی، پێم باشتر و جوانتربوون، بۆیە، خۆمم لێ پاراستوون.
بەڵام، گەر بەرانبەر هەر ووشەیە، یا زاراوەیەکی بیانیی، ووشەیە، یا زاراوەیەکی کوردیی گونجاوم بۆ نەدۆزرابێتەوە، ئەوا، تا توانیومە و هەوڵم داوە، ووشە و زاراوەی « لاتینیی » بەکاربێنم. یا، ئەو شتە لە زمانە ڕەسەنەکەیدا، چی پێ گوتراوە، هەر ئەو ووشەیە بەکاربێنم. بۆ؟ چونکە، نەک هەر من پێموایە، بەڵکوو، زۆربەی زۆری، شارەزا و پسپۆڕەکانی زمانی کوردییش، لەو باوەڕە دان، ووشە و زاراوەی « لاتینیی » بە تایبەتیی و زمانە « ئەورووپایی »یەکان بە گشتیی، لە زمانی کوردییدا بەکاربێنرێن، گەلێ باشترە. چونکە، لەگەڵ سروشتی زمانەکەماندا پتر دەگونجێن و لە ئەلفوبێی کوردییشەوە نزیکترن. هەروەها، پێشموابووە: (هەموو گەلانی سەر ڕووی زەویی، بێ جیاوازیی دەتوانن، کەڵک لە زمانی « لاتینیی » وەرگرن. ئەو ووشانەی هەر لە بنەڕەتدا، لە زمانە نەتەوەییەکەی خۆیاندا چنگ ناکەون، یا « پێشکەوتنی زانست، گۆڕانکارییە نوێکانی سەردەم و داهێنانە تێکنۆلۆژیاکان » دەیسەپێنن، زۆر بە ئاسانیی دەتوانرێ، زاراوەی لێ وەرگیرێ، بە مەرجێ، لەگەڵ تایبەتمەندێتی ئەو زمانەدا بگونجێ) «442،1»
هەر لەو بارەیەوە، دوکتۆر « کەمال ئەحمەد مەزهەر »یش نووسیوێتی: (چونکە دەتوانرێ، بە ئاسانیی، ووشەی لێ وەربگیرێ و ووشەی تازەی لێ پێکبێنرێ. لە ڕووی دەربڕینیشەوە، زاراوەکانی لە سەر زمان سووکتر و ڕەوانترن.)«81،2»

هەر چەندە، بە هەموو توانامەوە هەوڵمداوە، خۆم لە بەکارهێنانی ووشەی « عەرەبیی، فارسیی و توورکیی » دوورخەمەوە. بەڵام، لە هەمان کاتیشدا، گەر هەر ووشە و زاراوەی تایبەتییم، لە زمانی « کوردیی، لاتینیی » و زمانە « ئەورووپایی »یەکاندا دەس نەکەوتبێ، ئەوا بە ناچاریی، ووشە و زاراوەی « عەرەبیی » باوم بەکارهێناوە و لە نێوان دوو کەوانەدا نووسیومن.
جگە لەوەی، هەمیشە، لە نێوان زمانی کوردیی و ئەو سێ زمانەی، نەتەوە داگیرکەرەکانی « عەرەب، فارس و توورک »دا جیاوازییمکردووە. چونکە، گەر چیی، زمانی « عەرەبیی »، زمانی ئایینی هاوبەش و دەوڵەتیش بێ، بەڵام، لە چاو زمانی « فارسیی »دا، زۆر لە زمانی « کوردیی »یەوە دوورە. ئەوە لەگەڵ زمانی « توورکیی »دا، هەر بەراورد ناکرێن!
ئەز پێم وایە، گەر لە بنچینەدا، زمانی « فارسیی » و زمانی « کوردیی »، یەک زمان نەبووبن، ئەوا گومانی تێدا نییە، سەر بە یەک گرووپە زمانن. لەبەرئەوە، زۆر لە یەکدییەوە نزیکن و کورد دەتوانێ، بە ئاسانیی، ووشەی لێ وەرگرێ. هەر وەک « هێمن »یش نووسیوێتی: (ئێمە نابێ، گوێ بدەینە شۆڤێنیستەکانی فارس، کە دەڵێن: کوردیی شێوەیەکی فارسییە. بۆ خۆمان دەزانین، زمانەکەمان: زمانێکی سەربەخۆیە و ناترسین و نایشارینەوە، کە خزمایەتیی وە تەک فارسیشدا هەیە. زۆر باش دەتوانین، ووشەی فارسیی وەرگرین، وەک ئەوان کە لە وەرگرتنی ووشەی کوردیی و هیچ زمانێکی دیکە سڵ ناکەن. بەڵام، هەق نییە، لەباتی ووشەی « مەزن، گەورە، زەلام و زل » ووشەی « بـــزرگ »ی فارسیی بنووسین. یا لەجیاتی « جوان، چەلەنگ، دەلال و شەنگ »ی خۆمان، ووشەی « قەشەنگ » لەکاربێنین، کە توورک و فارس، کێشەیان لە سەر هەیە.)«28،3»
پێموایە: ئەمە ڕێی ڕاست و بەکارهێنانی ووشەی بیانیی بێ، نەک تەنیا ووشەی عەرەبیی بەکاربێنین، چونکە موسوڵمانین و ووشەی زمانەکانی دیکەش پشکوێخەین، چونکە گەلەکانیان، سەر بە ئایینێکی دیکەن!
پاشان نووسیوێتی: (هەموو نووسەرە ناسیۆنالیستەکان جەخت لەسەر بەکوردیکردنی زاراوەو دەربڕینەکان دەکەن، بەڵام پێمـوایە ئەوان مەبەستیان تەنها زاراوە عەرەبییەکانەو حەساسیەتیان تەنها لەگەڵ ئەواندا هەیە، چونکە لەقسەو نووسینەکانیاندا زاراوەی بیانی زۆر بەکاردەهێنن، بەتایبەتی ئینگلیزی، هەروەک دکتۆر حوسێن ـ یش هەمانکاری کردووە، بۆ نموونە « پرۆژێکتەر، کۆمەڵگای سیڤیل،

سیکولاریزم، پلۆرالیزم » ئەمانە خۆ هیچی کوردی نین، هەروەها کەویستوویەتی هەندێ زاراوەی تر بکات بەکوردی تەنها بەوەش عەرەبییەکەی بەوشەیەکی بیانی گۆڕیوە، بۆ نمونە « واقیع بینی = ڕیالبینی »، « ماددی = ماتریالی » ...)
ڕاستە، من خۆم بە « ناسیۆنالیست » دەزانم و شانازییشی پێوە دەکەم. پێشموایە، هەموو مرۆڤێ لەم جیهانەدا، ڕەگێکی « ناسیۆنالیستیی » هەر تێدا هەیە. چونکە، لە نیشتمانێکی دیارییکراودا لەدایکبووە و بە زمانێکی تایبەتیی دەپەیڤێ، ئەگینا، خۆ لە ئاسمانەوە نەباریوە؟!! بۆیە دەبێ، ئەو نیشتمان و زمانەی، لە هەموو نیشتمان و زمانەکانی دیکەی جیهان خۆشتربوێ. ئەمەش، کارێکی سروشتیی و ڕاستە، لەگەڵ هیچ دید و بۆچوونێکی ئایینیی و مرۆییدا ناکۆکیی نییە. خۆ پەیامبەری ئیسلام، چیای « ئوحود »ی خۆشویستووە و خۆشی فەرموویەتی: (« ئوحود » چیایەکە، خۆشیدەوێین، خۆشماندەوێ.) جا، گەر هەر کوردێکی نەگبەت بیگوتایە: چیای « قەندیل »، یا، هەر چیایەکی دیکەی نیشتمانەکەم خۆش دەوێ، ئەوا موسوڵمانە کوردەکان، شاخ و گوێیان لێ دەڕوان، بە کێویلەیان نێوزەددەکرد و دەیانگوت: تۆ چۆن، خۆڵ و بەرد خۆشدەوێ، ناشێ، بتپەرستبی؟!!
بەڵام، ئەز ئەو « ناسیۆنالیست »ە نیم، کە گوتارنووس لێی تێگەیشتووە. چونکە، « ناسیۆنالسیتیی » لای من تەنیا ئەوەیە: مرۆ خاکی نیشتمان و ڕۆڵەکانی نەتەوەکەی خۆی خۆشبوێ. ناپاکیی لە کورد و « کوردستان » نەکا. بۆ کێشە ڕەواکەی دڵسۆز و بە ئەمەک بێ. لەگەڵ ناڵەی هەژاران و چەوساوەکانی کورددا بێ. دژی ستەمی نەتەوەیی و داگیرکردن بێ. دژی چەوساندنەوە و زۆرداریی کۆمەلایەتیی بوەستێ. نەک بیر، فەلسەفە و ئایدۆلۆژیایەک بێ، لە وێنەی بتێکدا دایتاشێ و بیپەرستێ. لەبەرئەوە، ئەز هێندە « ناسیۆنالیست »م، تا بیر و ڕێبازەکەم، لە ڕازەی کۆمەلانی خەڵکدا بێ. ئەگینا، لە مێژە گوتوومە و نووسیویشمە: بیر و ڕێبازێ، فەلسەفە و ئایدۆلۆژیایەک، ڕیزەکانی نەتەوەکەم لەتوکوتکا، ڕۆڵەکانی لە سەر ئایدۆلۆژیا و لە پێناوی بەرژەوەندیی تەسکی پارتایەتییدا، دەسیان بە خوێنی یەکدی سووربێ، بە هەموو توانای خۆمەوە، ئەو فەلسەفە و ئایدۆلۆژیایە ڕەتدەکەمەوە. ئیدی، سەر بە هەر باوەڕ و فەلسەفەیەکی ئاسمانیی و زەمینیی بێ! ئاخر، ئایدۆلۆژیایەک، بۆ ئازادیی و خۆشیی مرۆ بە گشتیی و کورد بە تایبەتیی، بەگەڕ نەخرێ، کەڵکی چییە؟!!

ئایدۆلۆژیایەک، جگە لە «ماڵوێرانیی، وێرانکاریی، ئاژاوەنانەوە، ڕاونان و گرتن، کوشتن و برین، خوێنڕشتن و جینۆسایید »، هیچی دیکەی پێ نەبێ، بۆچی چاکە و بە کەڵکی کام گەل و نەتەوە دێ؟!!
لەبەرئەوەی، خۆم بە « ناسیۆنالسیت »ێکی دێمۆکراسیخوازی مرۆپەروەر دەزانم، بایەخێکی یەکجار زۆر، بە زمانە نەتەوەییەکەی خۆم دەدەم، گەشەپێدەکەم، پێشیدەخەم و تا دەتوانم، ئەو زمانەی خوای گەورە پێی بەخشیوم، لە هەموو زمانەکانی دیکەی جیهانم خۆشتردەوێ و ڕاژەی دەکەم. ئەمەش، نە هەڵەیە و نە « کفرە »، بەڵکوو بە تەواویی، لەگەڵ باوەڕە « ناسیۆنالیستیی » و خواپەرستییەکەمدا دەگونجێ و ڕێکدەکەوێ. چونکە، خوای پەروەردگار، بە کوردێتیی ئەفراندوومی و هەر بە کوردییش زمانی پژاندووم!
هەر بۆیە، لەو نامەیەی ڕۆژی « **2002. 10. 08** »، لە « سولەیمانیی »، بۆ مامۆستا « عەلی باپیر »م ناردووە، زۆر بە ڕاشکاویی نووسیومە:( بە ڕاستیی، گەر بە دەس من بووایە، « نوێژ، قورئان و فەرموودەکانی پەیامبەر »یشم دەکرد بە کوردیی! جا نازانم، بەڕێزت لەو بارەیەوە، چی دەڵێی؟ چونکە، گەر وا بڕوا، لە نێوچەی ژێر دەسەڵاتی ئێوە و لە ڕیزی پارتە ئیسلامییەکاندا، وردەوردە، ناوی « کوردیی » و سڵاو لە یەکدی کردنیش، بە « کوردیی » نامێنێ!)
ئەز پێموایە: کۆڵەکەی سەرەکیی نەتەوە، لە زمان پێکهاتووە. هەر بە هۆی زمانەوە، بە من دەڵێن: کورد و بە یەکێکی دیکەش دەڵێن: عەرەب. هەر بە هۆی زمانیشەوە، نەتەوەکان لە یەکدی جیادەکرێنەوە و لە یەک گرووپی ئێتنی هاوبەشدا کۆدەبنەوە.
ئەز، گەر وەک « ناسیۆنالیست »ێ، لە زمانی کوردیی بڕوانم، ئەوا، زۆر بە ڕاشکاویی دەڵێم و نایشارمەوە: لە هەموو زمانەکانی دیکەی گەل و نەتەوەکانی جیهانم خۆشتردەوێ. بۆ؟ چونکە، هەر بەو زمانە، پەردەی گوێم کراوەتەوە، بانگم بە گوێدا هەڵدراوە، بە منداڵیی کرۆگاڵمکردووە و فێری، یەکەمین ووشەی پیرۆزی « دایە و بابە » بووم! کاتێ ئازارێکم پێ گەیشتبێ، هەر بەو زمانە ناڵاندوومە. کاتێ، تووشی گرفتێ بووبم، هەر بەو زمانە، هاوارم لە خوای خۆم کردووە، تا بەدەنگمەوەبێ و یارمەتییم بدا. کاتێکیش، سەرکەوتنێکم بەدەسهێنابێ و بەختەوەربوویم، هەر بەو زمانە، خۆشیی خۆم دەربڕیوە. هەر بەو زمانەش دەتوانم، باشتر، جوانتر، پتر دید و بۆچوونەکانی خۆم دەربڕم، ڕاڤە لە هەست و هۆشی خۆم بکەم!

لەهەمان کاتیشدا، ئەو سێ زمانەی دیکەی « عەرەبیی، فارسیی و توورکیی »، زمانی زکماکیی من نین و بە من نامۆن. بەڵکوو، زمانی سێ نەتەوەی سەردەس و زمانی فەرمیی سێ دەوڵەتی داگیرکەر و نایاسایی « کوردستان » نەبن، هیچی دیکە نین و بە هیچ شێوەیە، لام پیرۆز نین!
بۆیە، تەنیا هەر زمانە « ئەورووپایی »یەکان، بە چەن زمانێکی بیانیی نازانم، بەڵکوو، ئەو سێ زمانەش، وەک سێ زمانی نامۆ و بیانیی تەماشا دەکەم. با، تێکەڵیی ئایینیشمان لەگەڵ « عەرەب » و خزمایەتی زمانیشمان، لەگەڵ « فارس »دا هەبێ! ئاخر، گەر ئەو نەتەوانە، هەر لە مێژەوە، « کوردستان »یان داگیر نەکردایە، ئێستە ڕۆڵەی کورد، بۆ ئەو سێ زمانەیان دەزانی؟ ئەدی بۆ زمانەکانی « چینیی، هیندیی، بەنگالیی، پورتوگالیی، مالایئیدۆنێسیی، ژاپۆنیی، ئۆردۆ، ... » نازانن؟!!
بەڵام، گەر وەک خواپەرستێکی ڕاستەقینە، لە ڕوانگەی ئایینەوە، لە زمانی کوردیی و هەموو زمانەکانی دیکەی، گرووپە ئێتنیکەکانی دیکەی جیهان بڕوانم، ئەوا، هەموو زمانەکانم، لا جوان و پیرۆزن. چونکە، هەموویان هەر یەزدانی مەزن درووستیکردوون، هیچیان دەسکردی هیچ کەس، ڕێکخراو، پارت و دەوڵەتێ نین، هەر وەک فەرموویەتی: (ومن اياته خلق السماوات والارض و اختلاف السنتكم و الوانكم ان فى ذلك لايات للعالمين.)
تەنانەت، زمانی نەتەوەیی، هێندە پیرۆز و پڕ بایەخە، خوای گەورە، پەیامبەرەکانی خۆشی، لە نێو نەتەوەکانی خۆیاندا هەڵبژاردووە و هەر بەو زمانەش ناردوونی، کە قسەیانپێکردووە، تا، باشتر لە یەکدی بگەن. وەک لە چەن جێیەکدا فەرموویەتی: (وما ارسلنا من رسول الا بلسان قومه ليبين لهم فيضل الله من يشاء و يهدى من يشاء و هو العزيز الحكيم.) (ولكل امه رسول فاذا جاء رسولهم قضى بينهم بالقسط و هم لا يظلمون.) (ولقد بعثنا فى كل امه رسولا ان اعبدوا الله و اجتنبوا الطاغوت فمنهم من هدى الله و منهم من حقت عليه الضلله فسيروا فى الارض فانظروا كيف كان عاقبه المكذبين.)
جا، گەر خوای گەورە خۆی، ئارەزووی لێ بووایە، هەڵبەتە، ئەم هەموو گرووپە ئێتنیکانەی درووست نەدەکرد، بەڵکوو، هەموو گرووپە ئێتنیکەکانی، لە یەک گرووپی دیارییکراودا کۆدەکردەوە. هەروەها، ئەم هەموو زمانەشی درووست نەدەکرد، بەڵکوو، تەنیا هەر یەک زمانی تایبەتیی درووستدەکرد! هەر وەک خۆشی فەرموویەتی: (ولو شاء ربک لجعل الناس امه واحده و لا يزالون مختلفين.)

لەبەرئەوە، هەر نەتەوەیەک، پارێزگاریی زمانی نەتەوەیی خۆی نەکا، هەوڵ بۆ « بوژاندنەوە، پێشکەوتن، گەشەکردن و پەرەسەندن »ی زمانەکەی خۆی نەدا، ئەوا وردەوردە، زمانەکەی لاوازدەبێ و دەپوکێتەوە. دووریش نییە، لە پاشەڕۆژدا لەنێونەچێ و نەتەوەکەش، تووشی گرفتێکی گەورەی زمانەوانیی و سایکۆلۆژیی ببێ!

ئەوەتە، ئێستە دەبینین: چ بزووتنەوەیەکی مەزن، لە جیهاندا هەیە، بە چ شێوەیە، هەموو نەتەوە پچووک و ژێر دەسەکان، هەوڵ بۆ بووژاندنەوەی زمانەکانیان دەدەن. تەنانەت، نەتەوە سەردەس و خاوەن دەوڵەتەکانیش، بایەخێکی یەکجار زۆر، بە زمانە نەتەوەیییەکانی خۆیان دەدەن و پێشی دەخەن. چونکە زمان، بە چرایەکی ڕووناک و گەشی، نێو ماڵی تاریک و نووتەکی هەموو نەتەوەیەک دادەنرێ، زۆربەی تایبەتمەندییەکانی نەتەوە، بە زمان دەردەبڕرێن و هەر لە زمانیشدا کۆدەبنەوە. خۆ هەر بە هۆی زمانیشەوە، گەلێ شتی گەورە و گرنگ، لە جیهاندا ڕوودەدەن.

گەر ئاوڕێکیش لە مێژوو بدەینەوە، تەماشایەکی سەردەمی « ڕێنیسانس » بکەین، ئینجا، بە تەواویی تێدەگەین، گەلانی « ئەوروپا »، لە نێوان ساڵەکانی « **1300- 1400** »دا، بە چ شێوەیە، بایەخیان بە زمانی نەتەوەیی خۆیان داوە. بە هۆی بوژاندنەوەی زمانەکەیانەوە، چۆن توانیویانە، پێشکەوتن بەدەسبێنن. لە کاتێکدا، چەندین پێشەوای مەزنی ناوداری وەک: « دانتی، پەترارک، پۆکاشیۆ، داڤینشی، میخایل ئەنجیلۆ و ئارازمس ... »، لە نێو گەلەکانی خۆیاندا هەڵکەوتوون، گەلێ شانازییان، بە زمان و کەلتووری نەتەوەیی خۆیانەوە کردووە، بایەخێکی زۆریان پێ داوە، گەلێکیان پێدا هەڵداوە و ڕازەیانکردووە. بۆیە بەو شێوەیە، تەلاری کۆشکی ڕازاوەی زمان، هونەر و وێژەی نەتەوەیی خۆیان، لە حەوت تەبەقەی ئاسمانی نیشتمانەکانیان تێپەڕاندووە. بۆ نموونە: هۆنەرێکی بە ناوبانگی وەک « دانتی »، لە بواری بزووتنەوەی « ڕووناکبیریی، وێژەیی، هونەریی، کاری ئەکادێمیی و ڕامیاریی »دا، شۆڕەسوارێکی بێ وێنەی سەردەمەکەی خۆی بووە. لەبری زمانی « لاتینیی »، زمانە نەتەوەیییەکەی خۆی بەکارهێناوە. ئەو کەڵەنووسەر و زانا گەورەیە، دەربارەی زمانی نەتەوەیی گوتوویەتی: (زمانی نەتەوەیی، لە توانایدا هەیە، پاڵ بە گەلەوە بنێ، گۆڕانێکی بنەڕەتیی تێدا پێکبێنێ.)«**93،2**»

بەڵام، زمان لای نەتەوەی باڵادەس، نەک هەر بە هەموو شێوەیە ڕازەکراوە، بەڵکوو، زمانەکەی خۆشیان، بە سەر گرووپە ئێتنیکەکانی دیکەی ژێر

دەسی خۆیاندا سەپاندووە. جا ئەو سەپاندنە، لە ڕێی دەسەڵاتی دەوڵەتەوە بووبێ، یا، بە هۆی زمانی ئایینی هاوبەشەوە بووبێ، یا لە یەک کاتدا، بە هۆی هەر دوو فاکتەرەکەوە بووبێ، ئەوا، شتێ لە باسەکەمان ناگۆڕێ!
کەچیی، لای نانەتەوەییەکانی « کۆمۆنیست و ئیسلامیی » نەتەوەی بندەس، هەرگیز، ئەو بایەخەی پێ نەدراوە. چونکە، هەم هەست و هۆشی نەتەوەییان لاوازبووە، هەم هەمیشە لە بۆتەی بیانییپەرستییدا تواونەتەوە و لە ئاستی زمانەکەی خۆشیاندا، کەڕ و کاسبوون!
گەرچیی زمانی « عەرەبیی »، بە زمانی دەوڵەت و « قورئان »یش ناسراوە، بەڵام لای من، هەر بە زمانێکی بیانیی و خۆسەپێنەری نەتەوەی باڵادەس دادەنرێ! هێندەی لە کۆنیشدا، مەلا و زانا موسوڵمانەکانی کورد، بایەخیان بە « ڕێنووس، ڕێزمان، وێژە و زمان »ی عەرەبیی داوە، نیو هێندە، بایەخیان بە زمانە خۆرسکە خواکردە زکماکەکەی خۆیان نەداوە. بەڵگەشم ئەوەیە: گەر کەمێ بایەخیان پێ بدایە، هەڵبەتە ئێستە، زمانی کوردیی، بە جۆرێکی دیکە دەبوو، بۆ هیچ ووشەیە دا نەدەمایین. ئەوانیش، لە لاپەڕەیەکی دیکەی گەشتر و پرشنگدارتری مێژووی وێژەی کوردییدا، ناویان تۆماردەکرا! *
لە ڕاستییدا، نەک هەر لەشم بە ووشە و زاراوەی عەرەبیی لیردەکا، وەک گوتارنووس نووسیوێتی، بەڵکوو، هەر هەمان باری سەرنج و تێبینییشم، بەرانبەر بە هەموو ووشە و زاراوەیەکی بیانیی هەیە، گەر ووشە و زاراوەی کوردیی هەبێ و بەکار نەهێنرێ. چونکە، ئەز پێمووایە: گەر زمانی « لاتین » و زمانە « ئەورووپایی »یەکانی دیکە، بە چەن زمانێکی بیانیی دانرێن، ئەوا، لە هەمان کاتدا، هەر سێ زمانی « عەرەبیی، فارسیی و توورکیی »، گەلێ لەو زمانانە، بە من نامۆ و بیانییترن. لەبەرئەوەی، زمانی نەتەوە و دەوڵەتە داگیرکەرەکانی « کوردستان »ن و بە زۆر بە سەرماندا سەپێنراون!
هەڵبەتە، نەک هەر گوتارنووس، بەڵکوو، هەموو ئەندامێکی ئەو گرووپە ئیسلامییانەی « کوردستان »، تەنیا هەر بەو شێوەیە، لە واتای ووشەی بیانیی تێگەیشتوون، هەر بەو شێوەیەش، لەو زمانانە دەڕوانن!

---

* بۆ زانیاریی پتر، تەماشای « زمانی ئایین و زمانی نەتەوەیی، زمانی دەوڵەت و زمانی نەتەوەیی » لاپەڕە « 74 - 140 »، پەرتووکی « سەلیقەی زمانەوانیی » بکە، زۆر بە درێژیی باسکراوە.

چونکە، زمانی داگیرکەری « عەرەب »، بە زمانێکی بیانیی نازانن، بەڵکوو، بە زمانێکی ڕەسەنی دەزانن و بگرە، لە زمانە نەتەوەییەکەی خۆشیان، پتر خۆشیاندەوێ و بایەخی پێ دەدەن. عەرەبە داگیرکەرەکانیش، بە برای دایک و باوکی خۆیان دادەنێن. بەڵام، سەیر ئەوەیە، لە هەمان کاتدا، کوردە « سیکولار »ەکان، بە دوژمنی باوەکوشتە و سەرەکیی خۆیان دەزانن!

کەچیی، ئەم هاوکێشەیە، لای زۆربەی هەرە زۆری، ڕۆڵەی نەتەوە و دەسەڵاتدارانی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی « کوردستان »، هەرگیز وا نەبووە و واش نییە. چونکە، چەن کەسێکی کەم نەبێ، ڕێزیان لە مافەکانی کورد گرتووە، ئەوانی دیکە، هەمیشە بە پێچەوانەوە ڕەفتاریانکردووە، بە تایبەتیی توورکەکان، چاویان بە هیچ جۆرە پێشکەوتنێکی کورد و سەربەخۆییەکی « کوردستان » هەڵ نەهاتووە و هەڵیش نایە! جا، هەر لە چەپەوە، تا ڕاست بیگرە، هەر لە « سیکولار »ەوە، تا بە ئیسلامییش دەگا، بە نێر و مێیانەوە، دانیان بە مافە نەتەوەیی و دیمۆکراسییەکانی گەلی کورددا نەناوە و ناشینێن. عەرەبەکانیش، کورد بە یەکەمین ڕێگر و کۆسپی، سەر ڕێی پێشکەوتنی عەرەب و سەربەخۆیی نیشتمانەکەیان دادەنێن. بە ناپاک و بەکرێگیراوی بیانیی تاوانباریدەکەن، وەک لەم دواییانەدا، لە کەناڵی « ئەلجەزیرە »وە، چەن ڕووناکبیر و ژۆرنالیستێکی ناوداری وەک: دوکتۆر « فەیصەڵ ئەلقاسم » و « ئەحمەد مەنصوور »، زۆر بە ڕاشکاویی، ئەم چەن کەللەشەکرەیان شکاند!

جگە لەوەی، چاویان لەو کەمە ئازادیی و نیمچە سەربەخۆییە بڕیوە، کە ئەوڕۆ، لە « باشووری کوردستان »دا هەیە و دەیانەوێ، ڕۆژێ زووتر، دەسیان ئاواڵەبێ، خۆیان بۆ لێدانی بزووتنەوەی کوردایەتیی تەرخانکەن و ئەو سەربەستییەی بە خوێن سەندراوە، تێکبدەنەوە و لەنێویبەرن! چونکە، بە نێوی برای ئایینییەوە، هیچ مافێ بە کورد ڕەوا نابینن، تەنیا هەر ئەوە نەبێ، لە ژێر ئاڵای یەک دەوڵەتی یەکگرتووی ئیسلامییدا، تا هەتایە، ئەوان برا گەورە و ئێمەش برا پچووک بین، وەک چەندین سەدە دەبێ، بەو شێوەیە، کوردیان چەوساندۆتەوە، بەو قەوانە سوواوە، مێشکی ڕۆڵەکانیان پڕکردووین، بە هەزارانیان لێ فووداوین، بە نێوی ئایینەوە، وولاتانی گەلانی جیهانیان پێ داگیرکردووین و بە هەزاران ڕۆڵەی کوردیان، بە خۆڕایی و لە پێناوی هیچدا، لە بەرەکانی جەنگدا بەکوشتداوە. بە تایبەتیی، گرووپە ئیسلامییە هاوڕێباز و هاوئایینزا

عەرەبە « سوونئە »کانی گوتارنووس، گەر ئەورۆ دەسیان هەبێ، ئەوا، لە ئاخووندەکانی « ئێران » کەمترمان پێ ناکەن!
لێرەدا دەمەوێ، کورتە باسێکی پێوەندییدار، تێکەڵ بە وەڵامەکەم بکەم. ئەز پێموایە: ئایینی ئیسلام، هەرگیز نەیتوانیوە، چارەسەری کێشەی نەتەوایەتیی بکا. چونکە، باوەڕی پێی نییە و لەو بوارەشدا، هیچی پێ نەبووە و نییە. ئەوەی هێندێ گرووپی ئیتنیکی دیارییکراویش، لە هێندێ دەوڵەتدا، بە ناوی چەن گرووپ و ڕێکخراوێکی ئیسلامی ڕامیارییشەوە، خۆیان ڕێکدەخەن، ڕادەپەڕن، خەباتی چەکداریی دەکەن و داوای مافی چارەنووس دەکەن، تەنیا هەر ئەوەیە: ئایینەکەیان جیاوازیی هەیە و نایانەوێ، لە بندەسی ئەواندا بن و نەتەوەی بالادەس فرمانڕەواییانبکا.
بۆ نموونە: ڕۆڵەکانی گەلی موسوڵمانی « فلەستین »، دژی هەموو دەزگە دەوڵەتیی و سەربازییەکانی دەوڵەتی « ئیسرایل » دەجەنگن. هەروەها، هەموو گەلانی دیکەی موسوڵمانی « کشمیر، فیلیپین، بۆسنە، چیچێنستان، کۆسۆڤۆ... » دژی گەل و نەتەوە سەردەس و داگیرکەرەکانی « فەلە » خەباتدەکەن.
بەڵام، گەر هاتوو، چەن گەلێکی دیکەی موسوڵمانی وەک: « عەرەب، توورک و فارس »، ئازادیی و سەربەخۆیی، لە گەلێکی دیکەی موسوڵمانی وەک « کورد » زەوتکەن، خاکەکەی لێ داگیرکەن و بیچەوسێننەوە، ئەوا دەبێ، هیچ نەڵێ و هیچ نەکا، بەو فرمانڕەوایی و ژێر دەسییە قایلبێ. چونکە، لە چوارچێوەی سنووری دەوڵەتێکی ئیسلامییدا دەژی و ئەمەش، لە لایەن یاسا و دەستووری ئیسلامەوە، بڕیاری لە سەر دراوە!
بۆیە، لە هیچ بەشێکی « کوردستان »، هیچ گرووپێکی ئیسلامی ڕامیاریی نابینین، دان بە مافە ڕەواکانی نەتەوەی کورددا بنێ! تەنانەت، گەر یەکێ لە گەلە موسوڵمانەکان، خاکی گەلێکی دیکەی ناموسوڵمانی وەک « جوو » یا « فەلە »ی داگیرکرد، ئەوا، بە هیچ شێوەیە بۆیان نییە، داوای مافی چارەنووسی خۆیان بکەن. بەڵکوو دەبێ، بەزۆریش بێ، هەر ملکەچی یاسا و بڕیارەکانی دەوڵەتە ئیسلامییەکە بن. نەک هەر ئەوەش، بەڵکوو دەبێ، سەرانەش بە دەوڵەتە ئیسلامییەکە بدەن! بۆ نموونە: دەسەڵاتدارە عەرەبە موسوڵمانەکانی « سۆدان »، خاکی « فەلە » ڕەشپێستەکانی « خوارووی سۆدان »یان زەوتکردووە و دان بە مافەکانیشیاندا نانێن!
بە ڕاستیی، ئەمە دید و بۆچوونی ڕامیاریی و نەتەوەیی ڕاستەقینەی، هێندێ لە هاوئایین و ئایینزاکانی گوتارنووسە، بەرانبەر بە نەتەوەی کورد

بە گشتیی و گەلی کورد لە « باشووری کوردستان » بە تایبەتیی، هیچ مافێکی نەتەوەیی پێ ڕەوا نابینن. ئیدی، بۆچی دەبێ، بە برای خۆمانیان بزانین، ئەو برایانەی ئامادەبن، لەگەڵ « توورک » و « فارس »دا هاوکاریی بکەن، بۆ ئەوەی، گەلێکی موسوڵمانی دیکەی وەک « کورد » لەنێوبەرن. یا، بە لانی کەمەوە، بە هیچ مافێکی نەتەوەیی و دێمۆکراسیی خۆی نەگا!
هەر چەندە، بە هەمــوو لێکدانەوەیەکــیش بێ، کــورد چ لە کــۆن و چ لە ئێستەشدا، زۆر لە ئەو گەلە سەردەسانە موسوڵمانتربووە و ئایینەکەشی، خاوێنتر ڕاگرتووە. بەڵام، ئەوان هەر خۆیان بە موسوڵمانی ڕاستەقینە دەزانن و دان، بە هیچ مافێکی نەتەوەیی کورددا نانێن. چونکە، جگە لە نەتەوەی ئیسلام، باوەڕیان بە هیچ نەتەوەیەکی دیکە نییە. جگە لە مافی ئیسلامیی، باوەڕیشیان، بە هیچ جۆرە مافێکی نەتەوەیی و دێمۆکراسیی نییە و هەر بە « کفر »یشی دەزانن!
لەگــەڵ ئەوەشــدا، هەســتی ئایینیی و هەســتی نەتەوەیی خــۆیان، زۆر زیرەکــانە و ژیرانە تێکەڵاوکــردووە، بە شــێــوەیەکی زۆر جــوان، دژی داگیرکەرانی وڵاتەکانیان بەکاریانهێناوە و بەکاریشیدێنن. لە هەمان کاتیشدا، مافی گرووپە ئیتنیکەکانی بندەسی خۆشیان، ناسەلمێنن و قووتیدەدەن! کەچیی، ئەم دید و بۆچوونە، بۆ گەلێکی موسوڵمانی وەک کورد، هەرگیز دەس نادا. چونکە، هەر دوو نەتەوەی داگیرکراو « کورد » و داگــیرکــەر « عــەرەب، توورک و فــارس »، یەک ئایینی هاوبەش کــۆیان دەکــاتەوە. لەبەرئەوە نابێ، بۆ خــاڵی هــاوبەش بگەڕێین، بەڵکوو دەبێ، بۆ خاڵی ناکۆکیی بگەڕێین، تا بە هۆیەوە، خۆمان لە ئەوان جیاکەینەوە. لەم بوارەشدا، تەنیا هەر، چەکی زمان دەتوانێ، ئەو کارە گرنگە جێبەجێکا.
بەڵام، هێندێ جار، گرووپە ئیسلامییەکانی « کوردستان »، هێندێ ئایەت و فەرموودەی پەیامبەر، بۆ مەبەستە تایبەتییەکانی خۆیان دێننەوە و لێکدانەوەی تایبەتیی بۆ دەکەن، کە لە ڕاستییدا، فڕێ بە سەر مافی چارەنووسی نەتەوەکانەوە نییە! بەڵکوو دەیانەوێ، بە هەر شێوەیەبێ، لەگەڵ بەرنامە و ڕێبازی ڕامیاریی خۆیاندا بیانگونجێنن، تا ئەو کەلێنە گەورەیە، لە ئایینی ئیسلامدا پڕکەنەوە و ئەندامە دەروێش ئاساکانی خۆشیانی پێ بخەڵەتێنن!*

---

* لە سەر نووسینەکانی مامۆستا، کۆڵینەوەیەکی تایبەتییم نووسیوە. بەڵام، دۆستایەتیی و ئەمەکداریم، ڕێی پێ نەدام و بە ڕاستم نەزانی، تا خۆی لە زینداندا بێ، بڵاویکەمەوە!

بەڵام، ئەم ئەرکە گەورە و گرانە پیرۆزە، پێش هەموو لایەنێ، بەرەڕووی گرووپە ئیسلامییەکانی « کوردستان » دەبێتەوە، بۆ ئەوەی، داوای دەوڵەتێکی یەکگرتووی « کوردستانی » بکەن، دەسی ئەو داگیرکەرە بازرگانانەی ئایین، بۆ ڕۆڵەکانی هەر دوو نەتەوەی سەردەس و بندەس، بۆ هەموو گەلانی ئیسلامیی ئاشکراکەن، تا چی دیکە، بە ناوی ئایینەوە، کورد نەکوژن و خاکەکەی داگیر نەکەن!
وەک کەمێ پێشتر ڕوونمکردەوە، بەپێی پێویستی نووسینەکە، بەگوێرەی بوون، یا نەبوونی هێندێ ووشە و زاراوە لە زمانی کوردییدا، پەنا بۆ بەر، زمانە جیاجیاکانی گەلانی جیاوازی جیهان دەبەم. ئیدی، بەو شێوەیەی بگونجێ و باوەڕم پێی هەبێ، ووشە و زاراوەی گونجاویان، لێ دەخوازم و بە شێوەیەکی شیاو، لە نووسینەکانمدا بەکاریاندێنم. ئەگینا لە ڕاستییدا، ڕۆژێ لە ڕۆژان، بیرم لەوە نەکردۆتەوە، زاراوە بۆ زمانی کوردیی داتاشم. چونکە، ئەو کارە پسپۆڕی تایبەتیی خۆی دەوێ، منیش، لەو بوارەدا، زۆر دەس و پێ سپیم! لەبەرئەوە، وەک گوتارنووس نووسیوێتی، من زاراوەم دانەتاشیوە. ئەوەی ئەویش بە نموونە هێناویێتییەوە، ئەوە ناگەیەنێ، ڕاستیی پێکابێ!
ئینجا، با کەمێ باسی ئەو نموونانە بکەم، کە گوتارنووس لە نووسینەکەی مندا هەڵیبژاردوون. دەربارەی ووشە و زاراوەکانی « پرۆژێکتەر، سیڤیل، سیکولاریزم و پلۆرالیزم »، گومانی تێدا نییە، هەر هەموویان کوردیی نین. بەڵکوو لە زمانە « ئەورووپایی »یەکانەوە وەرگیراون و تەنیا « ئینگلیزیی»ش نین، وەک گوتارنووس تێیگەیشتووە!
هەروەها، تەنیا هەر کوردیش، ئەو زاراوە جیهانییانە بەکار ناهێنێ، بەڵکوو، زۆربەی زۆری گەلانی جیهان و نەتەوەی عەرەبیش بەکاریاندێنن، لە کاتێکدا، ئەوان وەک کورد، خاکیان داگیر نەکراوە، دەیان ساڵیش دەبێ، دەوڵەتی نەتەوەیی تایبەتیی خۆیان دامەزراندووە، چەندین دەزگەی « هونەریی، ویژەیی و زانستیی »شیان هەیە، ئینجا، هەر پەناش بۆ ئەو زاراوە جیهانییانە دەبەن. ئاخر، چی بکەن، گەر ئەو ووشە و زاراوانە بەکار نەهێنن؟!! خۆ ناتوانن، هەموو ئەو ناو و زاراوانەی ئەوڕۆ هەن، وەک: « ڕادیۆ، تێلێفیزیۆن، ڤیدیۆ، سینەما، تێلێفۆن، کۆمپیوتەر، دیسک، کاسێت، کامێرا، فیلم، پرۆژێکتەر، فرێزەر، دیمۆکراسیێ، دیکتاتۆریی، بۆرژوازیی، قانون، دوکتۆر، پرۆفیسۆر، گرووپ، فۆنەتیک، فۆنیم، پرۆژە، دیالۆگ، فەلسەفە، ئایدۆلۆژیا ... » بگۆڕن و بەرانبەرەکانیان داتاشن!

جـا، گـەر ئەوان وابن و لە نووسـینەکـانیـاندا، ئەو زاراوانـە بەکـاربێنن، ئێمـەی کورد، کە لە هەموو مـافێکی نەتەوەیی خۆمـان بێ بەشکراوین، گەر بەو شـێـوەیە نەیاننووسین و بەکـاریان نەهێنین، ئیـدی دەبێ، بە چ شێوەیەکی دیکە بیاننووسین؟ ئایا، گوتارنووس پێم نالێ، لەبری ووشـەی « پرۆژێکتـەر »، چی دیکە بەکـاربێنم؟ ئەز پێم وایە، خـۆیان بەکـاربێنین، گەلێ لەوە باشترە، زاراوەی نالەباریان بۆ داتاشین و واتای ڕاستەقینەی خۆشیان بەدەسەوە نەدەن!

ڕاسـتـە، ئەو ووشـانە کـوردیی نین، کـەچیی، نووسـەرە مـوسـوڵمـانەکـان خۆشیان بەکاریاندێنن. گەر تەماشای نووسینەکانی مامۆستا « عەلی باپیر » بکەین، لە زۆر شوێندا، هێندێ لەو ووشە و زاراوانە دەبینین.

سەیر ئەوەیە، گوتارنووس ڕەخنەی ئەوەی لێ گرتووم، کە ووشەی بیانییم بەکارهێناوە. کـەچیی، گەر من لە « **200** » لاپـەڕەدا، « **4 - 5** » ووشـەی بیانییم بەکارهێنابێ، ئەوا خۆشی، لەو کورتیلەگوتارەدا، « **25** » ووشـەی عـەرەبیی و « **9** » ووشـەی دیکەشی، لە زمـانە « ئەورووپایی »یەکـانەوە خواستووە و لە نووسینەکەیدا بەکاریهێناون. لەگەڵ ئەوەشدا، هێشتا ئەو گلەیی لە من کردووە، تۆ بڵێی، ئەمە گەڕی بارەتریێ نەبێ؟!!

پێشم وا نییـە، زاراوە بەو شـێـوە داڕێژرێ، وەک گـوتارنووس بۆیچووە. چونکە، هـەر وەک چۆن، « ڕیاڵبین » زاراوەیەکی کـوردیی نییە، بە هەمـان شێوەش، « واقیـعبین » هەر زاراوەیەکی کوردیی نییـە! لەبەرئەوەی، هەر یەکەیان، لە دوو ووشـەی جیـای، سـەر بە دوو زمـانی جیـاواز پێکهـاتوون. دیارە، هەر دوو ووشەکەش کوردیی نین. بەڵام، لەبری « واقع »ی عەرەبیی، « ڕیاڵ »م بەکارهێناوە، چونکە، گەلێکم پێ جوانتر و لەبارترە.

ئەمـە، هەر وەک ئەوە وایە، کوردەکـانی « باکوور و خـۆراوای کوردستان »، لەبری هـەر دوو ووشـەی ڕەسـەنی کـوردیی « ئەزمـوون و تاقـیکردنەوە »، ووشەی « تەجرەبە »ی عەرەبیی بەکـاردێنن و دەڵێن: « جەڕباندن !» ئاخر، ئەمە کوێی کوردییە؟!!

بۆ نموونە: کـاتێ، لەبری زاراوەی « حیزب »ی عـەرەبیی، زاراوەی « پارت » بەکـاردێنین، باشـتـر واتاکـەی خـۆی دەگـەیەنێ و هـەمـو کـەسێکیش لێی تێدەگا. تەنانەت، هەموو گەلانـی جیـهـانیش بەکاریدێنن. بەڵام، ئەمـە ئەوە ناگـەیەنێ، لە زمـانـی کـوردییـدا، بەرانبـەر بە زاراوەی « پارت »، هـیـچی دیکەمـان نەبێ! بەڵکوو هـەمـانە، وەک: « کـۆمـەڵ ». بەڵام، من پێم وایە، بە تەواویی، واتـای « پارت » ناگـــەیەنێ! ئەمـــەش هـەر وەک ئەوە وایە،

عـەرەبەكـان لەبری نـاوی « تێلێـفـۆن »، زاراوەی « هـاتف »یان داناوە، كەچیی، تا ئێستە، جێی خۆی نەگرتووە و لە زمانەكەشیاندا نەچەسپیوە.
بە ڕاستیی، ئـەم جۆرە ووشە و زاراوە ناسراو و گرنگانە، بە هـیچ شێوەیە پێـویست نـاكـا، زاراوەی دیكـەیان بـۆ داتاشـرێ. چـونكە، ڕۆڵەی گـەل و نەتەوەكـانی جیـهان، زۆر بـە ئاسـانیی لێـیان تێدەگـەن، تا ئەو ووشـە و زاراوانەی زمـانـە زیندووەكـانی گـەلانی جیـهان فـێـربن، گەلێ چاكـترە و باشتریش، لە یەكدی تێدەگەن!
ووشە و زاراوەكانی « لاتین »، موڵكـی هیچ گرووپێكی ئیتنیك نین. بەڵكوو، موڵكی هـەمـوو كۆمەڵگەی مرۆن. بۆیە، هەمـوو گەل و نەتەوەیەك بۆی هەیە، بەكاریانبێنێ. بەلام، زمانەكانی « عـەرەبیی، فارسیی و توركیی »، موڵكی ئەو سێ نەتـەوە داگیـركـەرەن، نەك هـەر كـورد بـۆی هـەیە، بەكـاریانبێنێ، بەڵكوو، بە زۆریش بە سـەریاندا سـەپاندووە و دەشـیـسـەپێنن، لە هـەمـان كاتیشدا، زمانە خواكردەكەی خۆشیان لێ قەدەغەكردووە!*
لە ڕاستییدا، عەرەبەكان، نەك هەر خاكەكەیان داگیركردووین، بەڵكوو، زمـانەكـەشـیـان تێكداوین! چۆن؟ هەر چەندە، كـورد ئەلفـوبێـی عـەرەبیی بەكاردێنێ، بەلام، لە هـەمان كـاتیشدا، لەگەڵ سروشت و خـەسڵەتی زمانی كوردییدا ناگونجێن. چونكە، جگە لەوەی، دوو زمانی جیاوازن، هەروەها، چۆن هێندێ پیتی وەك: « ث ، ذ ، ص ، ض ، ط ، ظ » لە زمانی كوردییدا نین، هـەر بەو شـێـوەیەش، هێندێ پیتـی ڕەسەنی كوردیی وەك: « پ، چ، ڕ، ژ، ڤ، گ، ڵ، ۆ، ێ » لە زمانی عـەرەبییدا نین. بەلام، ئەو پیتـانە، لە زمانـە « ئەورووپایی »یەكـاندا هـەن. لەبەرئەوە، گەلێ ووشـە و زاراوەی جیاجیای زمانەكانی گەلانی جیهان، لە ڕێی زمانی عەرەبییـەوە، لە زمـانەكـەماندا، بە هەڵە بڵاوبوونەتەوە. لەبەرئەوەی ئەوان، ئەو پیتانەیان نییە.
بۆیە، گەر هەر ووشـەیـەك، ناوێ، زاراوەیەكـمـان، لە هـەر زمـانێكی بیانیی دیكەوە وەرگرت، دەبێ. ووشەكە لە زمانە نەتەوەییە ڕەسـەنەكەی خۆیدا، دەنگەكـەی چۆن بوو، هەر بەو شـێـوەیەش بیـڵـێـینەوە. یا، خۆیـان چۆنی دەنووسن، ئێـمـەش، هـەر بەو شـێـوەیە بینووسین. بەلام، پیـتی كـوردیی بەكـاربێنین. لەبـەرئەوە نابێ، بۆ ناوی « ئـامێـر، زاراوە جـۆربەجۆرەكـان، ناوی مـانگەكان، گونـد، شارۆچكە، شار و وولات »، وەك « عەرەب، تورك

---

*دەربارەی ئەم باسە، تەماشای « سەلیقەی زمانەوانیی »، لاپەڕە « 433 - 449 » بكە، بە درێژیی باسمكردووە و لێرەدا نامەوێ، لەوە پتر لێی بدوێم!

و فارس »ەکان بیاننووسین، بەڵکوو پێویستە، ئەو گەلانە خۆیان، چۆنی دەڵێن و دەنووسن، ئێمەش هەر بەو شێوەیە بیاننووسین. نەک، لە زمانی عەرەبییەوە وەریانگرین و بەکاریانبێنین. بەڵکوو، لە زمانە سەرەکییەکەی خۆیانەوە وەریانگرین. چونکە، ئێمە ئەو پیتانەمان هەن. بۆ نموونە: ناوی دەوڵەتی « **Portugal** »، تەنیا دەبێ، بە پیتی کوردیی بە « پورتوگال » بنووسرێ، نەک گوتن و نووسینەکەی، لە زمانی دووەمەوە وەرگرین. چونکە، عەرەب پیتی « پ ـ گ »یان نییە و بە « برتغال » دەینووسن. یا، لەبەرئەوەی فارسەکان، بە دەوڵەتی « پورتوگال » دەڵێن « پرتەقاڵ »، ئیدی کوردەکانی ڕۆژهەلاتیش دەبێ، لەبەر خاتری ئەوان، هەر ئەو ناوە بەکاربێنن. ئەدی، ئەو کاتە، چۆن جیاوازیی لە نێوان « پرتەقاڵ »ی میوە و « پورتوگال »ی وولاتدا دەکەن؟!!

یا، « ڕووس »ەکان خۆیان، بە پێتەختەکەیان دەڵێن: « **Moskva** ». کەچیی، عەرەب لەبەرئەوەی پیتی « ڤ ـ **V** » یان نییە، بە « موسکو »ی دەنووسن و دەخوێننەوە، لە کاتێکدا، ڕاستییەکەی «مۆسکڤە » یە.

یا « **Chile** »، لەبەرئەوەی لە زمانی عەرەبییدا، پیتی « چ ـ **CH** » نییە، عەرەبەکان بە « شیلی » دەینووسن. هەروەها، « چیچێن » بە « شیشان » دەخوێننەوە. بۆیە نابێ، ئێمەی کوردیش، لە عەرەبەکانەوە وەریانگرین. چونکە، عەرەبیی و کوردیی، دوو زمانی جیاوازن و دەبێ، لە زمانە ڕەسەنەکەوە وەریانگرین و بە « چیلی » و « چیچێن » بیاننووسین.

یا، با تەماشای ناوی وولاتی « مصر » بکەین. لە زۆربەی زمانەکانی جیهاندا، بە « **Egypt** » دەنووسرێ. بەڵام، چونکە « مصر » وولاتێکی عەرەبییە، لە زمانە ڕەسەنەکەی خۆیاندا بە « مصر » دەنووسرێ و دەخوێندرێتەوە، ئێمەی کوردیش دەبێ، لە عەرەبەکانەوە بیخوازین، بە پیتی کوردیی و بە « میسر» بینووسین.

هەروەها « **Japan**، **America**، **Polen**، **Gabon**، **Gambia**، **Ghana**، **Vatikan**، **Vietnam** و **Venezuela** »، عەرەبەکان بە « یابان، امریکا، بولونیا، کابون، کامبیا، کانا، فاتیکان، فیتنام و فنزویلا » دەیاننووسن. بەڵام، ڕاستروایە، بە « ژاپۆن، ئەمێریکا، پۆلۆن، گابۆن، گانا، گامبیا، ڤاتیکان، ڤێتنام و ڤێنزەوێلا » بنووسرێن.

لە کۆتاییشدا، تەنیا هەر ئەوە ماوە، بە هێندێ بۆچوونی تایبەتیی خۆم، کۆتایی بەم گوتارە بێنم، کە لە نێوان ساڵەکانی « **1996 - 1999** »دا نووسیومن و ئێستەش دووبارەیاندەکەمەوە:

(هەر چەندە، ووشەی بیانیی ناتوانێ، کار لە تایبەتمەندیی هیچ جۆرە زمانێ بکا، زمانەکە بگۆڕێ، یا ڕێزمان و ووشەکانی زمان تێکدا. بەڵام، هەر چۆنێبێ، زمان، تا لە ووشەی بیانیی خاوێنکرێتەوە، تا پاک ڕاگیرێ، تا ڕاژەکرێ، هێندەی دیکە، زمانەکە دەبوژێتەوە، شیرینتر، گەشاوەتر، جوانتر دەبێ و پێشتردەکەوێ.
لەگەڵ ئەم ڕاستییانەشدا دەبێ، بە شێوەیەکی بەردەوام هەوڵدەین، زمانەکەمان، لە ووشەی بیانیی بژارکەین. چونکە، گەر ئەم کارە نەکەین، هەر بڵێین: تازە ئەو ووشانە کوردێنراون، وەک ئەوە وایە، بڵێین: لە مێژە کورد لەگەڵ « فارس، عەرەب و توورک »دا تێکەڵاوبوون، لە سنووری ئەو دەوڵەتانەدا، پێکەوە دەژین، تازە پێکەوە ڕاهاتوون، ئیدی، سەری خۆمان بۆ بیەشێنین، داوای ماف و دەوڵەت بکەین؟)«**449،1**»

**سەرچاوەکان:**
1. حوسێن محەمەد عەزیز، سەلیقەی زمانەوانیی و گرفتەکانی زماتی کوردیی، چاپی1، چاپخانەی هەواڵ، کوردستان ـ سولەیمانیی، 1999.
2. د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، ڕێنیسانس، فوئاد میسری کردوویە بە کوردی، چاپی1، چاپخانەی الحوادث، بەغدا، 1984.
3. هێمن، پاشەڕۆک، چاپی2، چاپخانەی پیرۆز، مهاباد، خاکەلێوەی 1362 هەتاوی.

* * *

## بەرهەمە چاپکراوەکانی نووسەر

**گوتــار :**

1. بەرەو ئازادیی، گ. ڕابوون، ژ. 2، سوید، 1991.
2. لە پێناوی ڕاستیدا، بەربانگ، ژ.87، ساڵی12، سوید .1993.
3. یەکێتی سۆڤیێتی هەڵوەشاوە لە ڕوانگەی بەرژەوەندییەکانی نەتەوەی کوردەوە، گ. ڕابوون، ژ.7 ـ 8، سوید، 1993.
4. دەربارەی کەسایەتیی کورد، گ. ڕابوون، ژ. 10 ـ11، سوید، 1994.
5. بەرەو ستراتیژێکی یەکگرتووی نەتەوەیی، هەنگاو، ژ.13، لەندەن،1995
6. سایکۆلۆژییەتی مرۆڤی ئاوارەی کورد ....، گ. گزینگ، ژ.8، سوید، 1995.
7. لێکۆڵینەوەیەک دەربارەی کۆمەڵگەی کوردەواریی، گ. گزینگ، ژ.9، 1995.
8. کورتە تاقانە ساواکەی دەنگ و ڕەنگی نەتەوەکەم(MedTV)، گ. گزینگ، ژ.13، سوید، 1996.
9. هەنگاوی یەکەم و ....، گ. بەربانگ، ژ.102، ساڵی14، سوید، 1996.
10. چەند سەرنجێ دەربارەی سەرەخۆشیی و پرسەدانان، گ. بەربانگ، ژ. 104، سوید، 1997
11. دیکتاتۆرەکان لە بەر یەک ئاوێنە قژی نەخشە و پلانەکانیان دادەهێنن، گ. بەربانگ، ژ. 105، سوید، 1997. گ. دیموکراسی، ژ.30، سلێمانی، 1997.
12. کەی هۆشێ بە بەر خۆماندا دەهێنینەوە؟ گ. بەربانگ، ژ. 106-107، سوید، 1998. گ. دیموکراسی، ژ.31، سلێمانی،1998.
13. با خۆمان چاک بناسین، گ. بەربانگ، ژ.108، سوید، 1998.
14. سێ سەرنجی زمانەوانیی، مانگنامەی پەیام، ژ. 8، 1998.
15. مافی دیاریکردنی چارەنووس، گ. ئاڵا، ژ.30، 1998.
16. بۆزە نەبێ، بازەبێ، کلکی بە ئەندازەبێ، گ. بەربانگ، ژ. 109، 1998.
17. ئاشتیی بە دەنگ نییە، بە ڕەنگە، ڕ. کوردستان، ژ.7، بەرلین،1998.
18 چەن سەرنجێ دەربارەی ناسنامەی ئایینی....، گ. ئێستا، ژ.20،سولەیمانیی،1999
19. زێوەر لە نێوان کوردایەتیی و عێراقچێتیدا، گ. ئاینده، ژ.1، سولەیمانیی، 1999.
20. داری بەزەیی خوا، ڕ. کوردستانی نوێ، بەشی یەکەم، ژ.1902، 1999/7/13، بەشی دووەم، ژ.1903، 1999/7/14، سولەیمانیی.
21. دەربارەی مەلەفی کەرکووک، ڕ.کوردستانی نوێ، ژ.1921،9990/8/01 ، سولەیمانی. مانگنامەی کوردستانی نوێ لە دەرەوەی وڵات، ژ.67، 1999/8/25
22. شێوازی خەبات و مافی چارەنووسی نەتەوەکان، ڕ. کوردستانی نوێ، ژ. 1928، 1999/8/18، سولەیمانیی.
23. دەربارەی فـریزیۆلۆژی کـوردیی، ڕ. ئاڵای ئازادی، ژ. 220، 1999/7/12، سولەیمانیی.

24. خرنووکیش له بیاباندا درەختە، گ. گزینگ، ژ.28، سوید2000. ر. ئاڵای ئازادی، ژ. 378 ، 2000/08/20، سولەیمانیی.
25. ژن له ئاوێنەی تەڵخی هێندێ هۆنراوەی کوردییدا، گ. گزینگ، ژ.29، 2000. ر. کوردستانی نوێ، ژ. 2312، 2000/11/25، سولەیمانیی.
26. هێزی یەکێتیی له سایەی دیموکراسییدا، ر. کوردستانی نوێ، ژ. 2314، 11/27 /2000، سولەیمانیی.
27. رۆژمێری رووداوەکانی مانگی نۆڤەمبەر له مێژووی کورددا، کوردستانی نوێ،2317، 2000/11/30. سولەیمانیی.
28. مەحویی له نێوان خواپەرستیی و کوردایەتییدا، گ. ئایندە، ژ.15، سولەیمانیی، 2000.
29. دڵزار دوێنێ و ئەورۆ، گ شیعرستان، ژ. 6، سولەیمانیی، 2001.
30. نەورۆزی کورد، گ. گزینگ، ژ.31، 2001.
31. شەکرە شارەکەم سولەیمانیی، گ. گزینگ، ژ. 2001،32. گ. گەلاوێژی نوێ، ژ.26، کوردستان ـ سولەیمانیی، 2001.
32. ئابووریی هاوبەش له نێوان مارکسیزم و ناسیۆنالیزم هەر له کۆنەوە هەتا ئێستا، گ. مەدەنیەت، ژ. 11، کوردستان ـ سولەیمانیی، 2001.
33. سولەیمانیی ئانوێ، ر. کوردستانی نوێ، ژ. 2855، رۆژی شەممە، 2002.09.07، سولەیمانیی.
34. مانگی خوێن و هیوا، ر کوردستانی نوێ، ژ. 2874، یەکشەممە، 29 .09 .2002، سولەیمانیی.
35. کورتەیەکی مێژوویی پێوەندیی نێوان هەر دوو گەلی « عەرەب و کورد » له « عێراق »دا، سایتی « Kurdistanpost »، 20 .02 .20004.
36. بیرۆکەی عێراقچێتیی و کوردستانچێتیی، « Kurdistanpost »، 20004.
37. دۆستایەتیی راستەقینە، یا برایەتیی گاڵتەقینە! « Kurdistanpost »، 20004.
38. شێوازی خەبات، دیالۆگ و گفتوگۆ، « Kurdistanpost »، 20004.
39. رێککەوتننامەی « 11/مارسی/1970 » و چەن پەندێکی مێژوویی، سایتی « Kurdistanpost »، 20004.
40. زمان و نەتەوایەتیی، « Kurdistanpost »، 20004.
41. رساله مفتوحه: الی الساده امراء و ملوک و روساء العرب، « Kurdistanpost » 2004.
42. الحقوق القومیه بین الدین و السیاسه، « Kurdistanpost » 2004.

**نامیلکە و پەرتووک :**

1. دەربارەی پرۆژەکەی یەکێتی نیشتمانیی کوردستان، چ.1، سوید، 1994.
2. دوا پرۆژە، چ.1، سوید، 1994.

3. پێنج ووتاری غەمگین، چ.1، چاپ. باران، سوید، 1994.
4. دیموکراسی، ئایدۆلۆژی و جەنگی نێوخۆ، چ.1، چاپ. باران، سوید، 1994.
5. ململانێی ئایدۆلۆژی لە کوردستاندا، چ.1، چاپ. ئەزمر، سولەیمانی 1993. چ.2، چاپ. کیتاب هەرزان، سوید، 1995.
6. پێنج کاتژمێر لەگەڵ برایم ئەحمەددا، چ.1، چاپ. باران، سوید، 1995. چ.2، چاپ. ئەزمر، سولەیمانیی 1996. چ. 3، چاپ. سیما، سولەیمانیی، 2002.
7. نامەیەکی درێژ بۆ نەوشیروان مستەفا، چ.1، چاپ. باران، سوید، 1995.
8. کورد و شۆڕش و هەڵی مێژوویی، چ.1، چاپ. کیتاب هەرزان، سوید، 1996. چ. 2، چاپ. هەمیشە، کوردستان، 2000.
9. فیدرالیزم و دەوڵەتی فیدراڵ، چ.1، چاپ. باران، سوید، 1996. چ.2، لە بڵاوکراوەکانی دەزگەی دیمۆکراسیی، سولەیمانی، 1996. چ3، چاپ. سیما، سولەیمانی، 2004.
10. بەڵێ لێکۆڵینەوە و رەخنە نەک شێواندنی راستیی، چ.1، چاپ. کیتاب هەرزان، سوید، 1996.
11. خولانەوە لە بازنەیەکی بۆشدا، چ1، چاپ. ئاپێک، سوید، 1997. چ.2، چاپ. سیما، سولەیمانیی، 2002.
12. رۆڵی سیستێمی بنەماڵە لە بزاڤی رزگاریخوازی نیشتمانیی کوردستاندا، چ.1، چاپ. میدیا، سوید، 1997. چ. 2، چاپ. ئەزمر، سولەیمانیی، 2001.
13. گیروگرفتە سەرەکییەکانی کورد، چ. 1، چاپ. کیتاب هەرزان، سوید، 1998. چ. 2، چاپ. سیما، سولەیمانیی، 2000.
14. ئۆجەلان ئەزموونێکی نوێ و پەندی مێژوویی، چ.1، چاپ. میدیا، سوید، 1999. چ.2، سولەیمانیی، 1999.
15. سەلیقەی زمانەوانیی و گرفتەکانی زمانی کوردیی، چ.1، چاپ. هەواڵ، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای سەردەم، سولەیمانیی، 1999.
16. خلتەی بیرێکی ژاراویی، چ.1، چاپ. هەمیشە، سولەیمانیی، 2000.
17. مەسعوود محەمەد و دوو دیداری دۆستانە، چ.1، چاپ. تیشک، کوردستان - سولەیمانیی، 2002.
18. دید نەتەوەیی و نانەتەوەیی، چ.1، چاپ. ئەزمر، سولەیمانیی، 2002.
19. پەیمانێکی رەش و رۆژێکی سوور، چ.1، چاپ. ئەزمر، کوردستان - سولەیمانیی، 2003.
20. سنووره قەدەغەکان مەشکێنن، چ.1، چاپ. سیما، کوردستان - سولەیمانیی، 2003.
21. یاقووت و زمرووتی کوردیی، بەرگی1، چ.1، چاپخانەی. وەزارەتی رۆشنبیریی، کوردستان - سولەیمانیی، 2003.
22. شەکرە شارەکەم «سولەیمانیی»، لە بڵاوکراوەکانی شارەوانیی سلێمانی، چاپخانەی شڤان، کوردستان - سولەیمانیی، 2003.



مامۆستا (عەلی باپیر) لە ژووری کارکردنی خۆیدا

لەگوندی (ئەحماوا)

2002.10.06



وێنەی بەڕێزان (جەلال تاڵەبانیی)و (عەلی باپیر)



وێنەی بەڕێزان (مەسعوود بارزانیی)و (عەلی باپیر)



له هەموو بەشەكانی ((كوردستان))دا، سامانێكی زۆرمان هەیە، كەچیی، كورد سواڵی پێ دەشێ! گەر بەپێ ی ((شەریعەت))ی ئیسلامیی بێ، درووست نییە ((زەكات))ی نێوچەیەك بۆ نێوچەیەكی دیكە بچێ، تا ، هەژاری ئەو نێوچەیە، پێویستیان پێی بێ، گەر، یەك دەوڵەتی ئیسلامیی یەكگرتووش هەبێ، ئەو گەلە كوردەی، لەو نیشتمانەدا دەژی، تا خۆی، پێویستی بەو سامانە بێ، بۆ شوێنێكی دیكە نەچێ! گەر لە خۆی زیادبوو، ئینجا، بۆ هەژارانی شوێنەكانی دیكەی جیهان بچێ!

لەم چاوپێكەوتنەدا ، گەلێ زانیاریی ورد و گرنگ، دەربارەی كێشەو گرفتەكانی ((ئایین بە گشتیی و ئایینی ئیسلام بەتایبەتی، مێژووی بزووتنەوەی ئیسلامیی ڕامیاریی لە كوردستاندا، خەباتی چەكداریی و "جیهاد"، ڕێكخراوەكانی "یەكگرتوو، بزووتنەوە، جوند-ئەنصار ئەلئیسلام"، ناسیۆنالیزم، كۆمۆنیزم، دیكتاتۆریی، دیمۆكراسیی، جیهانگیریی، سیكۆلاریزم، پلورالیزم، تیرۆر، جەنگی نێوخۆ، پێوەندییەكانی "كۆمەڵی ئیسلامیی، لەگەڵ ڕێكخراوەكانی دیكەی كوردستان و نێوچەكەدا...)) دەخوێننەوە.

---

# DO NOT BREAK THE FORBIDDEN BORDERS

**Dr. HUSSEIN M. AZIZ**

2004/2704k